# گوڵبژێرێک

## له ووتاره‌كانی شه‌هید

## ماموستا عبدالله قه‌سری



كۆكردنه‌وه‌ی

بوخاری عبدالله

پێداچوونه‌وه‌ی

حسن بابكر

2008 - 1428

منتدى اقرأ الثقافي

www.iqra.ahlamontada.com

ئامادەكردنی: بوخاری عبد الله

# گوڵبژێرێك لە وتارەكانی شەهید

# مامۆستا عبدالله قەسرێ

پێداچوونەوەی: م. حسن بابكر

هەولێر - ٢٠٠٧

**ناوی کتێب: گوڵبژێرێك له وتارەکانی شەهید مامۆستا عبدالله قەسرێ**

- ئامادەکردنی: بوخاری عبد الله

- پێداچوونەوەی: م. حەسەن بابکر

- نەخشەسازی ناوەوە: هەردی

- بەرگ: بوخاری عبد الله

- ژمارەی سپاردن: (١٢١٣)

- بەشی یەکەم

چاپی یەکەم ٢٠٠٧

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلا﴾ الاحزاب/٢٣

# پێشکەشە

- بە گیانی شەهید مامۆستا عبداللە قەسرێ و هاوەڵانی.
- بە سەرجەم بانگەوازکارانی ڕێگای خوا (سبحانە وتعالی).
- بە خوێنەرانی بەڕێز و سەنگین.

# پێرست

## پێشەكی ماموٚستا عەلی باپیر

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله أجمعين من الصَّحبِ والازواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان الى يوم الدين.

یەكێك لە یاساكان (سنَن)ی خوا كە لە ژیانی بەشەردا داینـاون ئەوەیـە، كـە هەر كاتێك مرۆڤ بوو بە بەندە (عَبدْ)یەكی بۆ خوا صوڵحاوو خۆی بە ئیمـان و كردەوەی چاك رازاندەوە، خوای بەبەزەیی و كاربەجێ لـەلای خـەڵكی ئاسمـان و زەوی خۆشەویـستی دەكـات و رێـزو حورمـەتی بـۆ پەیـدا دەكـات، وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدًّا﴾ ٩٦- مريم، واتە: بێگومان ئەو كەسانەی ئیمانیان هێناوە و كـردەوە باشـەكان ئەنجام دەدەن، خوای خاوەن بەزەیی خۆشەویستییان بۆ دەڕەخسێنێ.

پێغەمبەری خواش ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ تَعالى إذا أحَبَّ عَبداً دَعا جِبريل فَقال: إنّي أُحِبُّ فلاناً فأحببهُ فيُحِبّهُ جِبريلُ ثُمَّ يُنادي في السَّماء فَيَقول: إنَّ اللهَ يُحِبُّ فلاناً فأحِبّوه فَيُحِبه أهلُ السَّماء ثُمَّ يوضَع لَه القُبولُ في الارض) متفق عليه عن أبي هريرة.

واتە: بێگومان هەر كات خوا بەندەیەكی خۆشویست بانگی جوبرائیل دەكـات و پێی دەفەرموێ كە من فڵانە كەسم خۆش دەوێ تۆش خۆشت بـوێ، جـوبرائیلیش خۆشی دەوێ، پاشان جوبرائیل لە ئاسمانێ بـانگ دەكـات كـە: خـوا فڵانەكەسـی خۆش دەوێ ئێوەش خۆشتان بوێ، ئیـدی خـەڵكی ئاسمـانیش (كـە فریـشتەكانن) خۆشیان دەوێ، پاشان خۆشەویستی و قبوڵكرانی بۆ دەخرێتە سەرزەویش...

هـەروەها (عبـدالله ی کـوڕی عـەبباس) خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـی گوتوویەتی:

(إن للحسنة نوراً في القلب وضياءً في الوجه وقوة في البدن وسعة في الرزق ومحبة في قلوب الخَلق)، واتە: بەڕاستی چاکەکردن مایەی ڕوونـاکی نێـو دڵ و کەشـیی ڕوو و هێزی جەستە و فراوانیی بژێو و خۆشویسترانە لە دڵی خەڵکیدا، جا مـن پێموایە کە برای خۆشەویستمان (مامۆستا عبدالله) قەسرێ ی شەهید -ان شاء الله تعالى- هەرچەندە بەس خوا پەنهانزانە و بە بەندەکانی ئاشنایە، یەکێك بـوو لەو جۆرە بەندانەی خوا کـە خـوای بەخـشەر قبـووڵ و خۆشەویـستی و ڕێـز و حورمەتی بۆ خـستبووە دڵ و دەروونـی خەڵکییـەوە و لەهـەر کوێیـەك بووبـێ خەڵکی دەوروبەری خۆشیان ویستوە و حەزیان بـە تێکـەڵیی و نزیکـی کـردوە، هەر بۆیەش کاتێك کە خۆی و چوار پێشمەرگە حیمایەکەی بەناهـەق کـوژران و هەواڵەکە بەنێو خەڵکی کوردسـتاندا بڵاوبـۆوە مەگـەر چـۆن دەنـا هـەرماڵێك ئاشنایەتییان بەو مامۆستا دیندار و دڵسۆزە بووبێ تازیەیان بـۆ گـرت و بـۆی خەمبار و دڵتەنگ بوون.

ئینجـا دیـارە هۆکـارێکی گرنگـی لەسـەر ئاسـتێکی فـراوان ناسـران و خۆشویسترانی (مامۆستا عبدالله)ش بریتی بوو لە وتارەکانی کە هەفتانـە لـە مزگەوتی مەڵبەندی ڕانیە ڕاسـتەوخۆ پێـشکەشی خـەڵکێکی زۆری (ڕانیـە)و دەوروبەری دەکردن و، پاشان لەڕێی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە بە زۆربەی شـار و شارۆچکە و گوندەکانی کوردستاندا پەخش دەبـوون، هـەر بۆیـەش کاتێـك هاوسەر و کوڕەکـانی مامۆسـتا راوێـژیان پێکـردم و بیرۆکـەی کۆکردنـەوەی

گوڵبژێرێكی وتاره‌كانییان خسته‌ڕوو، پشتگیریم كردن و ڕێنماییشم كردن كه‌ چۆن چۆنی به‌و كاره‌ هه‌ڵسن.

جا خوێنه‌ری به‌ڕێز!

ئه‌م كتێبه‌ی به‌رده‌ستت گوڵبژێرێكی وتاره‌كانی (ماموٚستا عبدالله)ی قه‌سرێیه‌ كه‌ كاكه‌ (بوخاری) كوڕی ژیرانه‌ و چالاكانه‌ له‌ كاسێته‌وه‌ هێناونیه‌ سه‌ر كاغه‌ز و تایپی كردوون و ئایه‌ت و فه‌رمووده‌كانیشی (تخریج) كردوون و، برای به‌ڕێزیشم (ماموٚستا حسن بابكر) كاتێكی باشی ته‌رخان كردوه‌ بۆ چاوپێداگێڕانه‌وه‌ و ورده‌ ده‌ستكارییه‌كی هه‌ندێك وشه‌و ڕسته‌ش كه‌ جیاوازی نێوان شێوازی ئاخاوتن و نووسینیش ده‌یخوازێ، هه‌ر چه‌نده‌ مۆركی شێوازی ئاخاوتن و وتاردان هه‌ر ماوه‌ته‌وه‌ و ده‌ستكاریی نێوه‌ڕۆكی وتاره‌كانیش نه‌كراوه‌.

خوا پاداشتی ماموٚستا حسن بابكر و كاكه‌ بوخاریش بداته‌وه‌ و ئه‌م به‌رهه‌مه‌ش بكاته‌ مایه‌ی به‌رچاوڕوونی زیاتری مسوڵمانان، تاكو (ماموٚستا عبدالله)ش له‌م ڕێیه‌شه‌وه‌ خێر و پاداشتێكی دیكه‌ی بۆ بچێ وه‌ك پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: (إذا ماتَ الانسان انقَطَعَ عَمَلُهُ إلا مِن ثَلاث: صدَقَة جارية أو عِلمٌ يُنتَفَعُ بِهِ أو وَلَدٌ صَالِحٌ يَدعُو لَهُ) رواه مسلم.

واته‌: مرۆڤ كه‌ مرد كرده‌وه‌ی (چاكی) ده‌بڕێ مه‌گه‌ر له‌ سێ ڕێیانه‌وه‌: خێرێكی درێژخایه‌ن و به‌رده‌وام، یان زانیارییه‌ك كه‌ كه‌ڵكی لێوه‌ربگیرێ، یان منداڵێكی چاك كه‌ بۆی ده‌پاڕێته‌وه‌.

جا ئومێدم وایه‌ ماموٚستا عبدالله له‌هه‌ر كام له‌م سێ ڕێیه‌وه‌ خێر و پاداشتی بۆ بچێ، چونكه‌: ١- (كۆمه‌ڵی ئیسلامی) كه‌ ماموٚستا مه‌لا عبدالله یه‌كێك بوو له‌ مشوورخۆرانی ماندوو و دڵسۆزی، پرۆژه‌ و خێرێكی به‌رده‌وامه‌ و، ٢-

وتارەکانیشی سوپاس بۆ خوا شتێکی زۆر چاك و بەسوودیان تێدایە و هەتا ئێستا لە تەلفزیۆن و رادیۆیەکانی کۆمەڵی ئیسلامییەوە سوودی باشیان لێ بینراوە و لەمەودواش ئەم گوڵبژێرەیان بەشێوەی کتێبیش دەکەونە بەردەستی خوێنەران، ٣- وە لە خوا بەزیادبێ منداڵەکانیشی خواناس و باشن و هیوای چاکتربوون و گەشەکردن و بەرەوپێشچوونیشیان لێ دەکرێ، کە بێگومان دایکیان خوا پاداشتی بداتەوە، لەو بارەوە کاریگەریی زۆری هەیە.

خواش بە کەرەم و بەزەیی بێ سنووری خۆی پلەوپایەی ئەو برا دڵسۆز و خۆشەویستەمان بەرزتربکاتەوە و دامەزراویی و راودستاویی زیاتریش بە هەموو لایەکمان ببەخشێ و سەرەنجامان خێر بکات.

عەلی باپیر
٩ رمضان ١٤٢٨
٢٠٠٧/٩/٢١
هەولێر

# ئەم كتێبە:

ئەم كتێبەی بەردەستتان (گوڵبژێرێك لە وتارەكانی شەهید مامۆستا عبدالله ی قەسرێ) لە (١٥) پازدە وتاری جومعەی مامۆستا عبدالله پێكهاتوە، كە لە سالانی (١٩٩٩ تا ٢٠٠٣) لە مزگەوتی مەڵبەندی (٥) ی كۆمەڵی ئیسلامی لە ڕانیە خوێندوونیەوە كە لەو ماوەیەدا ناوبراو ماڵی لە (ڕانیە) بووە.

وتارەكانی مامۆستای شەهید جۆراوجۆرن و هەریەكەیان رەنگدانەوەی ئەو بارودۆخ و هەل و مەرجەن كە تایبەت بووە بە ژیان و هەڵسوكەوتی ئەو خەڵكەی مامۆستا لە ناویاندا ژیاوە، جارجاریش لەو سنوورە دەرچوە و هێندێك مەسەلەی دیكەی گرنگ و گشتی باس كردوون و هەڵوێستی ئیسلامی لەمەڕ كێشەو قەیران و ڕووداوەكان خستۆتەڕوو.

ناوەڕۆك و كاكڵی وتارەكانیشی لە وتاری یەكەمی جومعەدا باس كراون، بۆیە وتارەكان تەنیا وتاری یەكەمی جومعەن و وتاری دووەمیان نەنووسراون.

مامۆستا عبدالله وێڕای زۆر شێوازی دیكەی كاری ئیسلامیی توانیویەتی لەڕێی وتاردانی رۆژانی جومعەوە دەوری خۆی ببینێ و چەمكە ئیسلامیەكان روون بكاتەوە و لەبەرانبەر كاری تێكدەرانە و چەواشەكارانەی ناحەزاندا ئیسلامی راستەقینە بە خەڵكی ئاشنا بكاو دەریبخات كە ئیسلام مایەی بەختەوەری دنیا و دوارۆژی هەموو مرۆڤایەتییە بە تێكڕای گەل و نەتەوەكانەوە.

ئەمەش بەهۆی زیرەكی و لێهاتوویی ناوبراوەوە بووە كە لەو بوارەشدا لێزانانە بابەتی گونجاوی بۆ وتارەكانی هەڵبژاردوە و ئەوەی پێویست بووبێ حەكیمانە

لەسەر مینبەر باسی کردوە و وتارەکانی بە ئایەت و حەدیس و بەسەرهاتی راستی مێژوویی و بەڵگەی روون و ئاشکراو ژیرانە بەهێزکردوون و رازاندوونیەوە.

هەربۆیە ئەو خەڵکەی گوێگری وتارەکانی مامۆستا بوون بە تامەزرۆییەوە لەکاتی وتاردانیدا سەرنجی خۆی و قسەکانیانی داوە و تام و چێژیان لێ وەرگرتوە.

ئەوەی واشی کردبوو قسەو وتارەکانی مامۆستا عبداللە ی شەهید ئەوەندە کاریگەرییان هەبێ، ئەوەبوو کە پێچەوانەی قسەکانی خۆی رەفتاری نەدەکرد و ئەوەی بەخەڵکی دەگووت لە خێر و چاکە پێشتر خۆی بەکردەوە جێبەجێی دەکرد و هەڵسوکەوت و رەوشت و ئاکارەکانی نموونەیەکی زیندووی بەرزی قسەکانی بوون.

بەو هیوایەی ئەم بەرهەمەی مامۆستا کە پاش وەفاتیی دەکەوێتە بەردەستی خوێنەران سوودبەخش بێ و خوای بەخشندە بۆی بخاتە تاتەرازووی خێرانیەوە و پاداشتی ئەوکەسانەش بداتەوە کە کەم و زۆر دەستیان هەبووە لە بە چاپگەیاندنیدا.

**حسن بابکر**
**١٠ رمضان ١٤٢٨**
**٢٠٠٧/٩/٢٢**
**هەولێر**

# نیشانەکانی بڕوادار

﴿فمَا أُوتِيتُم من شيْءٍ فمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ومَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَى لِلَّذين آمَنُوا وعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ وَالَّذِينَ يجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِش وَإِذَا مَا غَضِبوا هـمْ يَغْفِرُونَ * وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ ومِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ * وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْي هُمْ يَنتَصِرُونَ * وَجَزَاء سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ﴾ ٣٦-٤٠ الشورى

# بسم الله الرحمن الرحيم

انَ الحَمدَ لِلهِ نَحمَدُهُ ونَستَعِينه وَنَستَغفِرهُ وَنَستَهديه، ونعوذ بِالله مِن شُرورِ أنفُسَنا وسيئات أعمَالنا، من يَهدِه اللهُ فَلا مضِلَّ لَه، وَمن يضلِل فَلا هادِي لَهُ..، نَشهَدُ أن لا الهَ الا اللهُ وحدَهُ لاشَريكَ لَهُ، شهادَةً تُنجِي قائلَها يَوم لا يَنفَعُ مالٌ ولا بَنون الا من أتَى الله بِقَلبٍ سَليم ونَشهَدُ أنَّ سَيِّدَنا وَنَبينَا محمَداً عَبدُه ورسوله.. هَذا الرَسُولُ الذِي بَلَّغَ الرِّسَالةَ وَأدَى الامانَةَ وَنَصح الامةَ وجَاهَدَ في اللهِ حَقَ جِهَادِهِ وَتَرَكَنا عَلى المحجَةِ البَيضاء، لَيلُها كَنَهارِها، لايَزيغُ عَنها الا هَالِك، صَلى اللهُ عَلَيهِ وعلَى آلِهِ وَأصحابِه صَلاةً وسلاماً الى يومِ الدِّين، أمَا بعدُ يا عِبادَ الله أُوصِيكُم وَنَفسِي أوَلاً بِتَقوَى اللهِ وطاعَتِه، وَلُزومِ أوامِرِهِ وَكَثرَةِ مخافَته، فإنَّ التَّقوى شعارُ المُؤمنين وَدثارُ المُتَّقين ووصية الله سبحانَه وتعالى فيَّ وفِي النَّاسِ أجمعين أعوذُ باالله منَ الشَّيطانِ الرَّجيم ﴿يَا أَيُّهَا النَّاس اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً واتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَساءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ ١- النساء.

ئیماندارانی بەڕێز، شوێنكەوتوانی پێغەمبەری پێشەوامان حەزرەتی موحەممەد ﷺ، سەلامی خوای پەروەردگارتان لەسەربێ لەم رۆژە پیرۆزەدا، هیواداریین خوای پەروەردگار بمانخاتە ژێر رەحمەتی خۆی و لە گوناهەكانی رابردوومان خۆشبێت و عومری داهاتوومان پڕ لە خێر و بەرەكەت بكات.

خۆشەویستەكان: دیارە ئێمەی ئینسان دوو ژیانمان لەپێشە، هەم ژیانی دونیا و هەم ژیانی دوارۆژ، ژیانی دونیا بۆ خزمەتكردن بە ژیانی دوارۆژە، ژیانی دونیا وەكو پردێك وایە ئینسان بەسەریدا دەپەڕێتەوە بۆ دوارۆژ، ژیانی دونیا

هۆکار (وسیلة) و رێگایە بۆ گەیشتن بە ژیانی دوارۆژ کە بریتییە لە بەهەشت و ڕەزابوونی خوا یا دۆزەخ و توڕەبوونی خوا، خوا پەنامانبدا!، ئێمەی مسوڵمان مەبەست (غایة)ێکی زۆر گەورەمان هەیە!، ئامانجێکی زۆر گەورەمان هەیە کە بریتییە لە ڕەزابوونی خوا، ئەو ئامانجە گەورەیەش تەنها بەوە دێتەدی کە ژیانی دونیا لە خزمەتی ئەو ئامانجە گەورەیەدا دابنێین، ژیانی دونیا زۆر بێ نرخ و سوکە لە بەرامبەر کێش (وَزن)ی ژیانی دوارۆژدا!، بۆیە پێویستە ئەوە بزانین کە بەچی ئەتوانین ژیانی دوارۆژمان مسۆگەر بکەین؟، بەچی ئەتوانین ئەو مەبەست (غایة)ە گەورەیە کە بریتییە لە خوا لەخۆ ڕازیکردن وەدی بهێنین؟، زۆر گەورەیە ئینسان خوا لێی ڕازی بێ!!، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ڕۆژێک بە ئەبوبەکری صدیقی فەرموو: خودای پەروەردگار بەهۆی حەزرەتی جوبرائیلەوە سەلامت لێ دەکات، وەحی ناردووە و دەفەرموێ من لەو ڕازیم ئایا ئەو لەمن ڕازییە؟!!، ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێ) دەستی کردە گریان و فەرمووی: جا من چیم هەتا لە خوا ڕازی بم یان ڕازی نەبم؟!!، زۆر گەورەیە ئینسان خوا لێی ڕازی بێ و سەلام و ڕەحمەتی خۆی بۆ بنێرێ!!، خودا پەیام (رِسالة)ی گەورە و پڕ لە بەرەکەتی خۆی کە قورئانی پیرۆزە بۆ بنێرێ و بەهرەمەندی بکات بەو قورئانە!!، نزیکی بکاتەوە لەو قورئانە، بیخاتە ژێر ڕەحمەتی خۆی، ئێمەی مسوڵمان پلەوپایەمان زۆر بەرزە ئەگەر لەسەر ڕێ و شوێنی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەمان بڕۆین (علیه الصلاة والسلام)، چونکە ئەویان پلەوپایەی بەرزترینی هەبووە لەناو پێغەمبەرانیشدا، خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێ ﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ ٤- القلم، واتە: بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشتێکی زۆر گەورەی!، خودای پەروەردگار مەدحی دەکات، وە بەهۆی ئەویشەوە مەدحی ئێمەی مسوڵمان کراوە کە ئوممەتی ئەوین!، جا با ئێمەش بزانین چۆن دەتوانین ژیانی دوارۆژ وەدەستبهێنین؟، چۆن ئەتوانین ئەهلی وەدەستهێنانی ڕەزابوونی خوای پەروەردگار بین؟.

بەڕێزان: خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بەراورد (مُقارَنـة)ی ژیانی دونیا و قیامەت دەکات، ژیانی دونیا لە بەرامبەر ژیانی قیامەت، تەماشا بکەن لە سورەتی (الشُورى)دا دەفەرموێت: أعوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطان الرَّجيم ﴿فَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ ٣٦- الشورى، واتە: ئەوەی کە ئێوە لە دونیا پێتان دراوە خۆشی و گوزەرانێکی کاتی دونیایە، هەرچی کە ئینسان لە دونیادا دەیبینێ و پێی دراوە چ لە ماڵ و سەروەت و سامان بێ، چ لە ئەولاد و کوڕ و نەوە و عەشیرەت و خزم و قەوم بێ...، وە چ لە عیلم و زانست و زانیاری بێ، وە چ لە پلە و پایە و مەنصەب بێ، وە چ لە خۆشگوزەرانی بێ لە هەموو رووەکان، هەمووی خۆشی ژیانی دونیایە، ﴿فَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾، کەل و پەل و گوزەران و رابواردنی دونیایە، ﴿وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَى﴾ ٣٦- الشورى، ئەوەی کە لەلای خوایە -کە بەهەشت و رەزامەندی خۆیەتی- باشتر و چاکترە و، نیعمەتێکی گەورەترە، وە تاهەتا (أَبـدي) دەمێنێتەوە، ژیانی دونیا لە بەرامبەر دوو سیفەتی گەورەی ژیانی بەهەشتدا خۆی راناگرێ، سیفەتی یەکەمیان: (خَيْـرٌ)، ژیانی خۆشی دوارۆژ باشترە!، سیفەتی دووەمینیشیان: (وَأَبْقَى)، دەمێنێتەوە و ئەبەدییە، ژیانی دوارۆژ ئەبەدییە و نابڕێتەوە، جا یان هەمیشەییە بۆ بەهەشتییەکان، یان هەمیشەییە بۆ دۆزەخیەکان ئەگەر کافر بن و باوەڕیان نەبێ، جا ئەگەر بەراوردی نێوان ژیانی دونیا و ژیانی دوارۆژ بکەین ناتوانین هەر تەنها لەژێر رۆشنایی ئەو ئایەت و فەرموودانەدا نەبێ کە ئاماژەیان بۆمان کردووە، خوای پەروەردگار سەرکۆنەی مسوڵمانان دەکات و دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ انفِرُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الأَرْضِ﴾ ٣٨- التوبة، واتە: ئەی مسوڵمانینە، ئەوە بۆ وادەکەن، -ئەوە چییە؟- کاتێك کە پێتان دەگوترێ راپەڕن لە پێناوی دینی خوادا، ماندوو بن و خەبات بکەن، خۆتان گران دەکەن لەسەر زەوی و

خۆتان بەزەویدا دەدەن؟!، ﴿أَرَضِيتُم بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنَ الاخِرَةِ﴾ ٣٨- التوبة، ئایا ئێوە رازین بە ژیانی دونیا؟، ﴿فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الْآخِرَةِ إلا قَلِيلٌ﴾ ٣٨- التوبة، خۆ ژیانی دونیا لە موقابیلی ژیانی قیامەت تەنها كەمێكە، وەكو لە ئایەتێكی تر لە سورەتی (النساء) ئەفەرموێ: ﴿قُلْ مَتَاعُ الدُّنْيَا قَلِيلٌ وَالاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ اتَّقَى﴾ ٧٧- النساء، واتە: ئەی موحەممەد ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر ئەوان لەبەر ئەوە جیهاد ناكەن و خەبات ناكەن و تێناكۆشن چونكە لە مردن دەترسن، وە لە خۆیان و خوێنیان و ماڵ وحاڵ و وەزعیان دەترسن....، ئەوە رابواردنی ژیانی دونیا كەمە، دوارۆژ باشترە بۆ كەسێك كە پارێز دەكا لە بێ فەرمانی خوا !.

جا بابزانین ئەو ژیانەی دوارۆژ بۆ كێیە؟، چ كەسانێك ئەتوانن ژیانی دوارۆژ وەدەستبهێنن كە بریتییە لە بەهەشتی بەرین و رەزابوونی خوا؟، وە بریتییە لە بینینی خوای پەروەردگار لە بەهەشتدا، ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ ٢٢، ٢٣- القیامة، وە بریتییە لە پێشوازی مەلائیكەتەكان لە دەرگای بەهەشت كە بریتییە لە حەوزی كەوسەر، كە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەدەستی موبارەكی خۆی ئاو ئەدات بە ئوممەتەكەی، وە بریتییە لە ئەو هەموو نازونیعمەتەی كە لە بەهەشتدا خوای پەروەردگار ئامادەی كردووە، بەپێی حەدیسی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) (أعددتُ لِعِبادي الصَّالحين مالا عَينٌ رَأت ولا أُذُنٌ سمِعَت وَلا خَطَرَ عَلى قَلبِ بَشَر)[1]: ئەو بەهەشتە تیایەتی ئەوەی كە

---

[1] ((حدثنا الحميدي حدثنا سفيان حدثنا أبو الزناد عن الاعرج عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم قال الله تعالى أعددت لعبادي الصالحين ما لا عين رأت ولا أذن سمعت لا خطر على قلب بشر فاقرؤوا إن شئتم فلا تعلم نفس ما أخفي لهم من قرة أعين)).
- صحيح البخاري، كتاب بدء الخلق، باب(٨) ما جاء في صفة الجنة وأنها مخلوقة، رقم الحديث ٣٠٧٢، وأطراف الحديث ((٤٥٠١، ٧٠٥٩، ٤٥٠٢)).

نەچاو بینیویەتی، نە هیچ گوێچکەیەك بیستویەتی!، وە نە بە خەیاڵ و خەونیش بەسەر دڵی هیچ کەسێکدا هاتووە!!، ﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الانفُسُ وَتَلَذُّ الاعْيُنُ﴾ ٧١- الزخرف، واتە: هەرچی نەفس دەیخوازێ و پێی خۆشە و چاو لەزەتی لێ دەکا تێیدا هەیە!، با بزانین چۆن دەگەینە ئەوە؟:

خۆشەویستەکانم، دەمەوێ بچمە خزمەتی سورەتی (الشُّوری) کە سورەتێکی موبارەك و بەناوبانگە لە قورئانی پیرۆز، وە نۆ سیفەتی ئیمانداران لەو سورەتەدا باس دەکەین کە بە سیفەتە بنەڕەتییەکانی ئینسانی مسوڵمان دانراوە، هەریەکەیان تیشکێکی دەخەینە سەر بەو ئومێدەین کە بتوانین ئەو سیفەتە بەرز و بەڕێزانە لە خۆماندا بهێنینە دی بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو کاروانەدا بین کە ڕێگای بەهەشت و ڕەزابوونی خوایان گرتۆتە بەرو خوالێیان ڕازی یە، یاڕەببی خوایە لەوکاروانەمان حیساب بکەی کەوا دەچن بۆ بەهەشت و لەکاروانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بمانژمێری بۆ بەهەشت، یاڕەببی خوایە لە پیاوچاکان و صەحابە بەڕێزەکان دوورمان نەخەیەوە و بەیەکەوە لە بەهەشت کۆمانکەیتەوە، ئامین.

بەڕێزان: یەکەم سیفەت لە سیفەتە بنەڕەتییەکانی ئینسانی مسوڵمان کە سەرەتای قۆناغەکانە بریتییە لە (ئیمان)، خوای پەروەردگار لە درێژەی ئایەتەکەدا ئەفەرموێت: ﴿وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَى﴾ ٣٦- الشوری، واتە: ئەوەی کە لەلای خوایە -ژیانی دوارۆژ- هەم باشترە، وە هەم بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە و تەواو نابێ و نابڕێتەوە...، بەڵام بۆ کێیە؟:

---

- صحيح مسلم، كتاب الايمان، باب: أدنى أهل الجنة منزلة، رقم الحديث ٣١٢، صفحة ١٣٥

یه‌كه‌م: ﴿لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾، بۆ ئه‌و كه‌سانه‌ی ئیمانیان هه‌یه‌!، بۆچی خوای په‌روه‌ردگار ئیمان له‌ سه‌ره‌تای سیفه‌ته‌ به‌رزه‌كان داده‌نێ؟، له‌به‌رئه‌وه‌ی ئیمان بناغه‌یه‌!، ئینسانێك ئه‌گه‌ر خانووێك دروست ده‌كات پێویسته‌ بناغه‌یه‌كی بۆ دابڕێژێت، ئه‌و بناغه‌یه‌ش چه‌نده‌ به‌هێزبێت خانووه‌كه‌ی به‌هێزتر ده‌بێت، ئیمان شتێكه‌ نابینرێت، وه‌ك له‌ زۆر له‌ وتاره‌كاندا باسكراوه‌ ئیمان شتێكه‌ په‌یوه‌ندی به‌ دڵ و ده‌روونی ئینسانه‌وه‌ هه‌یه‌، كاكڵه‌ی ئینسان پێكده‌هێنێ، شوێنه‌وار له‌سه‌ر ئه‌ندامه‌كانی له‌ش په‌یدا ده‌كات، ئیمان و ته‌قوا و نیه‌تی پاك (ئیخلاص)و پاكی و ساغی و یه‌قین...، ئه‌وانه‌ هه‌مووی نابینرێن و په‌یوه‌ندیان به‌ دڵ و ده‌روونی ئینسانه‌وه‌ هه‌یه‌!، بۆیه‌ یه‌كه‌مین شت كه‌ ئینسان ئیعتیمادی له‌سه‌ر ده‌كات وه‌كو سه‌ره‌تایه‌ك بریتییه‌ له‌ (ئیمان)، ئیمان وه‌كو ره‌گ وایه‌ بۆ دارێك كه‌ ئیعتیمادی له‌سه‌ر ده‌كات، چه‌نده‌ ره‌گی ئه‌و داره‌ پته‌وبێ وه‌ چه‌نده‌ به‌ ئه‌رزدا چوبێته‌ خوار ئه‌وه‌نده‌ قه‌د و بالاو لق و پۆپه‌كانی ئه‌وداره‌ قاییم ده‌بن!، ئه‌وه‌نده‌ به‌رگه‌ی ره‌شه‌با و زریان و ته‌وژمی ده‌ره‌وه‌ (خارِجي) ده‌گرێت، چه‌نده‌ ره‌گه‌كانی ئه‌و داره‌ پته‌وبێ و چه‌نده‌ به‌ ئه‌رزدا چوبێته‌ خواره‌وه‌ ئه‌وه‌نده‌ داره‌كه‌ پته‌وه‌!، ئیمانی ئینسانیش چه‌نده‌ پته‌و بێ وه‌كو ره‌گی ئه‌وداره‌ وایه‌، ئه‌وه‌نده‌ خۆی له‌ به‌رامبه‌ر ره‌شه‌با و ته‌وژمی دوژمنانی ئیسلامدا خۆی راده‌گرێ!، له‌ به‌رامبه‌ر فیكره‌ی رۆژئاوا، له‌ به‌رامبه‌ر فیكره‌ی بڵاوكردنه‌وه‌ی خراپه‌ و خراپه‌كاری له‌ناو مسوڵمانانا!، له‌ به‌رامبه‌ر هه‌ڕه‌شه‌ و پیلان و دوژمنایه‌تی كافر و بێ باوه‌ڕاندا له‌ هه‌موو سه‌رده‌م و زه‌مانێكدا!.

بۆیه‌ خۆشه‌ویسته‌كانم، یه‌كه‌م سیفه‌ت سیفه‌تی ئیمانه‌، ئیمان بناغه‌یه‌، بناغه‌كه‌ هه‌رچه‌نده‌ كۆنكرێت بێت و ئه‌ساسه‌كه‌ی داڕێژراو بێت به‌ شێوه‌یه‌كی رێكوپێك ئه‌وه‌نده‌ ئه‌و بینایه‌ی له‌سه‌ری داده‌مه‌زرێ رێكوپێكتره‌!، ئێمه‌ش به‌ڕاستی وه‌كو مسوڵمان ئیسلامه‌تییه‌كه‌مان ده‌بێ له‌سه‌ر ئه‌ساسی ئیمان

دابمه‌زرێنین، چه‌نده ئیمانمان به‌هێزبێ ئه‌وه‌نده ئه‌توانین ته‌قوامان هه‌بێ و له خواترس بین، ئه‌وه‌نده ئه‌توانین له بێ شه‌رعیی بگه‌ڕێینه‌وه، ئه‌وه‌نده ئه‌توانین رێگه‌ی خوا به‌رنه‌ده‌ین و رێگه‌ی پێغه‌مبه‌ران (علیهم الصلاة والسلام) بگرین له خواپه‌رستیدا، چونكه هه‌ر ئیمانه وای له حه‌زره‌تی ئیبراهیم كرد كاتێك كه فڕێی ئه‌ده‌ن بۆ ناو ئاگر كه پشت به‌خوا ببه‌ستێ، وه ئه‌و ئیمانه بوو كه وایلێكرد بڵێ: ((حَسْبِي اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ))[2]، وه ئه‌و ئیمانه بوو كه صه‌برِ و(ثَبات) و ئیستیقامه‌تی ده‌دایێ..، وه به‌رهه‌می ئه‌و ئیمانه‌ش بوو كه خوای په‌روه‌ردگار به ئاگر ده‌فه‌رمویێ ﴿يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلامًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ﴾ ٦٩– الانبیاء، ئه‌ی ئاگر ساردبه و ساردێكی سه‌لامه‌تیش به له‌سه‌ر ئیبراهیم!، خوای په‌روه‌ردگار بۆ هه‌موو كه‌سێك قانوونی خۆی ناگۆڕێ!، ئاگر قانوونه‌كه‌ی وایه ده‌سوتێنێ به‌ڵام خوای گه‌وره ئه‌و قانوونه‌ی خۆی ده‌گۆڕێت بۆ عه‌بدێكی خۆی كه ئیمانێكی چه‌سپاو (راسخ) و پته‌وی هه‌یه كه بریتییه له ئیبراهیم!، بۆیه مه‌دحی ده‌كات و ده‌فه‌رموێ ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيم كَانَ أُمَّةً﴾ ١٢٠– النحل، ئیبراهیم به ته‌نها ئوممه‌تێك بوو!، به ته‌نها كۆمه‌ڵێك بوو، به ته‌نها جه‌ماعه‌تێكی گه‌وره‌بوو، ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِلهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ ١٢٠– النحل.

خۆشه‌ویسته‌كانم: ئیمان دامه‌زرێنه‌ری برایه‌تی و خۆشه‌ویستییه، بۆیه پێغه‌مبه‌رمان (علیه الصلاة والسلام) فه‌رمووی: (لا تَدخُلُوا الجَنَّةَ حَتَّى تُؤمِنُوا)[3]: ناچنه به‌هه‌شت هه‌تا ئیمان نه‌هێنن!، (وَلا تؤمِنُوا حَتّى تَحابُّوا): ئیمانیش

---

[2] واته: خوای په‌روه‌ردگارم به‌سه كه چاكترین یاریده‌ده‌ر و پشتیوانه.

[3] ((حدثنا أبو بكر بن أبي شيبة حدثنا أبو معاوية ووكيع عن الاعمش عن أبي صالح عن أبي هريرة قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم لا تدخلون الجنة حتى تؤمنوا ولا تؤمنوا حتى تحابوا أولا أدلكم على شيء إذا فعلتموه تحاببتم أفشوا السلام بينكم))، صحيح مسلم، كتاب الايمان، باب: بيان أنه لا يدخل الجنة الا المؤمنون، رقم الحديث ٥٤.

ناهێنن هەتا یەکتریتان خۆش نەوێت، (أَوَلا أَدُلُّكُم عَلَى شَيْءٍ إذا فَعَلتُمُوه تَحابَبتُم): ئایا شتێکتان پێنەڵێم ئەگەر ئێوە بیکەن یەکترتان خۆشبوێ؟، (أفشُوا السَّلامَ بَينَكُم)، فەرمووی: سەلام زۆر لە یەکتری بکەن!، سەلامکردن لە یەکتری لە نێوان مسوڵمانانندا چ دروست دەکات؟ خۆشەویستی دروست دەکات، خۆشەویستی لەناو مسوڵماناندا چ پتەو دەکات؟ ئیمان پتەو دەکات!، ئیمان بۆکوێمان دەبات؟، بۆ بەهەشتێمان دەبات (لا تَدخُلُوا الجَنَّةَ حَتَّى تُؤمِنُوا)، کاتێ ئێمە ئەمانەوێ بچینە بەهەشت دەبێ ئەو ئیمانەمان هەبێت کە شایەنی ئەوەیە بمانبات بۆ بەهەشت، بەڵێ خۆشەویستەکانم: ئیمانە شیرنایەتی ئیسلامەتیمان بۆ لە دڵ و دەرووندا دەچەسپێنێ!، چونکە بەپێی حەدیسی پێغەمبەرمان (علیه الصلاة والسلام) لە عەبباسی کوڕی عەبدولموتەڵیبەوە ئەفەرموێ: (ذاقَ طَعم الايمانِ من رَضِيَ بِاللهِ رَبّاً وبِالاسلامِ ديناً وبِمحَمَّدٍ رسولا)[4]: شیرنایەتی ئیمانی چێشتووە ئەو کەسەی بە پەروەردگارێتی خودا رازییە و ملکەچە بۆی، وە بە پێشەوایەتی و قائید و سەرکردایەتی پێغەمبەرمان موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) رازییە، وە پاشان بە بەرنامەێتی ئیسلام رازییە بۆ ژیانی خۆی!، هەر کەسێك بەو سێیانە رازی بێ و کاری پێ بکات ئەو شیرنایەتی و کاکڵەی ئیمانی چێشتووە!، تام و لەززەتی ئیمانی چەشتووە، خۆشەویستەکانم: (ثَلاثٌ مَن كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بِهِنَّ حَلاوةَ الايمانِ)[5] هەر کەسێك سێ سیفەتی تێدا هەبن شیرنایەتی ئیمانی چەشتوە:

[4] ((حدثنا محمد بن يحيى بن أبي عمر المكي وبشر بن الحكم قالا حدثنا عبد العزيز وهو بن محمد الدراوردي عن يزيد بن الهاد عن محمد بن إبراهيم عن عامر بن سعد عن العباس بن عبد المطلب أنه سمع رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول ذاق طعم الايمان من رضى بالله ربا وبالاسلام دينا وبمحمد رسولا))، صحيح مسلم، كتاب الايمان، باب: الدليل على أن من رضي بالله ربا وبالاسلام دينا وبمحمد (صلى الله عليه وسلم)، رقم الحديث٣٤.

[5] ((حدثنا احمد بن جعفر بن حمدان ثنا عبدالله بن أحمد بن حنبل قال حدثني أبي ثنا عبدالوهاب ثنا أيوب عن أبي قلابة عن أنس رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال ثلاث من كن فيه وجد بهن حلاوة الايمان أن يكون الله تعالى ورسوله أحب إليه مما سواهما وأن يحب المرء لا

**یەكەم:** (أن يَكونَ اللهُ تَعالى وَرَسولُهُ أَحَبَّ إِلَيهِ مِمّا سِواهُما)، خوداو پێغەمبەرەكەی لە هەموو شتێك خۆشتربوێ!، دووەم: (وَأَن يُحِبَّ المَرءَ لايُحِبُّهُ إلا لله)، مسوڵمانانی تەنها لەبەر خاتری خوا خۆشبوێن!، وە تەنها مسوڵمانانیشی خۆشبوێن وەكو ئەهلی دین و ئیمان، سێیەم: (وَأَن يَكرَهَ أَن يعودَ فِي الكُفرِ بَعدَ إذ أنقَذَهُ اللهُ عزَّوجَل مِنه كَما يَكرَهُ أَن توقد لَهُ نارٌ فيُقذَفَ فِيها): پێی ناخۆشبیت بگەڕێتەوە سەر كوفر و جاهیلیەتی -پێش ئیسلام- دوای ئەوەی خوا لێی ڕزگاركردووە هەروەكو پێی ناخۆشە ئاگری بۆبكرێتەوەو بخرێتە ناویەوە!، جا خۆشەویستەكانم، یەكەمین شت بریتییە لە ئیمان!، چەندە ئیمانمان دامەزراو بێ ئەوەندە بناغەی ئیسلامەتیمان دامەزراوە و خوای پەروەردگار تەوفیقمان دەدات بۆ ئەوەی خۆمان لە گوناهان بپارێزین.

زۆرجار صەحابە بەڕێزەكان بەیەكتریان دەگوت (تَعَالَوا نُؤمِنُ ساعة): وەرن با سەعاتێك ئیمان بێنین!، ڕۆژێكیان صەحابەیەك كە وایان پێگوت چویە لای پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) شكایەتی كرد، فەرمووی: (یارَسولَ الله) خۆ ئێمە تازە مسوڵمان نەبووین خەڵكێك پێماندەڵێ ((وەرن با سەعاتێك ئیمان بێنین))؟!، هەروەكو خەڵكێك ئەمڕۆش دەڵێ: ((خەڵكێك دەیەوێ ئیسلامەتیمان تازە بۆ بێنێتەوە))، نا كاكە ئیسلامەتیت تازە بۆ ناهێنێتەوە بەڵام ئیسلامەتییێت وەبیر دەهێنێتەوە!!، ئەوە جیاوازی زۆرە كە كەسێك ئیسلامەتیت وەبیر بهێنێتەوە..، ئیسلامێك كە بریتییە لەو قورئانە پیرۆزە و لەو هەموو فەرموودەیە كە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی!، بریتییە لەو هەموو سوننەت و سیرە و تەئریخەی پێغەمبەران و پیاوچاكان، ئیسلامەتی بەڕۆژێك وەرناگیرێت!، ئینسان ناتوانێ بەڕۆژێك و ساڵێك هەزمی بكات و

---

یحبه إلا لله عز وجل وأن یكره أن یعود في الكفر بعد إذ أنقذه الله عز وجل منه كما یكره أن توقد له نار فیقذف فیها))، حلیة الاولیاء، جزء ٢، صفحة ٢٨٨.

هەمووشی لەبیر بێت، بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَى تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ٥٥- الذاريات، باسی ئیسلام بکە چونکە ئەو باسکردن و بیرخستنەوەیە سودی هەیە بۆ مسوڵمانان، دەبێ ئینسان هەوڵبدات ئیسلامەتی وەبیر خەڵکی بهێنێتەوە، بۆیە ئەو صەحابەیە چوە لای پێغەمبەر و فەرمووی: (یارَسولَ الله) چۆن وادەبێ کەسێك پێمان دەڵێ: ((وەرن با سەعاتێك ئیمان بهێنین))، بۆ ئێمە تازە ئیمانمان هێناوە؟!، بەڵێ پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) پشتگیری ئەو خەڵکەی کرد کە فەرموویان (تَعَالَو نُؤمِن سَاعة)، یانی وەرن با سەعاتێك ئیمانمان نوێ بکەینەوە و دایڕێژینەوە و کۆنکرێتی بکەینەوە، چاکسازی و پاکسازی بکەین ئەگەر خڵتەوخاڵی لێ نیشتووە و تەمومژاوی بووە، چونکە ئیمانی خاڵص و ساف و سازگار نەبێ خوای پەروەردگار تەوفیقی نادات بۆ ئەوەی کردەوەکانی تر لەسەر ئەو ئەساسە راپەڕێنێت لەژێر رەزابوونی خوای پەروەردگاردا، بۆیە خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ آمِنُواْ﴾ ١٣٦- النساء، واتە: ئەی ئیماندارینە ئیمان بهێنن!، یانی ئیمان نوێ بکەنەوە و بەردەوام بن لەسەر ئیمانەکەتان، یانی صەبر و ئارامیتان هەبێ لەسەر ئیمانەکەتان، لەسەر ئەو موعانات و ناخۆشی و ناڕەحەتی و سەرما و گەرما و تێنوێتی و برسێتی و نەخۆشییانەی کە دێنە سەر رێتان لە پێناوی ئیسلامدا صەبری لەسەر بگرن و بەکردەوە بەهێزی بکەن!، خۆ ئینسان کە رۆژێ چەندجار دەڵێ: ﴿اهدِنَا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ﴾ ٦، ٧ - الفاتحة؟!، خۆ خوای گەورە رێگای راستی نیشانداوین!، بەڵام بۆ خوای گەورە پێمان دەفەرموێ بڵێین: ((اهدِنَا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ: خوایە رێگای راستمان نیشان بدەی))، رۆژێ چەندجار ئێمە ئەوەی دوبارە دەکەینەوە لە نوێژی سوننەت و واجبماندا؟، ئەوە یانی: خوایە کە

رێگەی راستت نیشانداوین لەسەر رێگای راستیش رامانبگرە!، خوایە لاقمان بچەقێنە، صەبرمان پێ بدە، ئیستیقامەت و جێگیربوون (ثَبات)مان پێبدە!.

**دووەم:** ئەفەرموێ ﴿وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ ٣٦- الشورى، واتە: -وە پاش ئیمانهێنان- پشت بە خوای خۆیان دەبەستن!، پشت بەستن (تَوَكُّل)یان بە خوایە (جل جلاله)، و پشت بەستنیان لەسەر پارە و ماددە نییە، پشت بەستنیان لەسەر كەسانێكی دونیا نییە، پشت بەستنیان لەسەر رەئیس و بەرپرسەكانیان نییە، بەڵكو پشت بەستنیان لەسەر خوایە، ئینسانی مسوڵمان پشت هەر بە خوا دەبەستێ بۆیە پێغەمبەرمان موسا (علیه الصلاة والسلام) بە قەومەكەی فەرموو: ﴿وَقَالَ مُوسَى يَا قَوْمِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُواْ﴾ ٨٤- یونس: ئەی قەومەكەم ئەگەر راست دەكەن ئیمانتان بەخوا هەیە پشت بەخوا ببەستن، كەوابوو پشت بەخوا بەستن نیشانەی ئیمانە!، كەسێك ئیمانی هەبێ پشت بەخوا دەبەستێ وە كەسێك پشت بەخوا ببەستێ مانای وایە ئیمانی هەیە، بۆیە خوای پەروەردگاریش پێمان دەفەرموێ: ﴿وعَلَى اللّهِ فَتَوَكَّلُواْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ٢٣- المائدة، واتە: پشت بەخوا ببەستن ئەگەر راست دەكەن ئێوە ئیماندارن!، ئینسانی ئیماندار پێیوایە كە هەرچی روئەدا لە كەوندا تەقدیری خوایە بۆیە پشت بەخوا دەبەستێ، ناترسێ لەوەی رزقی ببڕێ، ناترسێ لەوەی لە سەفەرێدا رێگرێك یان وەزعێك یا خەڵكێك، كۆسپ و تەگەرەیەك بێتەپێش و وەزعی لێ تێك بدات یان لە مامەڵەكەیدا زەرەر بكات، بەڵكو حەواڵەی خوای دەدات و دەڵێ ((وَأُفَوِّضُ أَمرِي إِلَىَ اللهِ)): خوایە كار و ماندوبوونی خۆم، وەزع و موعامەلە و ئیش و كار و كەسابەتم دایە دەست تۆ، ئەوەی تۆ بیكەی ئەوە چاكە، هەمووی بەدەست خوایە، بۆیە پێغەمبەرمان (علیه الصلاة والسلام) بە عەبدوڵای كوڕی مامی فەرموو: (إعلَم أَنَّ الامَّةَ لَوِ اجتَمَعَت عَلى أَن يَنفَعُوكَ

بِشَيءٍ ما يَنفَعُوكَ بِشَيءٍ الا قَد كَتَبَهُ اللّهُ لَك)، واته: بزانه ئەی عەبدوڵا ئەگەر هەموو ئوممەتی سەر رووی زەوی كۆببێتەوه لەسەر ئەوەی قازانجێكت پێ بگەیەنن ئەو قازانجەت پێناگات ئەگەر خوا بۆتی نەنوسیبێت!، (وَاعلَم أنَّ الامَّةَ لَوِ اجتَمَعَت عَلى أن يَضُرّوكَ بِشَيءٍ ما يَضُرّوكَ بِشَيءٍ الا قَد كَتَبَه اللّهُ عَلَيك) واته: ئەگەر هەموو ئوممەتی سەر رووی زەویش كۆببێتەوه لەسەر ئەوەی زەرەرێكت پێبگەیەنن ناتوانن ئەو زیانەت لێبدەن مەگەر خوا بۆ تۆی نوسیبێت، جا كەوابوو ئینسانی مسوڵمان دەبێ پشت بەستن (تَوكّل)ی لەسەر خوا بێ و پشتیوانی بەخوا بێ: ﴿وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ٦٨- آل عمران، ﴿نِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ﴾ ٤٠- الانفال: خوا باشترین پاڵپشت و سەرپەرشتیكار و یامەتیدەره بۆ ئینسان.

بەڵێ خۆشەویستەكانم، ئینسان ئەگەر ئیمانی هەبێ پشت بەخوا دەبەستێ، چەندە ئیمانت بەهێزبێ ئەوەندەش پشت بەستنت بەخوا بەهێزتر دەبێ، پیاوێك و ئافرەتێك هاتنە خزمەت پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) كوڕەكەیان دیل (أسیر) بوو لەلای كافرەكان، فەرموویان: (يارَسولَ الله) وەزعمان زۆر ناتەواوە، كوڕەكەمان دیله و هەر ئەو كوڕەمان هەیە، زۆر دڵتەنگین و خەریكە صەبرمان نەمێنێ، چی بكەین چاكە؟، پێغەمبەر فەرمووی بڕۆنەوە هەربڵێن: (لاحَولَ وَلا قُوَّةَ إلا بِالله العليِّ العَظيم)[٦]، ئەو زیكره بۆ هەر مسوڵمانێك، بۆ هەر باوك و دایكێك، برایەك خوشكێكی بەرێز كه موصیبەتێكی دێته پێش با ئەو زیكره بكات خوا بەڵایەكەی لەسەر سوك دەكات، بڵێ: (لاحَولَ وَلا قُوَّةَ إلا بِالله العليِّ العَظيم)، بەردەوام لە رۆژ و شەودا بیڵێتەوە خوای گەورە دەرگای خێری لێدەكاتەوە، تەماشا بكەن كه خوای گەورە ئەو رێنموونییەی فێری پێغەمبەر

[٦] واته: هاتن بەرە و تاعەت و خواپەرستی و توانای مانەوە لەسەری هەر بەیارمەتی خوای بەرز و مەزنە.

(علیە الصلاة والسلام) کردووە کە بە مسوڵمانان بڵێ و ئەویش تەوجیهی ئەو دایك و باوکەی کرد، ئەوان ڕۆیشتنەوە و لە ماڵەوە هەر ئەو زیکرەیان کـرد، وەختێـك لە نیوەشەو یەکێك لـە دەرگـا ئـەدات کـە دەرگـا ئەکەنـەوە تەماشـا ئەکـەن کوڕەکەیانە و هاتۆتـەوە وە مـەڕوماڵاتی زۆریـشی هێنـاوە لـەلای دوژمنـانی ئیسلامەوە ڕفاندویەتی، بۆیە خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا﴾ ٢- الطلاق، واتە: هەر کەسێك پارێز لە خوا بکات خـوا دەرووی لـێ دەکاتەوە، ﴿وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِبُ﴾ ٣- الطلاق، واتە: ڕزقی بۆ ئـەنێرێ بەشێوەیەك کە خۆی هەستی پێناکا، ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾ ٣- الطلاق، واتە: وە هەر کەسێ پشت بە خوا ببەستێت خوا بەسیەتی، ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ﴾ ٣٦- الزمر، واتـە: ئایـا خـوا بـەس نییـە بـۆ عەبـدی خـۆی؟، بێگومان خوا بەسە!، بەڵێ خۆشەویستەکانم: پشتبەستن بەخوا دووەم سیفەتە لە سیفەتی ئیمانداران کە ڕێگایە بۆ بەهەشت و ڕەزابوونی خوا.

**سیفەتی سێیەم:** خوای گەورە ئەفەرموێ ﴿وَالَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ﴾ ٣٧- الشوری، واتە: ئەوانەی خۆ لە گوناهی گەورە دوور دەگرن، خوای گەورە دەفەرموێ (كَبَائِرَ الاثم: **گوناهی گەورە**) و (الفواحِش: **تاوانی دزێو و خراپ و ناشیرین**)، (الاثم) ئەو گوناهانەیە کە وەکو: شیرك و ئیلحاد و کوفر و نیفاق و... هتـد، ئەوانـە دەگرێتـەوە، وە (الفاحِشة): یـانی گونـاهی دزێـو و ناشیرین بەڵام (فاحشە) ئەگەر (مبیِّنة)ی لەسەر بێ بەواتای دەرچوون لەقسەی مێرد دێت، کەواتە هـەموو ئەوانـە دەگرێتـەوە کـە بێـزراون و گونـاهی زەق و ناشیرینن لە کۆمەڵگای ئیسلامەتیماندا، خوای گەورە دەفەرموێ ((ئەوانەی کە خۆ لەو گوناهانە دەپارێزن))، نەشی فەرمووە ((ئەوانەی ئەوگوناهانە ناکـەن))!، فەرمووی: (يَجْتَنِبُونَ)، إجتِنـاب: یـانی خۆپاراسـتن و خـۆلێ دوورگـرتن، تخـون نەکەوتن، ئینسانێك ئەگـەر بیـەوێ خـۆ لـە کەسـێکی دز بپـارێزێ بەلاشـیدا

تێناپەڕێ، ئەگەر بیەوێ نەچێتە نادی و مەشروب نەخواتەوە بەبەردەرگای نادیشدا تێناپەڕێ، ئەگەر بیەوێ ماڵی هەتیو نەخوات تخونی ماڵی هەتیو ناکەوێ بۆ ئەوەی بەناچاری توشبێت و ماڵەکە بخوات، تخونی ماڵی حەرام ناکەوێت، ئەگەر بیەوێ کارێکی حەرام نەکات لەدەورەی حەرام ناسورێ، ئەگەر بیەوێ خۆی لە زینا بپارێزێ دەبێ خۆی لە شوبوهاتی دەوری زینا بپارێزێ کە بریتییە لە قسەکردن لەگەڵ ئافرەتانی نامەحرەم، وە نەزەر و ئەو شتانەی کە ڕێخۆشکەرن بۆ زینا، ئەگەر بیەوێ قەتل نەکات دەبێ خۆی بپارێزێ لە زوڵم و لەو شتانەی کە بەهۆیەوە توشی قەتل دەبێ و لە پیاوی خەراپ بۆ ئەوەی بەهۆی پیاوی خەراپەوە توشی قەتل نەبێت، بەڵێ خۆشەویستەکانم: خوای گەورە دەفەرموێ (یَجْتَنِبُونَ: خۆیان دەپارێزن و خۆیان دوور دەگرن)، جا ئەوە یەکێکە لە سیفەتە بنەڕەتییەکانی ئینسانی مسوڵمان!، خوای گەورەش وەعدی بە ئێمە داوە کە ئەگەر ئێمە خۆمان لە گوناهە گەورەکان بپارێزین بەفەزڵی خۆی خوا لەو گوناهە گچکانە دەمانبوورێ کە لەناکاودا توشمان دەبن و دوایی (إستِغفار)ی لێ دەکەین و لە خوا دەپاڕێینەوە عەفومان بکات، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ﴾ ٣١- النساء: ئەگەر ئێوە خۆتان لەو گوناهە گەورانە دووربگرن کە خوا نەهی لێکردون کە بیکەن، ﴿نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ﴾ ٣١- النساء: لە گوناهە گچکەکانتان دەبوورین، بەڵام بەو جۆرەنا کە ئەو گوناهە گچکانەش هەر لەسەر یەك کەڵەکە بکەی و دوایی ببێتە گوناهی گەورە!، چونکە گوناهی گچکە ئەگەر لەسەریەك کەڵەکەی کرد و تەوبەی لەسەری نەکرد دەبێتە گوناهی گەورە، وەکو شاعیر فەرموویەتی: (إنَّ الجَبَلَ مِنَ الحَصی) واتە: چیا لە وردە بەردی گچکەلۆکە پێکهاتووە تا ئەو چیایە گەورەی لێ پێکهاتووە، یاخود عەرەب دەڵێ: (حَبَایَة حَبَایَة تَسیرُ کُبَّایَة) واتە: دەنکە گەنم وردە وردە کۆدەبنەوە هەتاوەکو کوببەیەکیان لێ پێکدێت کە

ئینسان دەیخوات!، بۆیه بەڕاستی ئەو دەنكه دەنكانه شتی گەورەیان لێ دروست دەبێ، گوناهی گچكه گچكەش دەبێته گوناهی گەورە ئەگەر لەسەری بەردەوام بێ، بۆیه عەبدوڵلای كوڕی عەبباس (خوالێی رازی بێ) قسەیەكی زۆر جوانی هەیە بۆ بابەتی گوناهی گەورە و بچوك و پێناسه كردنیان، ئەفەرموێ: (لا صَغيرَةً مَعَ الاصْرارِ ولا كَبِيرَةً معَ الاستِغفارِ) واتە: بەگوناهی بچوك ناگوترێ ((بچوك)) وەختێ كه لەسەری بەردەوام بی!، وە به گوناهی گەورەش ناگوترێ ((گەورە)) كه تەوبەت لەسەری كرد و پەشیمان بویەوە خوا لێتدەبورێ!، مانای وایە نابێ ئینسان ئەوەندە بێ ئومێد (مَأيوس) بێ له رەحمی خوا!، وە نابێ ئەوەندە ئەمینیش بێ له غەزەبی خوا!، كه ئەمین بوون له غەزەبی خوا و نائومێدی (يَأس) له رەحمی خوا نیشانەی كافر و بێباوەڕانه ئینسان نابێ نه ئەمین بێت له مەكری خوا، وە نه بێ ئومێد (مَأيوس)یش بێ له رەحمی خوا بۆیه دەبێ ئەگەر ئینسان گوناهێكی گەورەشی له دەست روویدا تەوبه بكات و پەشیمانبێتەوە و بزانێت كه خوای گەورە عەفووی دەكات، بەڵام گوناهی گچكەش ئەگەر لەسەریەك كەڵەكەیانكرد و زیادبوون ئەوكاتە ئەویش لەوانەیە به گوناهی گەورەی لەسەر حیساب بكرێ -خوا بمانپارێزێت-

**چوارەم:** ئەفەرموێ ﴿وَإِذَا مَا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ﴾ ٣٧- الشوری، سیفەتی چوارەم ئەوەیە: كاتێك كه توڕە دەبن له بەرامبەر مسوڵمانان‌دا خاوەنی عەفوو لێبوردنن، مسوڵمان نابێ هەر كاتێك كه توڕەبوو رقی خۆی بڕێژێت بەسەر موقابیلدا، توڕەبوون دوو توڕەبوونه: توڕەبوونێك هەیە بۆ دونیا، توڕەبوونێك هەیە بۆ دین!، هەموو توڕەبوونێكی دونیایی خەراپ و سەرزەنشتكراو (مَذموم)ە، لەسەر خۆت توڕەبیت خەراپە چونكه پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) هەرگیز لەسەر خودی خۆی توڕە نەبووە!، وەختێك كه قسەیەك بەرامبەر خۆی كرابێ له موقابیلی قسەكەی خۆیدا ئینتیقامی وەرنەگرتووە، كابرای ئەعرابی

هاتووە ئێقەی كراسی پێغەمبەری گرتووە و گوتویەتی: (إعـدِلْ یامُحَمَّـد) ﷺ، پێی گوتـووە: بۆچـی عەدالـەت ناكـەی ئـەی موحەممـەد ؟!، یەقـەی گرتـووە، عومەری كوڕی خەتتاب (خوا لێی رازی بێ) ویستویەتی بیكوژێت بەڵام پێغەمبـەر (علیه الصلاة والسلام) نەیهێشتووە!، وتویەتی ئەوە نازانێ و شتی بۆ ڕونكردۆتـەوەو لەسەر خۆی تووڕەنەبووە، بەڵام كاتێـك كـە كراسـی ئـافرەتێكی مـسوڵمان لـە بـازاڕی مەدینـەدا لەلایـەن دوژمنـانی ئیـسلامەوە هەڵدەدرێتـەوە بۆئـەوەی عـەوڕەتی دەركـەوێ پێغەمبـەر (علیه الصلاة والسلام) شـەڕێكی لەسـەر بـەرپا دەكات!!، دوژمنێكی ئیـسلام بـۆ ئیهانـەكردن بـەو ئافرەتـە مـسوڵمانە و بـە مـسوڵمانان لـە بـازاری مەدینـەدا وایكـردووە پێغەمبـەر (علیه الصلاة والسلام) جـەنگێكی بـەرپاكرد بـۆ دیفـاعكردن لـە موقەددەسـاتی مـسوڵمانان!، بـۆ دیفاعكردن لە شەرەف و كەرامەتی مسوڵمانان!، بۆیـە نابـێ ئینـسان لەسـەر خـۆی تووڕەبێـت ﴿وَإِذَا مَـا غَـضِبُوا هُـمْ يَغْفِـرُونَ﴾ ٣٧- الـشورى، پێغەمبـەر ئەفەرموێ: (لَيس الشَّديدُ بِالصُّرعَة إنَّما الشَّديدُ الّذي يَملِكُ نفسه عِندَالغَـضَب)[٧] واتە: پاڵەوان ئەوكەسە نییە كە یـەكێك لـە ئـەرز بـدات بـەڵكو پاڵـەوان ئـەو كەسەیە كەوا لە كـاتی تووڕەبونـێ خـۆی رابگرێـت!، بۆیـە كەسـێك هاتـە لای پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) سێ جـار داوای لـێ كـرد كـە ئامۆژگـاری بكـات ئەویش هەرسێك جارەكە پێی فەرموو: (لا تَغـضَب)[٨]، خـوای گـەورە دەربـارەی سـیفەتی ئیمانـداران دەفـەرموێ ﴿وَالْكَـاظِمِينَ الْغَـيْظَ﴾ ١٣٤- آل عمـران:

---

[٧] ((حدثني عن مالك عن بن شهاب عن سعيد بن المسيب عن أبي هريرة ان رسول الله صلى الله عليه وسلم قال ليس الشديد بالصرعة إنما الشديد الذي يملك نفسه عند الغضب))، الموطأ، كتاب حسن الخلق، باب: ما جاء في الغضب، رقم الحديث ١٦١٣

[٨] ((حدثني يحيى بن يوسف أخبرنا أبو بكر هو بن عياش عن أبي حصين عن أبي صالح عن أبي هريرة رضي الله عنه أن رجلا قال للنبي صلى الله عليه وسلم أوصني قال لا تغضب فردد مرارا قال لا تغضب))، صحيح البخاري، كتاب الادب، باب الحذر من الغضب، رقم الحديث ٥٧٦٥.

ئەوانەی کە رقی خۆیان دەخۆنەوە، ﴿وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ﴾ ١٣٤- آل عمران: ئەوانەی کە خەڵکی عەفوو دەکەن، ﴿وَجَزَاء سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ﴾ ٤٠- الشوری، یەکێك هەڵەیەکی لە بەرامبەردا کردی ئەتوانی لە موقابیل ئەو هەڵەیە وەڵام بدەیەوە، بەڵام ﴿فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ﴾: ئەگەر عەفووی بکەی و چاکەیەکی بەدوادا بێنی ئەوە پاداشتت دەکەوێتە لای خوا، ئایا تۆ پاداشتی لای خوات دەویٚ یان رقی خۆت برێژی بەسەر موقابیلدا؟!، هی وا هەیە لە باوکی تورە بووە، لە برای تورە بووە، لە خێزانی تورە بووە، لە خزم و کەس و جیرانەکەی تورە بووە..، رقی خۆی رشتووە بەسەر موقابیلەکەی خۆیدا، یان دەڵێ: ((وەڵاهی دەبێ بۆ قیامەتێ بێت گەردنی ئازا ناکەم!))، نەخێر برا و خوشکی بەرێز، گەردەنی ئازاد بکە و چاکەیەکیشی لەگەڵ بکە با پاداشتی دوارۆژت هەبێ باشترە خۆ لە دونیادا هیچت هەر پێنابرێت، ئایا بەهەشتەکەت پێخۆشترە یان ئەو رق و قینەی کە لە دڵتدا هێشتۆتەوە لە بەرامبەر دایکت و باوکت و خێزانت و منداڵت، لە بەرامبەر جیران و ئەهلی موعامەلە و بازارت، وە هەموو خۆشەویستانی دەوروبەرت، جا رقی خۆت بخۆرەوە وەکو پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: رقبوونەوە لە شەیتانە!، شەیتان رقی ئینسان دەکاتەوە و غەزەب بۆ ئینسان دەنێرێ، شەیتانیش لە ئاگر دروستکراوە جا ئەگەر تورەبوون برۆن دەستنوێژ بشۆن چونکە ئاگر بە ئاو دەکوژێتەوە، ئەو رقەتان بە ئاوی ئەو دەستنوێژە دادەمرکێتەوە و ئاگاداربن کە لەکاتی رق بوونەوەتان دەستنوێژ بشۆن و دوو رکات نوێژ بکەن رقەکەتان نامێنێ!.

**پێنجەم:** ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ﴾ ٣٨- الشوری: مسوڵمانە راستەقینەکان یەکێك لە سیفەتەکانیان ئەوەیە وەڵامی بانگەوازی خوای گەورە دەدەنەوە!، خۆیان تەسلیمی بەرنامەی خوا دەکەن، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَجِيبُواْ لِلّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا

دَعَاكُم لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾ ٢٤- الانفال، واتە: ئەی ئیماندارینە وەڵامی بانگەوازی خوا و پێغەمبەری خوا بدەنەوە بۆ شتێك كە زیندووتان دەكاتەوە، ئەو ئیسلامە ئینسانی زیندوو دەكاتەوە هەم لە دونیا وەهەم لە قیامەتیش!، كۆمەڵگایەك كە ئیسلامەتی تێدا بەرنامە و حاكم بێت كۆمەڵگایەكی زۆر زۆر خۆشحاڵە، وە دەستپاك و داوێن پاك و دەم پاك و دڵ و دەروون پاكە!، كۆمەڵگایەكی ساغ و ساف و سازگارە!، بەڵام كۆمەڵگایەك كە ئیسلام تێیدا پیادە نەكرێ بۆگەنە!، بۆیە ﴿وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ﴾ یانی ئەوانەی خۆیان تەسلیمی بەرنامەی خوا دەكەن، وەڵامی بانگەوازی خوا ئەدەنەوە، خوا ئەفەرموێ: ﴿فَلا وَرَبِّكَ لا يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ ٦٥- النساء، واتە: سوێند بە خوای تۆ ئەی موحەممەد كەس ئیمانی نییە هەتا تۆ نەكەن بە فەرمانڕەوا لە نێوان خۆیاندا، وە هەتا دینی خوا نەكەنە حاكم و رازی نەبن بە بەرنامەی خوا، وەختێك رازی بوون كە بەرنامەی خوا دادوەر (حاكم) بێت وە بۆ هەموو حوكمەكان بردنتەوە لای بەرنامەی خوا ئەوكاتە مسوڵمانن، ئێمە هەر حوكمێكمان دێتە پێش ئیختیلافێكمان دێتەپێش كێشەیەكی كۆمەڵایەتیمان هەیە بەرنامەی خوا (ئیسلام)مان هەیە، دەبێ بەرنامەكەی خۆت بكەیتە حاكم بۆ چارەسەری كێشەكانی خۆت.

بەڵێ خۆشەویستەكانم، ئیسلام هەم عیبادەتە، هەم بیروباوەر (عَقيدة)یە، وە هەم سیاسەتە، وە هەم رێكخستن (تَنظِيم)ە، وە هەم ئیدارەیە، هەم عەسكەرییە، هەم پاراستنی ئەمنییەتی مسوڵمانانە، وە هەم پاراستنی ئەمنییەتی موقەددەساتی ئیسلامە..، ﴿اسْتَجِيبُواْ لِلّهِ وَلِلرَّسُولِ﴾ یانی بەرەو بانگەوازی خوا و پێغەمبەر بچن و وەرنە ناو بەرنامەی خوا بەشێوەیەكی گشتی دەبێتە ناز و نیعمەت بۆتان.

**شەشەم**: سیفەتێكی تری ئەو ئیماندارانە ﴿وَأَقَامُوا الصَّلاةَ﴾ ٣٨- الشورى، واتە: نوێژ بەرپا دەكەن و ئەنجام دەدەن، تەماشا بكەن خوای گەورە نوێژی هێناوەتە خاڵی شەشەم!!، بۆچی؟!، چونكە كەسێك ئیمانی نەبێت و پشت بەخوا نەبەستێت و خۆی لە گوناهی گەورە نەپارێزێت و لە هەمانكاتیشدا وەڵامی بانگەوازی خوای گەورە نەداتەوە نوێژی قەبوڵ نابێت!!، نوێژ ئەو نوێژەیە كە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الصَّلاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ﴾ ٤٥- **العنكبوت**، نوێژێك كە ئینسان دەپارێزێ لە خەراپە و خەراپەكاری، دەبێ نوێژ فەرمانت پێ بكات و لە خەراپە و خەراپەكاری بتگێڕێتەوە!، بەڵام نوێژێك كە لە خەراپە نەتگێڕێتەوە ئەوە دیارە ئیستیفادەت لە نوێژەكە نەكردووە!، نوێژ بۆیە لێرە بە روكنێكی زەق باسكراوە لە روكنەكانی ئیسلام چونكە نوێژ كڕنۆشبردن (السَّجدة)ی تێدایە بۆ خوا!، ئینسان كە نوێژ دەكات ئیسپاتی دەكات كە عەبدی خوایە و ملكەچە بۆ خوا، ئیسپاتی دەكات كە خوا گەورەو دروستكەرو پەروەردگاری ئینسانە!، بۆیە ئینسان سەر بەئەرزێدا دەكات بۆ خوا چونكە سەر بەئەرزێداكردن بۆ خوا و تەسلیم بوون بۆی زۆرگەورەیە!، نوێژكردن یانی تەسلیم بوون بۆ خوا بۆیە پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (إِذا رَأَيتُمُ الرَّجُلَ يَتَعاهَدُ المَسجِدَ فَأشهَدُوا لَهُ بِالايمانِ)[٩] واتە: ئەگەر پیاوێكتان بینی بەردەوام دەچێ بۆ مزگەوت و ئەهلی نوێژی جەماعەت بوو شاهێدی بۆ بدەن كە ئیماندارە!، كەوابوو بەڕاستی ئەهلی جومعە و جەماعەت ئەهلی ئیمانن، ئەوانەی كە ئەهلی مزگەوتن ئەهلی ئیمانن، ئەهلی نوێژ ئەهلی ئیمان و رەزابوونی خوای پەروەردگارە.

---

[٩] ((عن دراج أبي السمح عن أبي الهيثم عن أبي سعيد قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم إذا رأيتم الرجل يتعاهد المسجد فأشهدوا له بالايمان))، سنن الترمذي، كتاب الايمان، باب: حرمة الصلاة، رقم الحديث ٢٦١٧

**حەوتەم**: لە سیفەتەكانی ئیماندار ئەوەیە: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ ٣٨-الشوری، واتە: فرمانەكانیان و ئەمر و كاروكردەوەیان بە مەشۆرەت لە نێوانی خۆیاندا جێبەجێ دەكەن!، یەكێك لە سیفەتی مسوڵمانان ئەوەیە كە لە نێوانی خۆیاندا مەشۆرەت دەكەن، دیكتاتۆریەت لە ئیسلامدا نییە!، ئەوە كە ئینسان هەر بە دڵی خۆی بكات و خۆی بسەپێنێ و بە كەیفی خۆی بڕیار بدات و رای كەس نەخوێنێتەوە و نامەی كەس نەخوێنێتەوە ئەوە لە ئیسلامدا نییە، بۆیە خوای پەروەردگار ناوی لەم سورەتە ناوە سورەتی (شُوری: راوێژكردن)، یانی مسوڵمانان دەبێ شورایەكیان هەبێت!، مسوڵمانان دەبێ قیادەیەكیان هەبێت وەكو ئەهلی شورای مسوڵمانان كاروباری مسوڵمانان بەڕێوەبەرن، مسوڵمانان دەبێ رازی بن بەوەی كە مەشۆرەت و پرس و راوێژ بەیەكتری بكەن بۆ ئیشوكاری مسوڵمانان، وە هەروەها لە ماڵێشدا دەبێ مەشۆرەت بە دەوروبەری خۆت بكەی، ئەگەر باوكە مەشۆرەت بە كوڕەكانی دەكات، ئەگەر مێردی نافرەتە مەشۆرەت بە خێزانەكەی دەكات، هی واهەیە لە ماڵەوە پێی عەیبە مەشۆرەت بە خێزانەكەی بكات وەختێك كە خانووەكەی دەفرۆشێت یاخود دەكڕێت، یان سەیارەكەی دەكڕێ و دەیفرۆشێ، یان موعامەلەیەك دەكات پێی عەیبە مەشۆرەت بە خێزانەكەی بكات!، وا نییە.. زۆرجار دەبینی خێزانەكەت رایەكی زۆر باشی هەیە و رایەكەی تۆ نەپێكاوە!، زۆرجاریش هەیە رای پیاوەكە بۆ خێزانەكەی رایەكی زۆر باشە!، زۆرجار هەیە پیاو ئیستیفادە لە منداڵەكانی خۆی دەكات كە رەئی و مەشۆرەتیان لێوەردەگرێت، ئیستیفادە لە رای جیرانەكانی دەكات بەوەی كە كەسێك دەناسێت موعامەلەی لەگەڵ بكات، ئیستیفادە لە رای برایەكانی دەكات...، لەبەرئەوە مەشۆرەتكردن یەكێكە لە سیفەتی ئیمانداران و پێویستە ئەوەش یەكێك بێ لە بەرنامەی خۆمان!.

**هەشتەم:** ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ ٣٨- سورة الشورى، واتە: لەوەی کە پێمانداون دەیبەخشن لە پێناوی خوا، یانی ئەوەی کە خوا بەتۆی داوە لە ناز و نیعمەت، یەکەم: هی خوایە، دووەم: وە دەبێ لە پێناوی خواشدا سەرفی بکەی، کە بەداخەوە ئەمڕۆ زۆرێك لە ماڵ و حاڵ و وەزعی مسوڵمانان ناهەموارە لەوەدا کە خەڵکی دەوڵەمەند یان خاوەن خێزانەکان ماڵی خۆیان سەرف ناکەن و توشی بێشەرعیی دەبن، ماڵی واهەیە کە خاوەن ماڵەکە ماڵی سەرف ناکات تەنانەت لەسەر خاوخێزانی خۆیشی!، دەوڵەمەندیشە بەڵام ماڵەکەی گرتۆتەوە لە خێزانی و منداڵەکانی و لە بوکی و کوڕ و نەوەکانی..، کە ئەو ماڵ و منداڵەی موحتاجە بۆ ئەو سەرفەی خۆیان، پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: درهەمێك کە سەرفی دەکەی لەسەر ماڵ و منداڵت گەورەترین خێری هەیە!.

**نۆیەم و کۆتایی:** لە سیفەتەکانی ئیمانداران کە بەرەو بەهەشت رامان دەکێشێ ئەوەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْيُ هُمْ يَنتَصِرُونَ﴾ ٣٩- الشورى، واتە: ئەوانەی کاتێك زوڵمیان لێدەکرێ قەبوڵی زوڵم ناکەن، مسوڵمان نابێ دەستەپاچە بێت!، مسوڵمان نابێ ئەوەندە لاواز بێت و ئەوەندە سەری خۆی کز بکات و بێدەنگ بێ لە ئاقاری ئەو هەموو زوڵم و ستەمەی کە لێی دەکرێ، مسوڵمان لە ئاقار زوڵمێکدا کە لێی دەکرێ چ زوڵم لە شەخصی خۆی بکرێ، وە چ زوڵم لە مسوڵمانان بکرێ، وە چ زوڵم لە موقەددەساتی ئیسلام دەکرێ دەبێ بە وەڵام بێت، دەبێ وەڵامی هەبێت!، ئەو خەڵکەی کە ئەمڕۆ لە سەرتاسەری دونیا لە بەرامبەر کوفری عالەمیدا ماندووە و خەبات دەکات و تێدەکۆشێ لەبەرئەوە نییە کە ژیانی دونیای پێخۆش نییە و پێی خۆش نییە لە دونیادا رابوێرێت بەڵام بەواجبی دەزانێت، لەو هەموو وڵاتانەی کە حەرەکاتی جیهاد و ئیسلامی تێدایە و بەربەرەکانی دوژمنانی ئیسلام

دەکرێ، ئەوە هەمووی بەڕاستی بە دینی دەزانێت بۆیە قەبوڵ ناکات!، خوای گەورە یەك یاسای بۆ ئێمە داناوە کە ئەفەرموێ: ﴿لا تَظْلِمُونَ وَلا تُظْلَمُونَ﴾ ٢٧٩- البقرة، واتە: نابێ زوڵم بکەن وەنابێ زوڵمیشتان لێبکرێ!، یانی نە خوا پێی خۆشە کە ئێوە زوڵم بکەن چونکە زوڵم دەستدرێژی (إعتِداء)ە، ﴿إِنَّ اللّـهَ لا يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ﴾ ١٩٠- البقرة، واتە: خوا دەستدرێژیکەرانی خۆشناوێن!، وەنابێ زوڵمیشتان لێبکرێ و قەبوڵیش بکەن زوڵمتان لێبکرێ!.

جا برا بەڕێزەکانم، خۆشەویستەکان: ئەو نۆ سیفەتە نۆ سیفەتی بنەڕەتی ئینسانی مسوڵمانە کە خوای گەورە دەفەرموێ: قیامەت باشترە وە بەردەوامترە بۆ کەسانێك کە ئەو سیفەتانەیان تێدا هەبێت:

یەکەم: ئیمانی راستەقینەیان هەبێت.

دووەم: پشت بەخوا ببەستن.

سێیەم: خۆیان لە گوناهی گەورە بپارێزن.

چوارەم: لەکاتی توڕەبوون لە بەرامبەر مسوڵماناندا خۆیان رابگرن و زەبتی نەفسی خۆیان بکەن.

پێنجەم: وەلامی بانگەوازی خوا و پێغەمبەری خوا بدەنەوە وەختێ کە ئەمر و فەرمانێکی خوایی هەبێت و ئیجتیهادی تێدا نەکات، کار و فەرمانی خوا ئیجتیهادی تێدا ناکرێت، بریاری خوا بریارێکی وایە کە دەبێ ئینسان تەسلیمی بێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللّـهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ ٣٦- الاحزاب، خوا ئەفەرموێ: نابێ ئینسان سەرپشك (مُخَيَّر) بێ لە بەرامبەر بەرنامەی خوا!.

شەشەم: ﴿وَأَقَامُوا الصَّلاةَ﴾ ٣٨- الشورى، نوێژ ئەنجام دەدەن.

حەوتەم: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ ٣٨- الشورى، كاروباريان له نێوان خۆياندا به مەشۆرەتە.

هەشتەم: ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ ٣٨- الشورى، لەوەی كە پێمانداون دەيبەخشن له پێناوی خوا.

نۆيەم: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْيُ هُمْ يَنتَصِرُونَ﴾ ٣٩- الشورى، ئەوانەش كە زوڵميان لێدەكرێ قەبوڵی ناكەن.

جا خوای پەروەردگار وامان لیّ بكات كه ئەو نۆ سیفەتەمان تێدا هەبن بۆ ئەوەی بتوانين ئەهلی بەهەشت بين و خوای پەروەردگار لێمان رازی بیّ.

يارەببی خوايه رەحمەمان پیّ بكەی، يارەببی خوايه عاقیبەتی عومرمان خێر بكەی، خوايه وابكەی ئەو نۆ سیفەته موبارەكەمان تێدا بێتەدی، خوايه ئیستیقامەت و جێگیربوون (ثَبات)مان بدەيتیّ لەسەر ئەو نۆ سیفەته ئەگەر تێماندا هەيه وه ئەگەر تێماندا نییه خوايه بۆمان تەواو بكەی، خوايه لەسەر راستە شەقامی ئیسلام رامانبگری، بە مسوڵمانێتی بمانژيێنی و بە مسوڵمانێتی بمانمرێنی، عاقیبەتی عومرمان خێر بكەی، خۆمان و ماڵ و منداڵ و خزم و كەس و دۆست و خۆشەويستانمان هيدايەت بدەی بۆ ئەوەی عەبدی راستەقینەی تۆ بين، خوايه وڵات و نیشتیمانیشمان بپارێزی له هەموو ئافات و دەردوبەڵايەك.

ئامين

اقول قولي هذا واستغفر الله لی ولكم و لسائر المسلمين فاستغفروه انه كانَ غفاراً، أعوذ بالله من الشيطان الرجيم ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ آمين.

# یه‌قین

﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ ٥٥- النـــور

# بسم الله الرحمن الرحيم

انَ الحَمدَ لِلهِ نَحمَدُهُ ونَشكُرُهُ وَنَستَغفِره وَنَستَهدِيه، ونعوذ بِاللهِ مِن شُرُورِ أَنفُسَنا وسيئات اَعمَالِنا، من يَهدِه اللهُ فَلا مُضِل لَه، ومن يضلل فَلا هادِي لَهُ..، نَشهَدُ أَن لا الهَ الا اللهُ وحدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، وَنشهَدُ اَن سيدَنا وَنَبينَا مُحمداً عَبده ورسُولهُ.. هَذا الرَسولُ الذِي بَلَّغَ الرِسَالةَ وَأَدى الامانَةَ وَنَصحَ الامَةَ وَجَاهَدَ فِي اللهِ حَقَ جِهَادِهِ وَتَركَنا عَلى المحجَةِ البَيضاء، لَيلُها كَنَهارِها، لايَزِيغُ عَنها الا هَالِك، اللَهُمَ صَلي وَسَلِم وَزِد وَبارِك عَلَى هَذا الرَسُول الكَرِيم وَعَلَى آلِهِ وَأَصحَابِه وَالتَابِعينَ وَعَلَى اُمَته الى يومِ القِيامةِ اَجمعِين... اَمَا بَعدُ أُوصِيكُم عِبادَ الله وَنَفسِي أَولاً بِتَقوَى اللهِ، فإِنَ اللهَ مَعَ الَذِينَ اتَّقُوا وَالذِينَ هُم محسِنون، قَالَ الله (سبحانه وتعالى) فِي كِتابِهِ الحَكِيمِ بِسمِ اللهِ الرَحمنِ الرَحِيم ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ ١- النساء.

ئیمانداران، ئەی ئوممەتی پێغەمبەری پێشەوا حەزرەتی موحەممەد ﷺ، ئەی خۆشەویستانی ئەو پێغەمبەرە بەرێزە ﷺ، رزگارکەری مرۆڤ لە بەندایەتیکردنی بەندەکان بۆ بەندایەتی خوا (جل جلاله)، میهرەبانی خوای پەروەردگار برژێ بەسەر ئێوە و هەموو موسڵمانان لەم رۆژە پیرۆزەدا، ئەمرۆ (١٦)ی -رەبیع الاول-ی ساڵی (١٤٢٢) کۆچییە کە دیارە لەو مانگەدا پێغەمبەری پێشەوامان موحەممەد ﷺ هاتۆتە سەر دونیا و لە دایك بووە..

لە دایکبوونی پێغەمبەرﷺ مورژدەیەك بووە بۆ ئادەمیزادەکان، نیعمەتێکی ئیلاهی گەورە بووە!، ئادەمیزادەکان بۆخۆیان نازانن ئەو نیعمەتە چەندە

گەورەیە!!، ئەو ڕێنیشاندەرە!، ئەو ڕزگاركەرە!، ئەو پایە بەرزە!، ئەو خووڕەوشت بەرزە!، ئەو مامۆستایە بۆ ئادەمیزادەكان!، ئەو هیدایەتە بەرزە!، ئەو پێشەوایەی كە بانگمان دەكا بۆ بەهەشت و دوورمان دەخاتەوە لە داو و پیلان و فێڵ و فكر و خەیاڵی شەیتان، ئەو پێغەمبەرە ﷺ فەزڵی زۆرە لەسەر ئێمە، چاكەی زۆرە بەسەر ئێمەوە، ئەو پێغەمبەرە ﷺ نەك هەر لە دونیا دڵسۆزمان بووە بەڵكو لە قیامەتیشدا وەختێ كە ئینسانەكان زیندوو دەبنەوە لەمەیدانی مەحشەر هەموو ئینسانێك لەشوێنی خۆی هاوار دەكا (نَفسِي، نَفسِي): ئەی نەفسی خۆم.. ئەی نەفسی خۆم!! بەڵام پێغەمبەرمان -دروودی خوای لەسەربێ- هاوار دەكاو دەفەرموێ (أُمَتي، أُمَتي): ئەی ئوممەتم ئەی ئوممەتم!!، دڵسۆزی ئەو پێغەمبەرە بۆ ئوممەتەكەی ناتوانین لە وتارێكی جومعەدا عەرزكەین!، دیارە لە سەرتاسەری جیهانی ئیسلامدا وە لە زۆر شوێن بەموناسەبەتی لە دایك بوونی پێغەمبەر ﷺ موناسەبەت و ئاهەنگ و بۆنە ساز دەكرێن، لە ڕاستیدا كۆمەڵێك ((مُلاحظة)) هەن لەسەر ئەو یاد كردنەوانە، كە ئێمە لێرەدا باسیان ناكەین بەڵام هەر ئەوەندە دەڵێین بەڕاستی ((زێدەڕۆیی - إفراط)) و ((بەزایەدان - تَفریط))ی زۆری تێدا دەكرێت، زێدەڕۆیی زۆر تێدا دەكرێ، پێداهەڵگوتنی خەراپ كە پێغەمبەر خۆی بەرییە لەو پێدا هەڵگوتنە، كە زۆری شیركە بەشێوەیەك كە لە ئەنجامی مەدح و پێدا هەڵگوتندا ئەوەندە بەرز دەكرێتەوە هەندێ صیفاتی خوای پەروەردگار دەدرێتە پاڵی!، پێغەمبەر ﷺ ئەوەی پێ ناخۆشە! یان ئەو ڕۆژە بە جەژن تەماشا دەكرێ كە ئەوەش دروست نیە و لە شەریعەتی ئیسلامدا ئێمە دوو جەژنمان هەن: (جەژنی قوربانی پیرۆز) و (جەژنی ڕەمەزانی پیرۆز)، بۆیە مسوڵمانان دەبێ ئەوە بە جەژن نەزانن!، دەكرێ بڵێین لە مانگی مەولوددا ئینسان صەڵەواتی زۆر بنێرێ بۆ ئەو پێغەمبەرە ﷺ، صەڵەواتی زۆر بنرێ بۆ سەرگیانی ئەو زاتە، وە

داکـۆکی و سـووربوونی خـۆی تەئکیـد بکاتـەوە لەسـەر ڕێبازەکـەی، ئـەوە وەفاداریە!، وەفاداری ئەوە نییە کە ئینسان بەزمان شت بڵێ و بـەکردەوەش لـە سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ و زیندووکردنەوەی سوننەتەکانی لابدا، با لەجیاتی ئەوەی کە ئێمە تەنها لەمانگی مەولوددا پێغەمبەرمان لەیاد بێ، بـا هـەموو ساڵمان یادی ئەو پێغەمبەرە بێ ﷺ، دیارە پیاوچاکان و خولـەفای ڕاشیدین و زانایانی پایە بەرزی ئێمە هەر لە ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل[10] و ئیمـامی ئـەبو حەنیفـە[11] و ئیمـامی مالیـك[12] و ئیمـامی شـافیعی[13] و سـوفیانی ثەوری[14] هەموو ئەو پێـشەوایانەی ئێمـە، ڕۆژێکیـان (تَـشخِیص) نـەکردووە بۆیادی پێغەمبەر ﷺ، بۆیە بەرێزان:

---

[10] ناوی (أحمد بن محمد بن حنبل بن هلال بن أسد الشيباني)یە لە ساڵی ١٦٤ کۆچی لە بەغدا لە دایك بووە، پێشەوایەکی بەرز و مەزنی ئیسلامە، خاوەنی چەندین کتێبە بەناوبانگترینیان (المسند)ە، کە نزیکەی چل هەزار دەقی سوننەتی تێدایە، لە ساڵی ٢٤١ کۆچی هەر لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

[11] ناوی (النعمان بن ثابت بن زوطي)یە لە ساڵی ٨٠ ی کۆچی لە کووفە لە دایك بووە و لە ساڵی ١٥٠ی کۆچی لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە، بە (الامام الاعظم) ناوبانگی دەرکردووە، یەکێکە لە پێشەوا گەورە و شەرعزانەکانی ئیسلام.

[12] ناوی (مالك بن أنس بن مالك بن أبي عامر الاصبحي)یە کە بە (إمام دارالهجرة) ناسراوە و لە ساڵی ٩٣ ی کۆچی لە دایك بووە و لە ساڵی ١٧٩ لە مەدینە کۆچی دوایی کردووە، یەکێکە لە زاناو پێشەوا بەرجەستەکانی ئیسلام و خاوەنی کتێبـی ناوداری (الموطأ)ە کە دێرینترین کتێبـی فەرموودە و فیقهە.

[13] ناوی (محمد بن ادريس بن العباس بن عثمان بن شافع ابن السائب بن عبد يزيد بن هاشم بن عبدالمطلب)ە. لە شاری (غزة)ی فەڵەستین لە ساڵی ١٥٠ ی کۆچی هاتۆتە دنیاوە و لە ساڵی ٢٠٤ لە میسر وەفاتی کردووە.

[14] ناوی (سفيان الثوري)یە کە لە ساڵی ٩٧ ی کۆچی لە دایك بووە و لە ١٦١ ی کۆچی لە شاری بەصرا کۆچی دوایی کردووە، نازناوی (أمير المؤمنين في الحديث) بووە.

- ژیانی ئەم کەڵە زانایانە لە کتێبـی (زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن)ی مامۆستا عەلی باپیر، لاپەڕەکانی ١٥١ و ١٥٢ و ١٦٣ و ١٦٧ و ١٧٥ وەرگیراوە.

ئێمە كاتێك كە لە مانگی مەولودی ساڵی (١٤٢٢)ی كۆچی داین خۆشحاڵی خۆمان بۆ لە دایكبوونی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە دەردەبڕین! صەلات و سەلامی بۆ دەنێرین، وە لە هەمانكاتیشدا سووربوونی خۆمان لەسەر رێبازەكەی و هەوڵدانی خۆمان بۆ زیندووكردنەوەی سونەتەكانی تەئكید دەكەینەوە... گوێ بگرن پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ((مَن أحيى سُنَّتي فَقَد أحَبَّنِي))[15]: هەر كەسێك سونەتەكانی من زیندووكاتەوە ئەوە خۆشی دەوێم، كەوابوو خۆشەویستی تۆ بۆ ئەو زاتە دەبێ بەڵگەو دەلیلی هەبێ كە ئەویش زیندووكردنەوەی سونەتەكانیەتی، سونەتی كرداری (فِعلي)، وە سونەتی گوفتاری (قَولي)، وە سونەتی دانپێداهێنان (إقراري)، سونەت هەرسێ نەوعی دەگرێتەوە كە لە پێغەمبەر ﷺ وەرگیراوە، ئێمە لە وتاری ئەمڕۆدا دەمانەوێ بچینە خزمەتی یەك سیفەتی بەرزی ئەو پێغەمبەرە پێشەوایەمان بۆ ئەوەی كە بزانین ئەو چۆن لەو سیفەتەدا نموونەیی بووە و خوای پەروەردگاریش چ داوا لە ئێمە دەكا بۆ ئەوەی ئێمەش شوێن پێی ئەو هەڵگرین؟، دیارە: ﴿مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ﴾ ٨٠- النساء، خوا فەرمووی: هەركەسێ گوێڕایەڵی پێغەمبەر بكات ﷺ، ئەوە گوێڕایەڵی خوای پەروەردگاری كردووە!، جا ئێمە ئەگەر راست دەكەین و دەمانەوێ دڵسۆزی ئەو پێغەمبەرە بین (عليه الصلاة والسلام) با گوێڕایەڵی ئەو بین.. با سوونەتەكانی ئەو زیندوو بكەینەوە، چونكە

---

[15] ((حدثنا مسلم بن حاتم الانصاري، قال: حدثنا محمد بن عبدالله الانصاري، عن أبيه، عن علي بن زيد، عن سعيد بن المسيب، قال: قال أنس بن مالك: قال لي رسول الله (صلي الله عليه وسلم): ((يا بُني إن قَدَرتَ أن تُصبِحَ وَ تُمسِيَ لَيس في قَلبِكَ غِشٌ لاحَدٍ فافعَل)) ثُمَ قالَ لِي:((يا بُني وذالِكَ من سُنتي، وَمَن أحيا سُنَتِي فَقَد أَحَبَنِي وَمَن أَحَبَنِي كانَ مَعِي فِي الجَنَة))، وفي الحديث قصة طويلة، هذا حديث حسن غريب من هذا الوجه وضعفه الالباني.

سنن الترمذي، كتاب العلم عن رسول الله (صلي الله عليه وسلم)، باب: ما جاء في الاخذ بالسُنة واجتناب البدع، صفحة ٦٠٣، رقم الحديث ٢٦٧٨

فەرمووی ((مَن أحيى سُنَّتِي فَقَد أَحَبَنِي وَمَن أَحَبَّنِي كانَ مَعِي فِي الجَنَّة)): هەر كەسێك سوننەتەكانم زیندوو كاتەوە -لە كاتێكدا كە مردووە- ئەوە منی خۆش دەوێت، وە هەر كەسێك منی خۆشبوێت لەگەڵ مندایە لەبەهەشتدا..، جا یارەببی خوایە لەگەڵ ئەو پێغەمبەرە بەرزە لە بەهەشتدا كۆمان بكەیەوە، یارەببی خوایە هاوكاریمان بكەی و تەوفیقمان بدەی بە لوتفی خۆت بۆ ئەوەی سوننەتە پیرۆزەكانی پێغەمبەرمان (علیه الصلاة والسلام) زیندوو بكەینەوە...

بەڕێزان: ئەو سیفەتەی كە دەمانەوێ باسی بكەین لە وتاری ئەمڕۆدا بریتییە لە سیفەتی (یەقین)، یەقین و ئومێدی چاكی ئەو پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام)؛ یەقینی بەرامبەر بە خوا (جل جلاله)، یەقینی بەرامبەر بە ئیسلام، ئومێدی چاكی بەرامبەر بە مسوڵمانان، با ئێمەش تەماشاكەین بۆ ئەوەی كە لە سیفەتی یەقیندا شوێن پێی ئەو هەڵبگرین و بزانین پێغەمبەرمان (علیه الصلاة والسلام) چۆن ئەو یەقینەی بووە؟، دیارە یەقین بەرامبەر بەخوا (سبحانه وتعالى) پێناسەیەكی تایبەت بەخۆی هەیە، یەقین بەرامبەر بە ئیسلام پێناسەی تری هەیە، وە ئومێد و گومانی چاكیش بەرامبەر بە مسوڵمانان پێناسەی تایبەتی خۆی هەیە، بۆیە دەڵێین (یەقین بۆ خوا، پاشان بۆ ئیسلام دوایی ئومید بۆ مسوڵمانان -گومانی چاك بۆ مسوڵمانان- ناڵێین (یەقینمان بەرامبەر بە مسوڵمانان) چونكە ئینسان لە بەرامبەر خودا دەبێ یەقینی هەبی، گومانی نەبێ، چونكە گومانت لە بەرامبەر حەرفێكی قورئان (فەرموودەكانی خوا) هەبێ كافر دەبی!، گومان لە بەرامبەر خوادا نابێ، ئەگەر وشەی (ظَن)یش بەكار هاتووە لە قورئاندا بۆ ئیسلام و بەرامبەر بەخوا (جل جلاله) مەبەستی پێ (یَقین)ە...وە لە بەرامبەر ئیسلامیشدا كە قورئان و فەرموودە پیرۆزەكانی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) بەهەمان شێوە، وە لە شەرح و تەفسیری زانایان لەسەر ئایەت و حەدیسەكان ئەوەش بەهەمان شێوە نابێ بڵێی: (گومانم وایە

كە ئەو قسەیەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) كە حەدیسی صەحیحە راستە)، یان گومانم وایە ئەو ئایەتە یان ئەو (بەند)ەی ئیسلام راستە!، لێرەدا گومانت نابێ هەبێ، بەڵكو دەبێ یەقینت بە هەموو حەرفەكانی ئەو ئیسلامە هەبێ، مادام بەڵگەی صەحیحی لەسەرە كە ئەوە قسەی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) یان تەفسیری ئایەتێكی قورئانە.

بەڵام بۆ مسوڵمانان دەگوترێ گومان، چونكە مسوڵمان دڵەكەی پەیوەستە بە خواوە (جل جلاله) وە خوا پێی ئاگادارە، بەڵام لە دەرەوە و رواڵەتی (ظاهِري) كە بەچاك تەماشا دەكرێ لەلایەن مسوڵمانانەوە پێی دەگوترێ: ((گومانی چاكی پێ دەبرێ - نَحسبه كَذالِك)) وای تەماشا دەكەین پیاوی چاكە، ئیتر خوا دەزانێ چ لەناو دڵ و دەروونیدا هەیە!، خوا عەبدناسە، بۆیە بەرێزان، كە دەڵێین یەقین بەرامبەر بەخوا، با بزانین یەقینی ئەو پێغەمبەرە چۆن بووە؟.

یەقینی ئەو پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) لە خالقیەتی (ربُ العالَمین)، لە رازقیەتی (ربُ العالَمین)، لە مرێنەر و ژیێنەری (ربُ العالَمین)، لە زیانگەیێن (ضَار)و سوودگەیێن (نافِع) و بەخشەر (مُعطِي) و پێشگر (مانِع)یەتی (ربُ العالَمین)دا سابت بووە، كە دەڵێین خوا خالیقی بوونەوەرە، واتە هیچ كەسێك هەرچەند زانابێت و دەستەڵاتداربێ، وە لە مەسائیلی پزیشكی(طبْ) لەوپەڕی پێشكەوتن دابێ، دەیان ملیۆن ساڵی تریش (طبْ) بەرەو پێش بچێ ناتوانێ یەك خانە (خَلیة)ی زیندووی بوونەوەر دروست بكات!! جا نەك هەر خانە (خَلیة)ی ئینسان، بەڵكو (خَلیة)ی گچكۆكەش كە بەچاو نابینرێت، ناتوانێ لە (حَیوانات)یش دروستی بكات!، خەڵق عایدی خوایە و دەگەڕێتەوە بۆ خوا، چونكە خوا بڕیویەتییەوە لە قورئان بە فەرموودەی ﴿أَلا لَهُ الْخَلْقُ وَالامْرُ تَبارَكَ اللّهُ رَبُّ الْعَالَمِینَ﴾ ٥٤- الاعراف، دروستكردنی مەخلوقات و زیندەوەر و بوونەوەر دەستەڵاتی خوایە (جل جلاله)، وەكو لە وتارێكی رابردووشدا باسمان كرد.

لە وەڵامی پرسیارێکدا ((کە کاتێك ئافرەتێك منداڵی نابێت دوای ئەوەی هەوڵ و تەقەلای زۆر دەداو خۆی بەچوونە لای دکتۆر ماندوو دەکا))، گوتمان کە خوا نەیداتێ بەکەس ئەو منداڵە نادرێ!، ناڵێین با عیلاجی نەخۆشی خۆی نەکات و ئەگەر (عیلاج)ی هەبوو نەچێتە دکتۆر چونکە (مَا أَنْزَلَ اللَّهُ دَاءً إلا أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً)[١٦]، بەڵام ئەگەر خوا نەیداتێ هەموو کەون کۆببێتەوە ناتوانێ منداڵی بداتێ!!، بەڵێ خۆشەویستەکانم.. دروستکردن (خَلق) بەدەست خوایە، رزق بەدەست خوایە: ﴿وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الارضِ اِلا عَلى اللهِ رزقُها﴾ ٦- هود، هەموو زیندەوەرێك رزقی لەسەر خوایە!، رزقی بەدەست تۆ نیە!، ﴿نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ﴾ ١٥١- الانعام، خوا ئەفەرموێ: رزقی ئێوە و ماڵ و منداڵی ئێوەش بەدەست ئێمەیە، ﴿إِنَّ اللَّهَ هوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾ ٥٨- الذاريات، هەر خوا خۆی رزقدەر (رزّاق)ە، کەسی تر رزقدەر نییە خوا نەبێ.

یەقینت وابێ وەك پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لەگەڵ موراعات کردنی هۆکارەکان(الأسباب) بەپلەی یەکەم حیسابی بۆ نیمکانیاتی ماددی نەکردووە!، نە لە (مەککە) نە لە (مەدینە)ش، بەڵکو خوا رزقدەرە و رزقی دەداتێ!، ئینسان بۆ خوای گەورە بگونجێ خوای گەورە بۆی دێتە پێش و هاوکاری دەکا، بۆیە بەرێزان: مسوڵمان لە زەرەر و قازانجدا دەبێت وابێ و یەقینی وابێ بەدەست خوایە، زەرەری تۆ و قازانجی تۆ، لە وتارێکدا باسی قەزا و قەدەرمان

---

[١٦] ((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ دَاءً إلا أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً))، صحيح بخاري، جزء ٤،كتاب الطب، باب: ما أنزل الله داءاً الا أنزل له شفاء، صفحة ٢٠٢١، رقم الحديث ٥٣٥٤، وأطراف الحديث في البخاري ((١٩٤٦))....
((عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ قَالَ أَتَيْتُ النَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابُهُ كَأَنَّمَا عَلَى رُءُوسِهِمْ الطَّيْرُ فَسَلَّمْتُ ثُمَّ قَعَدْتُ فَجَاءَ الاعْرَابُ مِنْ هَا هُنَا وَهَا هُنَا فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَتَدَاوَى فَقَالَ تَدَاوَوْا فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمْ يَضَعْ دَاءً إلا وَضَعَ لَهُ دَوَاءً غَيْرَ دَاءٍ وَاحِدٍ الْهَرَمُ))، سنن أبي داود، كتاب الطب، باب في الرجل يتداوى، صفحة ٥٨٠، رقم الحديث ٣٨٥٥، وصححه الالباني.

کرد و گوتمان: ((هەرچی لە کەون روو ئەدات قەزا و قەدەری خوایە))، هەر زەرەرێکت بۆ بێتە پێش، لە موعامەلەدا قازانج دەکەی قەدەری خوایە، زەرەرت کرد قەدەری خوایە، دەبێ یەقینت وابێ قەدەری خوایە و دەستەڵاتی تۆی تێدا نییە!.. بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ، ئەگەر خوای گەورە بەڵایەکت بەسەر بێنێ تەنها خۆی ئەتوانێ ئەو بەڵایەت لەسەر لابدات! ئەگەر خوا لەسەرت لانەدات کەسێك ناتوانێ!: ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ اللّهُ بِضُرٍّ فَلا كَاشِفَ لَهُ إِلا هوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلا رَآدَّ لِفَضْلِهِ يُصَيبُ بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ﴾ ١٠٧- يونس: ئەگەر خوای پەروەردگاریش چاکەیەکت لەگەڵ بکات بەکەس مەنع ناکرێ، وەکو پێغەمبەریشمان دوعای کردو فەرمووی ((لامَانِعَ لِمَا أَعطَيتَ وَلامعطِي لِمَا مَنَعتَ وَلا رَادَّ لِما قَضَيت))، فەرمووی: خوایە ئەوەی کە تۆ نەیبەخشی بەکەس نابەخشرێ، وە ئەوەی کە تۆ بیبەخشی بەکەس مەنع ناکرێ، وە ئەوەی کە تۆ بڕیاری لەسەر بدەی بەکەس رەت ناکرێتەوە!.

دەبێ یەقینت وابێ هەروەك چۆن پێغەمبەرەکەت (علیه الصلاة والسلام) ئاوا یەقینی بووە لە بواری عەقیدەدا (توحید الربوبیة، توحید الالوهیة، توحید اسماء والصفات)[١٧]، پێت وابێ هەر خوای پەروەردگار خاوەنی دەستەڵاتە، خاوەنی دروستکردنە، وە ئینسان بە پێی دەستەڵاتی خۆی کە ئەو تەکلیفەی خراوەتە سەر شانی تیایدا کاری خۆی هەڵدەبژێری چاکە یان خەراپە، بەرێزان: پێغەمبەرمان (علیه الصلاة والسلام) لەڕووی عەقیدەوە یەقینی وا بووە کە وەعدی خوا بەجێیە، کاتێك کە زەعیف بووە[١٨] لە مەککە تەنها خۆی و خێزانی (خدیجة)، دوایی عەلی کوڕی ئەبو تالیب کە منداڵ بووە، دوایی ئەبووبەکری صدیق، یەکەم پیاو کە لەگەڵیدا بووە ئەبوو بەکری صدیق بووە، ئافرەتێك کە

[١٧] بڕوانە کتێبی ((مهذب شرح العقیدة الطحاویة))، لاپەڕە ٢٩ و ٣٠.
[١٨] لەڕووی مادی و هێزەوە... ئەگەرنا خاوەنی بڕوایەکی پۆڵایین بووە..!

لەگەڵی دابووە خەدیجەی خێزانی بووە، هەموویان خۆیشی لەگەڵدابێ چوار كەس بوون!.. لە چوار كەسانەوە دەستی پێكردووە ئەو شۆڕشە!!... ئەو خەباتەی دەست پێ كردووە یەقینی وابووە كە خوای پەروەردگار سەری دەخات، یەقینی وابووە كە خوای گەورە وەعدی خۆی بەجێ دەگەیەنێ، هەر لە مەككەدا ئەو ئایەتە هاتەخواردەوە: ﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ﴾ ٤٥- القمر، یانی: كۆمەڵە زۆرەكە رادەكەن و پشتتان تێ دەكەن، هەڵدێن و فیرار دەكەن لەبەر دەستتان!، ئیمامی عومەر دەفەرموێ ((زۆر لە تەفسیری ئەو ئایەتە تێنەدەگەیشتم هەتا جەنگی بەدر روویدا.. كە جەنگی بەدر روویدا وەختێ كە كافرەكان هەڵاتن و پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) مستێ خۆڵی دەستداێ و فەرمووی: (شاهَتِ الوجوه) ئاوا پرژاندی بەلای كافرەكانەوە، ئەفەرموێ ئەوجار حاڵی بووم و تەفسیری ئەو ئایەتە لە جەنگی بەدردا تێگەیشتم))، خوای گەورە وەعدی پێ داوە كە دەبێ سەركەوێ! كە دەبێ ئەو جەمعە رابكات لەبەردەستی مسوڵمانان، بۆیە پشتیوانی بە خوای پەروەردگار زۆر قایم بووە لەگەڵ ئەو هەموو ئازار و ئەشكەنجەی كە داویانە، یەقینی وا بوو كە رۆژێك دێت قۆناغی دووەم دەست پێ دەكات كە قۆناغی سەركەوتنە.

بەڵێ بەڕێزان: خوای گەورە نەك هەر وەعدی بە پێغەمبەر داوە (علیه الصلاة والسلام) وەعدی بە ئیماندارانیش داوە! ئەفەرموێ ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ ٥٥- النور: خوا وەعدی بە ئیمانداران داوە لە ئێوە، ئەوانەی كە كردەوەی چاك دەكەن ﴿لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾: بیانكات بە خەلیفە و دەستەڵاتدار لەسەر رووی زەوی، ﴿وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ﴾ ٥٥- النور: خوای گەورە وەعدی پێداون ئەو دینەیان بۆ بكا بە فەرمانڕەوا (حاكم)، ئەو دینەی كە پێی رازی بووە بۆ ئەوان و بێجگە لەو دینە بە دینی تر رازی نەبووە، ﴿وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا

﴿يَعْبُدُونَنِي لا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ ٥٥- النـــور، وە خوای گەورە ترسیان بۆ دەگۆڕێ بە ئەمن و ئاسـایش، بەمـەرجێ بم پەرستن و شەریکم بۆ بڕیار نەدەن.

ئەو ئایەتە بەڕاستی وتـارێکی تایبـەت هەڵـدەگرێ!، بـەکورتی دەڵـێم چـەند شتێکی زۆر گرنگی تێدایە:

یەکەمجار دەفەرموێ (( (وَعَـدَ اللّهُ) وەعدی داوە خوای گـەورە))، خـوا وەعـدی داوە بەکێ؟، بە هەموو کەسی وەعد داوە؟، بە هـەموو کەسـێك کـە بـەزوبان دەڵێ: مسوڵمانم: وەعدی داوە! وەعدی سەرکەوتنی دونیا و قیامەتی پێ داوە؟ وەعدی پێ داوە کە بیکا بە خەلیفە؟ دینی لەسەر دەستی ئ و زیندوو بکاتەوە؟ نەخێر زۆر جێگای دیقەت و تێفیکرینە، خوای پـەروەردگار دەفـەرموێ ﴿وَعَـدَ اللَّهُ﴾ کێ؟ ﴿الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ﴾: ئەوانـەی کـە لـەئێوە ئیمـانی راسـتەقینەیان هەیە، ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِـنكُمْ وَعَمِلُـوا الـصَّالِحَاتِ﴾ ئیمـان و عەمـەلی صالح لای خوای پەروەردگار پەسندە، خوا وەعد بەو کەسانە نادات کە تەنها بە زمانێ ئیمانیان هەیە و بەکردەوە نەیان سەلماندوە، بۆیە خـوای گـەورە وەعـدی داوە بە کەسانێك کە لەگەڵ ئیمانـدا کـردەوەی چـاك ئـەنجام دەدەن، کـردەوەی چاکیش پابەندییە بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، کـەوابوو هەیە ئیمانی هەیە بەڵام کردەوەی چاك ناکات یان کەمتەرخـەمی لێ دەکـا... یان خۆی بە ئیسلامدا هەڵواسیوە: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَـى حَـرْفٍ فَـإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انقَلَبَ عَلَى وَجْهِـهِ خَـسِرَ الـدُّنْيَا وَالآخِـرَةَ ذَلِكَ هوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ﴾ ١١- الحج، ئەگەر خێرێکی بۆ هـات دڵـی گوشـاد دەبێ، خۆ ئەگەر توشی بەڵاو موصیبەتیش بوو هەر هـاوار دەکـا و دەیکـا بـە قوڕپێوان و دوعـای دوور و درێژ، خوا ئەفەرموێ (ئەو ئینـسانە خەسـارەتمەندی دونیا و قیامەتە)، وەکو مەسەلەیەکی کوردی هەیە دەڵێ: ((لە عیسا بـوو، لـە

موسـاش بـووا))، گـرنگ ئەوەیـە ئـەو ئینـسانە ئەگـەر خـۆی بـە ئیـسلامدا هەڵواسیوە، لە کەناری ئیسلام رابوەستیٚ خوا لیٚی قبوڵ ناکا، خـوا دەفـەرمویٚ بچنە ناو نیٚوەڕۆکی ئیسلام: ﴿يَا أَيُّهَا الَّـذِينَ آمَنُـواْ ادْخُلُـواْ فِـي الـسِّلْمِ كَآفَّـةً﴾ ٢٠٨- البقرة، واتە: ئەی ئیماندارینە بڕۆنە ناو نیٚوەڕۆکی ئیسلامەوە.

بەڵیٚ بەڕیٚزان..

خوا وەعدی داوە بە ئیمانداران، ئەوانەی ئیمانیان هەیە و کردەوەی چاکیش دەکەن:

١) ﴿لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الارْضِ﴾: بیانکا بە دەستەڵاتدار و خەلیفە لە زەویدا.

٢) ﴿وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ﴾: ئەو دینەیان -کە خوا پیٚی رازییە و پیٚی خۆشە و بۆی ناردوون- بۆیان بکات بە فەرمانڕەوا (حاکم).

٣) ﴿وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا﴾: بە تەئکید ئەو ترس و لەرزەی کـە لەسەریان بووە لەکاتی زەعیفیاندا بۆیان دەگۆڕیٚ بە ئەمن و ئاسـایش خۆشگوزەرانی.

ئەو سیٚ نیعمەتە زۆر گەورەن کە دیارە هەرسیٚکیان تەواوکەری یەکن، ئـەمن و ئاسایش لەژیٚر سایەی دینی خوادا نـەبیٚ سـەرناگریٚ، چـونکە ئەگـەر خـەڵك چاودیٚری (رقابة)یەکی ئیلاهی نەبیٚ، (رقابة)یـەکی قیامـەتی لەسـەر نـەبیٚ لـە گوناهان ناگەڕیٚتەوە و گوناه دەکات، ئەگەر لە ترسی ئەوە گوناه نـەکا چـونکە مەسئولەکەی لیٚ دیارە، پاش ئەوەی کە مەسئولەکەی رۆیشت گونـاه دەکـات! بـرا گەورەکـەی یـان رەئـیس عەشـیرەتەکەی لیٚ دیـارە، کویٚخـا و موختـاری دیٚیەکەی لیٚ دیارە وەختیٚ کە لیٚیان ئاودیو بوو گوناهەکەی دەکـات، خیانـەت لە خۆی دەکات، خیانەت لە ماڵ و منداڵی خۆی دەکات، خیانـەت لـە وڵات و نیشتمان و گەل و عەشیرەتی خۆی دەکات، بەڵام ئەگەر رەقابەیـەکی ئیلاهـی و

ترسێكی قیامەتی هەبێ، وە بزانێ كە خوا لێی دەپێچێتەوە، ئەوا لەبەر خاتری قیامەتی خۆی نایكا!!.

بۆیە بەڕێزان: بەمەرجێك خوای پەروەردگار (جل شأنه) ئەو وەعدەی بەو ئیماندارانە داوە، (يَعْبُدُونَنِي لا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا) خوا فەرموی: بم پەرستن و شەریكم بۆ بڕیار نەدەن، پەرستنی خوا یانی پابەندبوون بە قورئانی پیرۆز، ئەو قورئانەی كە خوا ئەفەرموێ: ﴿كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ ١- إبراهيم، بەڵێ خۆشەویستەكانم یەقینی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) بەرامبەر بە خوا ئاوا بووە!، كە خوای گەورە سەری دەخا رۆژێك دێ (تَمكين)ی دینەكەی بۆ دەكا لە زەویدا، رۆژێك دێت دوای ترس و لەرزی مەككە ولاتێكی پێشكەش دەكا كە (مەدینە)یە، ﴿وَاذْكُرُواْ إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِي الارْضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ ٢٦- الانفال، وەكو فەرمووی: وەبیرخۆتان بێننەوە كاتێك ئێوە زەعیفبوون لە زەویدا، دەترسان لە خەڵك كە بتانڕفێنن، بەڵام داڵدەی دان لە مەدینەو، سەری خستن لەلای خۆی چونكە سەركەوتن تەنها لەلای خواوەیە! ﴿وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ﴾: رزق و رۆزیشی بۆ ناردن، بەڕاستی ئەو سێ نیعمەتە نیعمەتی زۆر گەورەن:

**یەكەم:** شوێنت هەبێ...، **دووەم:** سەركەوتوو بیت و ژێركەوتوو نەبیت، چەوساوە نەبی..، وە **سێیەمینیش:** رزق و رۆزی و ئەمن و ئاسایشت هەبێ.

بەڵێ خۆشەویستەکانم، یەقینی ئەو پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) بەرامبەر بە ئیسلام:

ئەو پێغەمبەرە پێی وانەبوو کە ئەو ئیسلامە ناتوانێ کۆمەڵگەی ئادەمیزاد بخاتە باشترین و چاکترین ژیان، نەخێر، بەڵکو یەقینی وا بوو کە ئەو ئیسلامە بەختەوەری بۆ ئادەمیزادەکان دێنێ! خوای گەورە لە قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا﴾ ٩ – الاسراء: ئەو قورئانە هیدایەتی ئینسان دەدات بۆ باشترین ژیان و رێگا و باشترین کۆمەڵگا دروست دەکات، ئایەتی خوایە (جل جلاله) پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) یەقینی بەو ئایەتە هەبوو.

کە ئەو ئایەتە ئەتوانێ کۆمەڵگەیەکی دەستپاکی داوێن پاکی زمان پاکی چوست و چالاکی پڕ لە ئەمن و ئاسایشی خۆشگوزەران دروست بکات!!، بەڵێ پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) یەقینی وابوو کە ئەو ئیسلامە مایەی عیززەتە، ئینسان لەژێر سێبەری ئەو ئیسلامەدا عەزیزە، چونکە خوا فەرمووی: ﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ ٨– المنافقون، واتە: عیززەت بۆ خوایە، دوای ئەو عیززەت بۆ پێغەمبەری خوایە (علیه الصلاة والسلام) پاشانیش عیززەت بۆ ئیماندارانە، کەوا بوو خوایەکی ئاوا دەستەڵاتدار و کاربەجێ، وەختێ کە موسڵمانان دەهێنێتە ریزی عیززەتەکەی خۆی (لە باسکردندا) و باسیان دەکا، بەڕاستی نیشانەی ئەوەیە:

١) موسڵمانان لای خوا زۆر بەڕێزن.

٢) دەبێ موسڵمانان عەزیزبن و زەلیل نەبن، چونکە خوا فەرمووی (جل جلاله) نابێ نە زوڵم بکەن، نەقەبوڵیش بکەن زوڵمتان لێ بکرێ، ﴿لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ﴾ ٢٧٩– البقرة: نابێ زوڵم بکەن و نابێ زوڵمیشتان لێ بکرێ! ئەو ئایەتە دەبوایە لە هەموو رێکخراو (مُنظَّمَة)یەکی مافی مرۆڤ و لە هەموو شوێنێك کە مافی ئینسانیەت داوا دەکا بنوسرێتەوە.

کەوابوو ئیسلام پڕ لە عەدالەتە، بەر لەوەی کە ئێمە ئەو ئایەتەمان پێ بگات، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) یەقینی تەواوی پێ بووە و پەیڕەو (تَطبیق)ی کردووە! بۆیە پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ کە هاتە مەدینە ئەو پەڕی برایەتی و خۆشەویستی و عەدالەتی دروست کرد لەناو ئەهلی مەدینەدا، برایەتی دروست کرد لە نێوان هەر (مُهاجر)ێك و هەر (أنصار)ێك، هەر موهاجیرێکی کردە برا لەگەڵ ئەنصاریەك، هەریەکەی یەکێکی لەگەڵ ناردەوە بۆ ماڵەوە، هەتا دەڵێن عەلی کوڕی ئەبی تالیب مایەوە و کەس نەما لەگەڵ خۆی بەرێتەوە، ئیمامی عەلی فەرموی: (یا رسول الله) من ماوم و کەس نەبوو لەگەڵی بچمەوە ماڵێ، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (أنتَ أخِي فِي الدُّنیا وَالاخِرة)[19] تۆ برای منی لە دونیا و لە قیامەتدا.

خۆشەویستەکانم: پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) یەقینی تەواوی هەبووە کە ئەو ئیسلامە ئەتوانێ دادگەری بێنێتە وڵات، ئەو ئیسلامە ئەتوانێ کۆمەڵگەی ئادەمیزاد پڕ لە ئەمن و ئاسایش و رزق و رۆزی و خۆشی و خۆشبەختی و خۆش گوزەرانی بکات! بۆیە لە مەدینەدا سەلماندی و ئیسپاتی کرد کە ئەو ئیسلامە پڕ لە عیززەتە!

خۆشەویستەکانم: بەڵێ ئەو پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) یەقینی وا بوو کە بۆ خۆی تەنازول لەو دینە ناکات چونکە ئەو دینە زۆر گەورەیە!، بەئاشکرا کافرەکانی قورەیش هاتن داوایان کرد و گوتیان ئەگەر دینەکەی تۆ راستە ئێمە

---

[19] «آخَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ أَصْحَابِهِ فَجَاءَ عَلِيٌّ تَدْمَعُ عَيْنَاهُ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ آخَيْتَ بَيْنَ أَصْحَابِكَ وَلَمْ تُوَاخِ بَيْنِي وَبَيْنَ أَحَدٍ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْتَ أَخِي فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ قَالَ أَبُو عِيسَى هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَفِي الْبَاب عَنْ زَيْدِ بْنِ أَبِي أَوْفَى» سنن الترمذي، كتاب الدعوات، باب: في مناقب علي بن أبي طالب، صفحة ٨٤٣، رقم الحديث ٣٧٢٠، قال الترمذي حديث حسن غريب وقال الالباني ضعيف.

ئیتیفاقێك دەكەین پاش ساڵێك، ئەگەر دینەكەی تۆ راست بوو ئێمەش دێینە سەر دینەكەی تۆ، ئەگەر دینەكەی ئێمەش راست بوو ئەوە تۆ وەرە سەر دینەكەی ئێمە، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەصەراحەت، بێ پێچ و پەناو بێ پەردە تەنازولی لە عەقیدەی خۆی نەكرد، خوای پەروەردگار ئایەتی بۆ ناردە خوارەوە كە بڵێ: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ ١- الكافرون، ئەی بێ باوەڕان ﴿لا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ﴾ ٢- الكافرون، ناپەرستم ئەوەی كە ئێوە دەیپەرستن! ﴿وَلا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ﴾ ٥- الكافرون، وە ئێوەش ئەوە ناپەرستن كە من دەیپەرستم كە ﴿اللَّهُ﴾یە، چونكە من نەباوەڕم بەئێوە هەیە، وە نەباوەڕم بە دینەكەی ئێوە هەیە، نەئێوەش باوەڕتان بەدین و پەروەردگاری من هەیە، لە كۆتایی ئایەتەكەدا دوای دووجار تەئكید، فەرمووی: ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ ٦- الكافرون، دینی خۆتان بۆ خۆتان و دینی خۆمیش بۆ خۆم!. پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە مەككە كە بانگەوازی كرد نەچوو بت و سەنەمەكان بشكێنێ! زوڵمی نەكردووە لە قوڕەیشییەكان هەتا حوجەتیان بۆ دروست بێ بۆ ئەوەی وەدەری بنێن بەڵكو هەر ئەوەندەی گوتبوو رێگام بدەن بادینی خوا بڵاوبكەمەوە!﴿قُولُو لا الهَ الا اللهُ تُفلِحُوا﴾[20]: دەفەرموێ: بڵێن (لااله الا الله)، سەركەوتوو دەبن!.

خۆشەویستەكانم: قوڕەیشیەكان باوكی ئیمامی علی (كە ئەبوتالیب بوو) ناردیان بۆ لای پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، گوتیان ئەگەر ماڵی دەوێ دەیدەینێ، خەزێنەكانی خۆمانی تەسلیم دەكەین، كلیلی دەرگای كەعبەی

[20] ((عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ عَبَّادٍ الدِّيلِيِّ وَكَانَ جَاهِلِيًّا أَسْلَمَ فَقَالَ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَصر عَيْنِي بِسُوقِ ذِي الْمَجَازِ يَقُولُ يَا أَيُّهَا النَّاسُ قُولُوا لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ تُفْلِحُوا وَيَدْخُلُ فِي فِجَاجِهَا وَالنَّاسُ مُتَقَصِّفُونَ عَلَيْهِ فَمَا رَأَيْتُ أَحَدًا يَقُولُ شَيْئًا وَهُوَ لا يَسْكُتُ يَقُولُ أَيُّهَا النَّاسُ قُولُوا لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ تُفْلِحُوا)) مسند امام أحمد (بطبعة دار أحياء التراث العربي)، رقم الحديث ١٥٧١٦

تەسلیم دەكەین! ئەگەر باشترین ئافرەتی دەوێ لە قەبیلەكانی عەرەب بۆی دەخوازین! ئەگەر دەسەڵاتی دەوێ دەیدەینێ! سەروەت و سامانی دەوێ دەیدەینێ، بەڵام با واز بهێنێ!!، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەوە وەڵامی دانەوە فەرمووی: (واللهِ يا عَم لو وضعت الشَّمس في يميني وَالقَمَر في يساري مَا تَركتُ هذا الامر حَتَّى يظهره الله تعالى أو أهلك في طَلَبه)[٢١] فەرمووی: وەڵڵاهی ئەی مامە ئەگەر ئەو ڕۆژەی كە بە ئاسمانەوەیە! بۆم لەسەر دەستی ڕاست دابنێن، ئەوەندە دەسەڵاتدار و دەوڵەمەندم بكەن! مانگیشم لەسەر دەستی چەپ دابنێن! لەسەر ئەوەی كە واز لەو دینە بهێنم، واز لەو فەرمانە خواییە بهێنم، وازی لێ ناهێنم هەتا یان خوای پەروەردگار سەرم دەخا یان لە پێناویدا دەڕۆم!!، دەبێ ئینسانی مسوڵمانیش ئاوابێ!،

ئەوە یەقینی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) بەرامبەر بەو ئیسلامە! ئاوا لە پێناویدا خۆی بەخت كردووە! ئاوا یەقینی بە سەركەوتنی لای خوای پەروەردگار هەبووە بۆ ئەو دینە!..

یەقینی وا بووە كە ئەو ئیسلامە نوورە! ﴿جَعَلْنَاهُ نُوراً نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا﴾ ٥٢- الشورى، خوا ئەفەرموێ: ئەو ئیسلامە نوورە! هیدایەت دەدەین كەسانێك حەزی پێ ئەكەین و پێمان خۆشە، هیدایەتی كەسانێك ئەدەین و ڕێنموونیان دەكەین، كە بەنیەتی خۆیان بەرەو خوا دەگونجێن، خوا هاوكاریان

---

[٢١] ((عن يعقوب بن عتبة بن المغيرة بن الاخنس، أنه حدث أن قريشا حين قالت لابي طالب هذه المقالة بعث إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال له: يا ابن أخي، إن قومك قد جاءوني فقالوا كذا وكذا فأبق علي وعلى نفسك، ولا تحملني من الامر ما لا أطيق أنا ولا أنت، فاكفف عن قومك ما يكرهون من قولك، فظن رسول الله صلى الله عليه وسلم أن قد بدا لعمه فيه، وأنه خاذله ومسلمه وضعف عن القيام معه، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((يا عم لو وضعت الشمس في يميني والقمر في يساري ما تركت هذا الامر حتى يظهره الله تعالى أو أهلك في طلبه)) دلائل النبوة للبيهقي، جزء ٢، صفحة ١٨٧.

دەکات چونکە ئەگەر ئینسان بەرۆیشتن بۆ لای خوا بڕوا، ئەوە خوا بە (هَرولَة) بۆلای دەچێ! ئەگەر ئینسان بە مەتر بێ خوا زیاتر بۆی دێتە پێش! خوا بەرەحمە بەرامبەر بە ئادەمیزادەکان وەك لە حەدیسێکدا هاتووە کە لە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ریوایەتکراوە[٢٢]

بەڵێ خۆشەویستەکانم: ئەو ئیسلامە هیدایەت و ئامۆژگارییە، ﴿هَـذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ﴾ ١٣٨- ال عمران، ئەو ئیسلامە شیفایە، ﴿قُلْ هوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاء﴾ ٤٤- فصلت، خوا ئەفەرموێ، ئەی موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) بڵێ: ئەو قورئانە بۆ ئیمانداران (هدًى وَشِفَاء): هیدایەت و شیفایە، شیفایە بۆ کۆمەڵگەی ئادەمیزاد.. جا ئەگەر کەسانێك بڵێن: قورئان شیفا نیە و چارەسەری کێشە و نارەحەتییەکانی کۆمەڵگەی ئینسانی پێ ناکرێ، بەڕاستی ئەو ئینسانە وێڕای ئەوەی کە کافرە، ئەوە بەڕاستی زۆر ناحاڵییە، خۆ مێژوو (تأريخ)ی ئیسلام شاهیدە کە پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) خۆی و پیاوێکی ریش سپی کە ئەبوو بەکرە و ئافرەتێك کە خەدیجەیە و منداڵێك کە عەلی کوڕی ئەبی تالیبە وردە وردە زیادیان کرد، چونکە یەکێك لە نیشانەکانی کۆمەڵگەی سەرکەوتوو ئەوەیە وردە وردە گەشە بکاو بەرە و زێدەبوون بڕوات!، هەر کۆمەڵێك وردە وردە بەرەو پوکانەوە بڕوا خەلەلی لە خۆیدا هەیە!، بۆیە ئەبو سوفیان کاتێك کەچوو بۆ لای هیرەقل، هیرەقل بە ئەبو سوفیانی گوت سەبارەت بە موحەممەد و ئەصحاب (علیه الصلاة والسلام) (أَيَزِيدُونَ أم يَنقُصُونَ): ئەرێ زیاد دەکەن یان کەم دەکەن؟، (قَالَ بَل

[٢٢] فەرموودەی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام ((يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي وَأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِه ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلا ذَكَرْتُهُ فِي مَلا خَيْرٍ مِنْهُمْ وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ بِشِبْرٍ تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ بَاعًا وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً)).

يَزِيدُونَ) گوتی: زیاد دەكەن!، ئینجا هیرەقل گوتی: ئەوە نیشانەی كۆمەڵی سەركەوتووە!، بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) باوەڕی بەخۆی هەبوو كە ئەوە دینی خوایە و، وە سەردەكەوێت، خاڵی سێیەم و كۆتایی.. گومانی چاك بە ئیمانداران.

بۆیە گوتمان ((گومانی چاك)) چونكە ئینسان كە هەڵسوكەوت لەگەڵ ئیمانداران دەكا! دڵ و دەروون عایدی خوایە، دەبێ یەقینت بەرامبەر خوا هەبێ، یەقینت بەرامبەر بە ئیسلام هەبێ، یەقینت بەرامبەر پێغەمبەرەكەت هەبێ (علیه الصلاة والسلام)، بەڵام گومانی چاكت بەرامبەر ئیمانداران هەبێ!، ئەسڵ لە گوماندا گومانی چاكە پیاوێك دەیگەیتێ لە ڕێگادا نایناسی و سەلامی لێ دەكەی، یان ئەو سەلامت لی دەكات نابێ بڵێی لە ترسان سەلامی كرد!، یان لەبەر ئەوەی ناچاربوو ئەو چاكەیەی لەگەڵ كردم، دەبێ ئەسڵ لە كاروباردا گومانی چاك بێ، بیناسێ یان نەیناسێ ئەسڵ بۆ ئیماندار گومانی چاكە بەرامبەر بە ئیماندار، بەڵام گومانی چاك لە بەرامبەر خەڵكی كافردا ناكرێ!، بۆیە خوای پەروەردگار فەرمووی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ لَسْتَ مُؤْمِناً﴾ ٩٤- النساء، كەسێك كە لە ڕێگا سەلامتان لێ دەكات پێی مەڵێن ئیماندارنیت!، مەڵێن لە ترسان بوو!، لەبەر ئەوەی ئێوە دڵتان شەق نەكردووە، بۆیە خوا ئە فەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِّنَ الظَّنِّ﴾ ١٢- الحجرات: ئەی ئیماندارینە خۆتان لە زۆر گومان بپارێزن!، ئەها نافەرموێ: خۆتان لە هەموو گومانێك بپارێزن!!، بەڵكو دەفەرموێ: خۆتان لە زۆربەی گومانەكان بەرامبەر بە ئیمانداران بپارێزن، دەبێ حەفتا عوزر بۆ برای مسوڵمانت بهێنییەوە كاتێك كە شتێكی لێ ئەبینی بەدڵت نیە!، پێت وانەبێ ئەوە خیانەتی لێ كردووی، پێت وانەبێ ئەوە نیازی خەراپەی هەیە! پێت وابێ كە عوزری بۆ بهێنیەوە بەنەوعێك لە نەوعەكان دوای ئەوەی (تَبين) دەكەی، خواش (جل جلالە) دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا

الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَيَّنُوا﴾ ٦- سورة الحجرات، ئەی ئیماندارینە! ئەگەر فاسقێك هاتە لاتان و هەواڵێكی بۆ هێنان راستەوخۆ باوەڕ مەكەن (فَتَبَيَّنُوا): روونی بكەنەوە، كەسێك دێت خەبەرێكت بۆ دێنێ لەلای قەومێك یان لەلای كەسێك یان لەلای كۆمەڵێك خەڵك كە حەساسیەتیان بەرامبەر بەتۆ هەیە، باوەڕی پێ مەكە راستەوخۆ، چونكە ئەسڵ لەلای ئیماندار گومانی چاكە!، دوو صەحابە لە یەكتری عاجز ببوون، یەكێك ویستی كێشەیان لەلا گەورە بكات! چوە لای ئەو وتی: فلانە كەس باست دەكات! هاتەلای ئەوی دیش گوتی: فلانە كەس باست دەكا، هەردووكیان لێیان قەبوڵ نەكرد لەو ئینسانە، یەكیان وتی: (مَه لَم يبلُغ الِخلاف قُلوبَنَا) بێدەنگ بە ئەو خیلافە نەگەیشتۆتە دڵەكانمان.

خیلافی كار و عەمەل و خیلافی زمان و مەجلیس لەگەڵ خیلافی دڵەكان فەرقی هەیە، خیلاف كە گەیشتە دڵان و تێیدا ئینسان برایەتی نەپارێزێت ئەوە خیلافی گەورەیە!، ئەگەر ئیماندارێك لە ئەمریكا بێ و ئیماندارێك لە شەرقی روسیا بێ و ئیماندارێكیش لە جنوبی ئەفریقا بێ مادام بەدڵ پێكەوەن ئەوە بران!، نەك بە پێچەوانەوە خوا نەخواستە ئەسڵ بە لای ئەو (تَشاؤم) بێ و گومانی خەراپ بێ، ئینسان دەبێ (تَفاؤل)ی هەبێ و (تَشاؤم)ی نەبێ! پێغەمبەریش فەرمووی: (إِيَّاكُم وَالظَن فَإنَّ الظَّنّ أكذَب الحَدِيث)[٢٣]: خۆتان لە گومان بپارێزن چونكە گومان درۆیەكی خەراپە!!، وە هەروەها فەرمووی:

[٢٣] ((حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ جَعْفَرِ بْنِ رَبِيعَةَ عَنْ الاعْرَجِ قَالَ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ يَأْثُرُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ وَلا تَجَسَّسُوا وَلا تَحَسَّسُوا وَلا تَبَاغَضُوا وَكُونُوا إِخْوَانًا وَلا يَخْطُبُ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَنْكِحَ أَوْ يَتْرُكَ)) صحيح البخاري، جزء ٣، كتاب النكاح، باب:لايخطب على خطبة أخيه حتى ينكح أو يدع، صفحة ١٨٥٠، رقم الحديث ٤٨٤٩، وأطراف الحديث في البخاري ((٦٣٤٥، ٥٧١٩، ٥٧١٧))، و أخرجه مسلم في البر والصلة، باب تحريم الظن والتجسس والتنافس، رقم ٢٥٦٣

قـسەی مـسولّمانانم بـۆ مەگێرنـەوە کاتێـك کـە زەمێکیـان کـردووم یـان ڕەخنەیەکیان لیّ گرتووم بەنەوعێك کە وابزانن مـن پـێم ناخۆشـە، وە عـەیبی موسڵمانان بۆ من باس مەکـەن: (فَـإِني أُحِـبُ أَنْ أَخْـرُجَ إِلى النَّـاسِ و أناسليمُ الصَّدرِ): پێمخۆشە من بچمە ناو خەڵك وە (سَليم الصَّدرِ) بم، یانی دڵـم هیـچی تێدا نەبیّ بەرامبەر بە ئیمانداران، بۆیە هەر ئەو ئینسانەش قـازانج دەکـا کـە ڕۆژی قیامەت دەچێتەوە خزمەت خوا بەدڵی سەلیم...

جا برایانی بەڕێز: لە ڕاستیدا دەبیّ دڵ و دەروونمـان پـاك بـیّ بـەر لـەوەی کـە گوفتار و کردارمان ئەنجام بدەین، هـەر قـسەیەك بکـەین دەبـیّ لەبـەر خـاتری خوامان بیّ، وەك لە خوتبەی ڕابردوو باسی (ئیخلاص)مـان کـرد، گوتمـان: دوو مەرج هەن ئەگەر بیکەین خوا لێمان ڕازییە و عیبادەتەکەمان لیّ وەردەگریّ:

١- پابەندبوون بەشەرعی خوا.

٢- تەنیا خوا مەبەستبوون (إخلاص)، جا گومانت چاك بیّ بەرامبەر بـەدایك و باوکت برا گەنجەکەم: دایـك و باوکـت جـاری وا هەیـە لـە مەسـلەحەتی تـۆ نیشێك دەکەن، چاکەیەك دەکەن ئەتۆ پێتوایە کـە ئـەوە بـۆ تۆیـان نیـە و لـە زەرەری تۆیانە!، نەء.. قەت دایك و باوك زەرەری کوڕی خۆیـان نـاویّ! زەرەری کچی خۆیان ناویّ! زەرەری منداڵی خۆیان ناویّ!! مەگەر دایـك و باوکێـك کـە کافربن و مسوڵمان نەبن، پاشان بەرامبەر منداڵەکانت گومانی چاکیان پیّ ببە و مەدحیان بکە، ڕەحمیـان پـیّ بکـە، دەسـتت بەسـەریاندا بهێنـە!، گومـانی خەراپیان پیّ مەبە هەر لە ئێستاوە لێت دڕدۆنگ نەبن باشە، پێغەمبـەر (علیه الصلاة والسلام) بەرزترین نموونەیە بۆ ئێمە کە گومانی چاکی بە ئیمانـدار بـردووە، گومانی چاکی بە منداڵەکانی بردووەو ڕەحمی پێیان کردووە..!!

یەکێك لە کوڕەکانی عەلی کوڕی ئەبی طالـب (یا حەسەن بووە یان حوسـەین) لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی جەماعەتـدا بـوو و ئیمامـەتی دەکـرد

کاتێك کە رۆیشت بۆ سەجدە منداڵەکە چووە سەر ملی و نەهاتە خوارەوە ئەویش ئەزیەتی نەداو زۆر تاخیر بوو لە سەجدە دوایی هەتا بەخۆشی خۆی هاتە خواردوە، پێغەمبەر ﷺ هەڵنەستاوە لە سەجدە، دوایی لێیان پرسی یا (رسول الله) بۆ ئەوەندە تاخیر بووی؟! فەرموی: لەبەر ئەوە بوو کە ئەو منداڵە هاتبووە سەر ملم تا بەخۆشی خۆی نەهاتە خوارەوە نەمویست ئەزیەتی بدەم!!، بەڕێزان، بەڕاستی بەزەیی و رەحم بەرامبەر بەمنداڵ، ئومێدی چاك بەرامبەر بەمنداڵ دەبێ لەلای دایك و باوکەوە بە واجب تەماشای بکرێ! چۆن لەلای منداڵەوە بە واجب تەماشای رێز و تەقدیریان دەکرێ و خوا دەفەرمووێ: ﴿وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴾ ٢٤- الاسراء، ئەی منداڵە، ئەی کوڕ و کچی باوکان و دایکان بڵێ پەروەردگارا لە دایك و باوکمان خۆشببی و رەحمیان پێبکە هەروەکو چۆن ئێمەیان بە منداڵی گەورە کردووە؟!.. باوك و دایکێك کە چۆن ماندوو دەبن بەمنداڵەوە منداڵێش کە گەورە بوو دەبێ ئاوا بەرەحم و بەزەیی بێ بۆیان.

وە بەهەمان شێوە بەرامبەر خێزانت گومانی چاکت بەرامبەری هەبێ لێی بەدگومان مەبە، گومانی خەراپی پێ مەبە لە کارەکانیدا، وە لە مەجلیس و کۆڕ و موناسەباتیشدا کە پێمانوایە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) گەورەترین نموونەیە کە گومانی چاکی بە خێزانەکانی بردووە، وەکو فەرمووی (خَيْرُكُم خَيْرُكُم لاهلِه وَأنَا خَيْرُكُم لاهلِي)[٢٤] واتە: چاکترینتان ئەو کەسەیە کە لەگەڵ ماڵ

[٢٤] ((عن ابن عباس رضي الله عنهما أن رجالا استأذنوا رسول الله صلى الله عليه وسلم في ضرب النساء، فأذن لهم، فسمع صوتا، فقال: ما هذا؟ فقالوا: أذنت للرجال في ضرب النساء. فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: « خيركم خيركم لاهله، وأنا خيركم لاهله » قال أبو جعفر: ثم أردنا أن نقف على ذلك الضرب أي ضرب هو، فالتمسنا ذلك هل نجد عن رسول الله صلى الله عليه وسلم فيه شيئا؟)) - ابن حبان، جزء ٤، صفحة ١٩٣، رقم الحديث ٤١٠١ و ٤١١٠.
- سنن ابن ماجه (بطبعة دار أحياء التراث العربي)، جزء ١، صفحة ٦٣٨، رقم الحديث ٢٠٣٤.

و خێزانی خۆی چاك بێ، وە منیش چاکترینتانم بۆ ماڵ و خێزانی خۆم! جا بەڕاستی ئەوە چاکەیە ئینسان لەگەڵ خێزانی خۆی چاك بێ نەك خوا نەخواستە بچێتەوە بە مۆن و مۆڕی و بە کرچ و کاڵ و نێوچاوان گرژی کە قسەیەکی خۆشی لەگەڵ ناکا، بەڕاستی زۆر خراپە کاتێك کە دەچێتەوە ماڵی خۆی سەلام لە ماڵ و منداڵی خۆی ناکا خوای گەورە دەفەرموێ ﴿فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتاً فَسَلِّمُوا عَلَى أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الايَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُون﴾ ٦١- النور: دەبێ سەلام بکەن، سەلام لە ماڵی خۆتان بکەن، سەلام لە منداڵەکان بکەن، هەتا ئەگەر کەسیش لە ماڵەوە نەبوو چوویەوە ماڵەوە سەلام بکە!،

بەڕێزان و خۆشەویستان: پاشان ئومێد و گومانی چاکمان بەرامبەر بەقەوم و میللەتی خۆمان: ئێمە نابێ پێمان وابێ میللەتی کورد لە میللەتانی دونیا خەراپترە بۆیە دەبێ لەگەڵیان خەراپ بین!! بەڵکو دەبێ پێمان وابێ کە میللەتی کورد زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانەو زۆری مولتەزیمە بە قورئان و سوننەتەوە و لەگەڵ ئوممەتانی دونیا لەڕووی خزمەت گوزارییەوە بۆ ئیسلام و مسوڵمانان چاك بووە!.

بۆیە بەڕێزان: پێمان وابێ کە دەبێ بە عە طف و بەڕەحم و بەبەزەیی بین لە بەرامبەر میللەتی خۆمان، لە بەرامبەر قەوم و عەشیرەتی خۆمان، نەصیحەتیان بکەین دەستیان بەسەردا بهێنین وە (إن شاء الله) لە رووی عەفوو و دەعوە و بانگەوازەوە بتوانین بە دڵسۆزی خۆمانیان بزانین و ئەوانیش ئێمە بە دڵسۆزی خۆیان بزانن!، بۆیە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) کە فەتحی مەککە دەکاو دەچێتەوە مەککە سەرەڕای ئەوەی ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجەیان داوە! دڕکیان لە پێش پێی ڕۆ کردووە و ریخۆڵەی حوشتریان بەسەردا داوە کاتی خۆی!، بیریان بۆ هەڵکەندووە!، لە شیعەبی ئەبی تالیبدا برسێتی و تینوێتیان

بۆ ناردووە چەند ساڵ!!، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەچێتەوە مەککەو فەتحی دەکات پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ((ئەی قەومەکەم! ئێوە چاوەڕێی چ لە من دەکەن؟! ئەوانیش دەڵێن (أَخٌ كَرِيمٌ وِإبنَ أَخٍ كَرِيم): تۆ برایەکی بەڕێزی و برازایەکی بەڕێزی.. ئەویش دەفەرموێ ((إذهَبُوا فَأَنتُمُ الطُّلَقَاء))[٢٥]: ئەفەرموێ بڕۆن ئێوە ئازاد بن!، جا با ئێمەش ئەو نەرم و نیانیەمان هەبێ بەرامبەر بە خەڵکی خۆمان بەو خەڵکەی کە لە ئیسلام حاڵی نەبووە! بەو خەڵکەی کە ئیسلامی بە غەڵەت وەرگرتووە، لە هەندێکی حاڵی بووە و لە هەندێکی حاڵی نەبووە، یان

---

((عن أبى هريرة رضى الله عنه - فذكر الحديث قال فيه فجاءت الانصار فأحاطوا برسول الله صلى الله عليه وسلم عند الصفا فجاء أبو سفيان فقال يارسول الله ابيدت خضراء قريش لا قريش بعد اليوم فقال من دخل داره فهو آمن ومن القى سلاحه فهو آمن ومن دخل دار أبى سفيان فهو آمن ومن اغلق بابه فهو آمن - اخرجه مسلم في الصحيح من حديث يحيى بن حسان عن حماد الا انه لم يذكر قوله من دخل داره فهو آمن (أخبرنا) أبو على الروذبارى أنبأ أبو بكر بن داسه ثنا أبو داود ثنا مسلم بن ابراهيم ثنا سلام بن مسكين ثنا ثابت البنانى عن عبد الله بن رباح الانصاري عن أبى هريرة رضى الله عنه ان النبي صلى الله عليه وسلم لما دخل مكة سرح الزبير بن العوام وابا عبيدة بن الجراح وخالد بن الوليد على الخيل وقال يا ابا هريرة اهتف بالانصار قال اسلكوا هذا الطريق فلا يشرفن لكم احد الا انمتموه فنادى منادى لا قريش بعد اليوم فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم من دخل دارا فهو آمن ومن القى السلاح فهو آمن وعمد صناديد قريش فدخلوا الكعبة فغص بهم وطاف النبي صلى الله عليه وسلم وصلى خلف المقام ثم أخذ بجنبى الباب فخرجوا فبايعوا النبي صلى الله عليه وسلم على الاسلام - زاد فيه القاسم بن سلام بن مسكين عن ابيه بهذا الاسناد قال ثم أتى الكعبة فأخذ بعضادتى الباب فقال ما تقولون وما تظنون قالوا نقول ابن اخ وابن عم حليم رحيم قال وقالوا ذلك ثلاثا فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم اقول كما قال يوسف (لا تثريب عليكم اليوم يغفر الله لكم وهو ارحم الراحمين) قال فخرجوا كانما نشروا من القبور فدخلوا في الاسلام - (أخبرناه) أبو بكر بن المؤمل أنبأ أبو سعيد الرازي ثنا محمد بن أيوب أنبأ القاسم بن سلام - فذكره (وفيما حكى الشافعي) عن أبى يوسف في هذه القصة انه قال لهم حين اجتمعوا في المسجد ما ترون انى صانع بكم قالوا خيرا، اخ كريم وابن اخ كريم قال اذهبوا فانتم الطلقاء)) سنن الكبرى، جزء ٩، كتاب السير، باب: فتح مكة حرسها الله تعالى، صفحة ١٩٩، رقم الحديث ١٨٢٧٥

باوکمان دایکمان.. خزم و کەسمان جیران و دراوسێمان، پێمانوایە کە دەبێ لەگەڵیاندا چاك بین و دلسۆزی ئەوان بین، با ئێمە دکتۆر بین، نەخۆش جاری وا هەیە شعور بە نەخۆشیەکەی ناکات و لە زەرەری خۆی قسان دەکات!.

لە خوای پەروەردگار داوا دەکەین کە ئەو یەقینەی پێغەمبەر ﷺ بوویەتی بە ئێمەش ببەخشێ، یارەببی خوایە ئەو یەقینەش بە ئێمە ببەخشی، خوایە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر و ئەصحابەکانی رامان بگریت ﷺ یارەببی خوایە سەرەنجامی کار و بارەکانمان خێر بکەی، یارەببی خوایە شیفای نەخۆشیەکانمان بێنی، رەحم بە مردووەکانمان بکەی، گیراوی موسڵمانان بگێڕیەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆیان، هیدایەتی گەنجە سەرلێشێواوەکانمان بدەی، هیدایەتی خۆمان و ماڵ و منداڵمان زیاتر بدەی، خوایە ئەوەی چاکە چاکتری بکەی ئەوەی کە خراپیشە هیدایەتی بدەی (یا أرحَمَ الرَّاحِمین)..

أقول قولي هذا واستغفر الله لي ولكم ولسائر المسلمين فاستغفروه انه كانَ غفاراً أعوذ باالله من الشيطان الرجيم ربنا اتنا من لدنك رحمةً وهيء لنا من امرنا رشدا..

آمین.

# پارێزكاری ( التقوى )

﴿إِنَّ اللّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَواْ وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ﴾ ١٢٨- النحل

# بسم الله الرحمن الرحيم

انَ الحَمدَ لِلهِ نَحمَدُهُ ونَشكُرُهُ وَنَستَغفِرهُ وَنَستَهدِيه، ونعوذ بِاللهِ مِن شُرُورِ أنفُسَنا وَسَيئات اَعمَالِنا، مَن يَهدِهِ اللهُ فَلا مُضِل لَه، وَمن يُضلِل فَلا هادِي لَه..، نَشهَدُ أَن لا الهَ الا اللهُ وَحدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، وَنشهَدُ اَن سيدَنا وَنَبينا مُحمداً عَبدُه وَرَسُولُهُ.. هَذا الرَسُولُ الذِي بَلّغَ الرِسَالةَ وَأدى الامانَةَ وَنَصحَ الامَةَ وَجَاهَدَ فِي اللهِ حَقَ جِهَادِهِ وَتَركَنا عَلى المحجَةِ البَيضاء، لَيلُها كَنَهارِها، لايَزيغُ عَنها الا هَالِك، اللَهُمَ صَلي وَسَلِم وَزِد وَبارِك عَلَى هَذا الرَسُول الكَرِيم وَعَلَى آلِهِ وَأصحَابِه وَالتَابِعينَ وَعَلَى اُمَتِه الى يومِ القِيامَة اجمَعِين... اَمَا بَعدُ أُوصِيكُم عِبادَ اللهِ وَنَفسِي أَولاً بِتَقوَى اللهِ، فانَ اللهَ مَعَ الَذِينَ اتَّقُوا وَالذِينَ هم محسِنُون، قَالَ اللهُ (سبحانه وتعالى) فِي كِتابِهِ الحَكِيمِ بِسمِ اللهِ الرَحمنِ الرَحِيم ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ ١- النساء.

ئیماندارانی بەڕێز: شوێنکەوتوانی پێغەمبەری پێشەوامان حەزرەتی موحەممەد ﷺ، میهرەبانی خوای پەروەردگارمان (جل جلالـه) و سۆز و بەزەیی بڕژێتە سەر هەموو لایەکمان لەم ڕۆژە پیرۆزە و لەم شوێنە پیرۆزە، ئەمڕۆش لە وتارێکی تری ڕۆژی هەینیدا لە خزمەت ئێوەی بەڕێز دەوەستین، وتاری ئەمڕۆمان باسی بابەتێکی گرنگە لە ئیسلامدا کە بریتییە لە کاکڵە و نێوەڕۆکی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، بریتییە لەو بابەتەی کە خوای پەروەردگار (جل جلالـه) پەیوەستی کردوە بەمەرجێك لە مەرجەکانی ڕەزابوونی خۆی لە بەندەکانی، ئەویش بریتییە لە ((تەقوا)).

ته‌قوا ئه‌و كه‌لیمه‌ پیرۆزه‌یه‌ كه‌ له‌ چه‌ندین جێگـا لـه‌ قورئـانی پـیرۆزدا نـاوی هاتووه‌! ته‌قوا وشه‌یه‌كی پیرۆزه‌ كه‌ لـه‌ ده‌یـان حه‌دیـسی پێغه‌مبـه‌ر ﷺ نـاوی هاتووه‌!، ته‌قوا ئه‌و وشه‌یه‌یه‌ كه‌ بۆته‌ مه‌رجێك له‌ ئیمانداراندا بۆ ئـه‌وه‌ی خـوا لێیان رازی بێت..

با بزانین خوای په‌روه‌ردگار (جل جلاله‌) كه‌ له‌ قورئانی پیرۆزدا ده‌فه‌رموێ ﴿وَاعْلَمُـواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ ٣٦- التوبة: خـوا له‌گـه‌ڵ تـه‌قوادارن دایـه‌، ﴿إِنَّ اللّـهَ يُحِـبُّ الْمُتَّقِينَ﴾ ٧- التوبة: خوا تـه‌قوادارانی خـۆش ده‌وێـت، ﴿وَالْعَاقِبَـةُ لِلْمُـتَّقِينَ﴾ ٨٣- القصص: سه‌ره‌نجام بۆ ته‌قواداران‌ه‌، بزانین ته‌قوا یانی چی؟! وه‌ بـزانین به‌رهه‌مـه‌كانی ته‌قوا چین؟! وه‌ بزانین ته‌قوا به‌چی په‌یدا ده‌بێ و به‌چی زیاد ده‌بێ؟!

## خۆشه‌ویسته‌كانم له‌ سێ خاڵاندا ده‌چینه‌ خزمه‌تی ئه‌و بابه‌ته‌ پیرۆزه‌

### خاڵی یه‌كه‌م: پێناسه‌ی ته‌قوا

ته‌قوا یانی چی؟ یه‌كێك به‌ یه‌كێك ده‌ڵێ ((ته‌قوات هه‌بێ))، یه‌كێك به‌ یه‌كێك ده‌ڵێ ((بۆ ته‌قوات نیه‌؟!))، بزانین ته‌قوا یانی چی؟.

به‌ڵێ خۆشه‌ویسته‌كانم: پێناسه‌یه‌كی تایبه‌ت كه‌ له‌لایـه‌ن زانایانـه‌وه‌ بـۆ ئـه‌و وشه‌یه‌ كراوه‌، به‌چه‌ند جۆرێكه‌، راغبی ئه‌صفه‌هانی ده‌ڵێ: (التَّقْوى حِفظُ النَّفسِ عَمَّا يُؤثِم): ته‌قوا یانی پاراستنی نه‌فس وه‌ پاراستنی خۆت له‌و شتانه‌ی كه‌ پێی گوناهبار ده‌بیت) هه‌رشتێك كه‌ پێی گوناهبار ده‌بی خـۆتی لـێ بپـارێزی ئـه‌وه‌ ته‌قوات هه‌یـه‌!، زانایـه‌كی تـر ده‌فـه‌رموێ: تـه‌قوا یـانی (التَّمَسُّك بِالشَّرِيعَة الاسلامِيَّة): ته‌قوا یانی ده‌ستگرتن به‌ شه‌ریعه‌تی ئیسلام، یانی ئـه‌و شـه‌ریعه‌ته‌ بكه‌یته‌ به‌رنامه‌ و په‌یڕه‌وی خۆت له‌ ژیاندا، نـه‌ك خـۆتی پـێ هه‌ڵواسـی، نـه‌ك له‌ناو گیرفانتی دابنێی، به‌ڵكو له‌ناو دڵتی دابنێی و كاری پێبكه‌ی!، ته‌قوا یانی

گوێرایەڵیکردنی خوای پەروەردگار (جل جلالـە) لە شـتێکدا کـە پێـی خۆشـە بـۆ ئەوەی جێبەجێی بکەین، وە لـە شـتێکدا کـە پێـی ناخۆشـە و رقـی لێیـەتی خۆمانی لێ بپارێزین! ئەو وشەیە وشەیەکی گشتییە، ئیمامی عـەلی (خـوا لێـی رازی بێ) پێناسەی تەقوامان بۆ دەکات، دەفەرموێ (التَّقْـوى: الخَـوفُ مِـنَ الجَلِيـل وَالعَمَلُ بِالتَّنـزِيل وَالقَناعَةُ بِالقَلِيل وَالاستِعداد لِيَومِ الرَّحِيل): تەقوا بریتییە لـە چوار شت، یەکەم، ترسان لە خوا (جل جلالـە)، کە لە هیچ کەسێ، وە لەهیچ شتێ بەقەدەر ئەو نەترسی، لە هەموو کەس زیاتر وە لە هەموو شت زیـاتر لـە خـوا بترسی، دووەم، (وَالعَمَلُ بِالتَّنــزِيل): کارکردن بە قورئان، بەو قورئانەی کە خـوا ناردویەتیە خوارەوە، سێهەم: (وَالقَناعَةُ بِالقَلِيل) قەناعەت بەکەمێك لـە مـاڵی دونیا، بەکەم لەو بەخششە خواییەی کە خوا پێت دەدات لە دونیا، هەر شـتێك کە خوا پێی بەخشیویت لەو ناز و نیعمەتانە ئەگەر کەمیش بێ قەناعەتت پێی هەبێ، کە ئەوە دەلیلە لەسەر شوکرانەی عەبد بۆ نیعمەتەکانی خـوا، چـوارەم، (وَالاستِعدادُ لِيَومِ الرَّحِيل) خۆ ئامادەکردن بۆ رۆژی کۆچـکردن لـە دونیـا، خـۆ ئامادەکردن بۆ مردن، کەسێك ئەو چوارەی تێدا هەبوو ئەوە تەقوادارە.

لە (عمری کوڕی خطاب)یان پرسیار کرد (خوا لێی رازی بێ) گوتیان تـەقوا چـیە؟ ئەویش وەڵامی دایەوە و وتی (هَل سَلَكتَ طَرِيقَـاً ذَا شَـوكٍ): ئایـا بەڕێگایەکـدا رۆیشتووی رێگایەکە بە دڕك و دار بووبێ؟، (قالَ نَعم): فـەرمووی بـەڵێ، (قـالَ فَمَا فَعَلتَ): وتی چیت کرد کاتێك ئەو دڕکانەت بینی لەسەر رێگایەکـە هـەن؟ (قَالَ شَمَّرتُ وَاجتَهَدتُ) وەڵامەکەی ئەوە بوو: گوتی خۆم هـەڵکرد، خـۆم گـورج کردو خـۆم پاراسـت لـە دڕکـەکان کـە پێیـان لێنـەنێم، (قَـالَ فَـذالِكَ التَّقْـوى) فەرمووی: ئەوە پێی دەڵێن تەقوا، کەواتە تەقوا یانی خۆپاراسـتن لـەو شـتانەی زەرەرت پێ دەگەیەنێ: هەم زەرەری دونیا هەم زەرەری قیامەت.

## بەرهەمەکانی تەقوا

یەکەم، لە بەرهەمەکانی تەقوا ئەوەیە کە ئینسان لە قورئان حاڵی دەکات، خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ذَلِكَ الْكِتَابُ لا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾ ٢- البقرة: ئەو قورئانە کە گومانی تێدانیە رێنیشاندەرە -بۆ کێ رێنیشاندەرە؟- ﴿لِّلْمُتَّقِينَ﴾: بۆ تەقواداران، یانی ئینسانی تەقوادار لە هەموو کەس زیاتر لە قورئان حاڵی دەبێ! خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی موحەممەد ﷺ باسی ئیسلام بکە، باسی دین بکە چونکە ﴿سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَى﴾ ١٠- الاعلى: ئەوەی کە لە خوا بترسێت بیری لێ دەکاتەوە، زۆرجار بەچاوی خۆتان بینیوتانە و هەستتان پێکردوە لە مەجالیس وەختێك کە باسی ئیسلام دەکرێ، باسی دین دەکرێ، ئەوەی کە مسوڵمانە، ئەوەی کە عەشقی دین و فەرموودە و نەصائیحی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ زۆرباش گوێی خۆی هەڵدەخاو گوێ دەگرێ، بەپێچەوانەشەوە ئەوەی کە رقی لە دینە و رقی لە ئیسلامە، رقی لە مسوڵمانانە، وەختێك کە یەکێك ئامۆژگارییەك دەکات یان وتارێك دەدات، قورئان دەخوێنێت، گوێ ناگرێ و خۆی مەشغوڵ دەکات، خۆی خەریك دەکا بەشتێکەوە کە گوێی لێ نەبێت!، لە مەجالیسی تەعزیە لەوانەیە هەستتان پێکردبێت!، ئەها خوا دەفەرموێ ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ ٢- الانفال: ئیمانداری راستەقینە ئەو کەسانەن کاتێك کە باسی خوا دەکرێ دڵیان تەزووی پێدا دێ!!

﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا﴾: وەختێك کە ئایاتی خوایان بەسەردا بخوێندرێتەوە ئیمانیان پێ زیاد دەبێت، بەڵام بە پێچەوانەوە ﴿وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ﴾ ٤٥- الزمر: ئەوانەی کە باوەڕیان بە دوارۆژ نیە، باوەڕیان بەدوای مردن نیە، باوەڕیان بە خوا نیە،

وەختێك کە باسی خوا دەکرێت (جل جلاله) دڵیـان تێکدەچـێت و نارەحـەت و نـا مورتاح دەبن!!، لە جەلسەکەدا هەڵدەستن دەچنە دەرەوە، یا ئـەو کەسـە خـۆی مەشغوڵ دەکات، یان باسێکی تر دێنێتە پێشەوە.

بەڵام وەختێك کە باسـی غـەیری خـوا دەکرێـت، ئەوانـەی کـە باوەڕیـان بـە قیامەتێ نییە یان زەعیفە، خۆی بۆ ئامادە نەکردووە، زۆر دەترسێ، حەز ناکـا ئەو باسە بێتە پێشەوە، ﴿وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ﴾: کە باسی خـەڵکی دونیـا بکرێ یان باسی دونیا بکرێ ئەوە ﴿إِذَا هُـمْ يَسْتَبْـشِرُونَ﴾: ئـەو جـار خۆشـحاڵ دەبن، مەجلیس کاتێك بە دین دەڕازێتەوە ئەوان دڵیان پێ تێکدەچـێ! وەختـێ کە بە دنیا دەڕازێتەوە ئەوان پێ دڵخۆش دەبـن!، دیـارە ئـەوەش یەکێکـە لـە سیفەتەکانی هاوەڵانی شەیتان خوا بمانپارێزێ...

**دووەم، لە بەرهەمەکانی تەقوا، زانایی و عیلم دەستکەوتنە:**

ئینسان وەختێ کە تەقوای هەبێ و لە خـوا بترسـێ، خـوا لـە ئیـسلام حـاڵی دەکات، فێری عیلمی دەکات، چونکە خوا دەفەرموێت: ﴿وَاتَّقُواْ اللّـهَ وَيُعَلِّمُكُـمُ اللّهُ﴾ ٢٨٢- البقرة: پارێز لە خـوا بکـەن، خـوا فێـرە عیلمتـان دەکـات، تـۆ عەبدی خوای نیت؟! خوا تۆی دروست نەکردووە؟، هـەموو ئاسمانـەکان و زەوی بەدەست خوا نیە؟! زانیاری (عیلم) بەدەسـت خـوا نیـە؟! کـەون هـەمووی لـە دەستەڵاتی خوا نیە؟! تۆش هـەر لـە دەسـتەڵاتی خـوا نیـت؟! بێگومـان بـا، کەوابوو تۆ کە عەبدێکی ئەوی بۆی بگونجێی و لێی بترسی چۆن حاڵیت ناکات؟ چۆن حەز دەکات عەبدەکەی خۆی جاهیل بێـت؟ خـوا ئەفـەرموێ ﴿إِن تَكْفُـرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْ﴾ ٧- الزمر: ئەگەر ئێوە کافربن خوای گەورە دەوڵەمەندە و پێویستی بە ئێوە نییە! ئەگەر ئێوە شوکری خوا بکەن لێتان رازیـە، خـوا رازی نابێ عەبدەکەی کافربێ، خوا رازی نابێ عەبدەکەی کوفر هەڵبژێرێ.

بەڵێ، چۆن خوای گەورە پێی خۆش نیە تۆ لە دینی خوا شارەزابی؟! بێگومان پێی خۆشە!، بۆیە یەکێك لە بەرهەمەکانی تەقوا ئەوەیە کە ئینسان لـە دینـی خوا شارەزا دەبێ و سینگی دەکرێتەوە، ﴿فَمَن يُرِدِ اللّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلاَمِ﴾ ١٢٥- الانعام: کەسێك نیەتی خێربێ و خوا بیەوێ لـە دیـن حـاڵی بکات دڵی دەکاتەوە بۆ ئیسلام، ﴿يَشْرَحْ صَدْرَهُ﴾: سینگی دەکاتەوە، بۆچـی؟! (لِلإِسْلاَمِ): ئیسلام بچێتە ناوی ﴿وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاء﴾: کەسێك رێگای هیدایەت نـەگرێ، نیازیـشی وانـەبێ رێگای هیدایەت بگرێ و وە دوای حەق کەوێ، خوای گـەورە هەناسـەی تـەنگ دەکات وەك ئەوەی لە ئاسمانێ وەسەرکەوێ کە ئۆکسجین نیـە!، پێغەمبـەریش ﷺ فەرمووی (وَمَن يردِالله بِهِ خَيراً يُفَقِّهُهُ في الدِّين)[٢٦]: هەر کەسێك خوای گەورە بیەوێ خێری لەگەڵ بکا، وە نیەتی خێری هەبێ ئەو ئینسانە، خوای گـەورە لـە دین حاڵی دەکات.

**سێیەم، لە بەرهەمەکانی تەقوا بریتییە لە (خوا لەگەڵدابوون):**

خـوای گـەورە لـە قورئـان بەصـەراحەت دەفـەرموێ ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ ٣٦- التوبة: خوا لەگـەڵ تەقواداراندایـە، تـۆ لـە خـوا بترسـی خـوا لەگەڵتدایە!، چەندە لە خوا بترسی ئەوەندە خوا لەگەڵتدایە!، پێغەمبەر بـانگی عەبدوڵای کوڕی عەبباس دەکات دەفەرموێ (ياغُلام إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمات): ئـەی گەنجە وەرە چـەند کەلیمەیـەکت فێرکـەم، (إحفَظِ اللهَ يَحفَظكَ)[٢٧]: ئاگـات لـە

---

[٢٦] (فتح الباري) شرح صحيح البخاري، مجلد١، كتاب العلم، باب١٣، حديث٧١.

[٢٧] «عن أبي سعيد الخدري، قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم لعبد الله بن عباس: «يا غلام، أو غليم، ألا أعلمك شيئا لعل الله عز وجل أن ينفعك به، احفظ الله يحفظك، احفظ الله يكن أمامك، إذا سألت فاسأل الله عز وجل، وإذا استعنت فاستعن بالله، تعرف إلى الله في الرخاء يعرفك عند الشدة، وجف القلم بما هو كائن، فلو أن الناس اجتمعوا جميعا على أن يعطوك شيئا لم يعطك الله لم يقدروا عليه، ولو أن الناس اجتمعوا على أن يمنعوك شيئا قدره الله لك وكتبه لك ما استطاعوا، واعلم أن لكل شيء شدة ورخاء، وأن مع العسر يسرا، وأن مع العسر يسرا».

سنووری خوا بێت خوا ئاگای لەتۆ دەبێ، (إحفَظِ اللهَ يكن أمامك) فەرمووی: ئاگات لەسنووری خوا بێت، سنوری خودا مەبەزێنە، خۆت لە حەرام بپارێزە خوای گەورە لە كاتی تەنگانەدا دێتە هانات، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە حەدیسێكی دیكەدا دەفەرمووێ (تَعَرَّف إلى اللهِ فِي الرَّخَاءِ يَعرِفكَ فِي الشِّدَة)[28]: لە كاتی خۆشیدا خوات لەبیربێ لە كاتی ناخۆشیدا خوا تۆی لەبیرە!، لە كاتی تەنگانەدا خوا تۆی لەیاد ناچێ، ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ﴾ ١٥٢- البقرة، فەرمووی: منتان لەیادبێ من ئێوەم لەیادە، چەندە خوات لەیادبێ ئەوەندەش خوای گەورە تۆ فەرامۆش ناكات و لەگەڵتدایە!.

## چوارەم، سڕانەوە و ڕەشبوونەوەی گوناه و تاوانەكان:

ئینسان ئەگەر تەقوای هەبێ، بگەڕێتەوە لای خوا و لە خوا بترسێ، خوا گوناهەكانی ڕەش دەكاتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُعْظِمْ لَهُ أَجْرًا﴾ ٥- الطلاق، (وَمن): هەر كەسێك، لە خوا بترسێ و بگەڕێتەوە لای خوا، تەقوای هەبێ، خوای گەورە گوناهەكانی ڕەش دەكاتەوە دەیپۆشێ، ﴿وَيُعْظِمْ لَهُ أَجْرًا﴾: پاداشتەكەشی بۆ چەندانە دەكاتەوە، ئەجر و پاداشتی بۆ زیاد دەكات.

## پێنجەم، تەقوا مایەی ڕزق زیادبوونە:

صەحابیەك (خوای لێ ڕازی بێت) خۆی و خێزانەكەی دەچنە لای پێغەمبەر ﷺ، دەڵێن: ((يَا رسولَ الله.. كوڕەكەمان لە غەزایێ لە دژی كافرەكاندا گیراوە و ئەسیرە، نەهاتۆتەوە و دڵمان پێوەیەتی و زۆر ناڕەحەتین))، پێغەمبەر ﷺ

---

[28] ((احفظ الله تجده أمامك، تعرف إلى الله في الرخاء يعرفك في الشدة، واعلم أن ما أخطأك لم يكن ليصيبك، وما أصابك لم يكن ليخطئك، واعلم أن النصر مع الصبر، وأن الفرج مع الكرب، وأن مع العسر يسراً)) الترمذي ٢٥١٨، وأخرجه أحمد في مسنده ٢٨٠٤ و ٢٦٦٩، وأسناده صحيح. وفي رواية غير الترمذي: رياض الصالحين، صفحة ٤٨، رقم الحديث ٦٢

فەرمووی ((بڕۆنەوەماڵەوە هەر بڵێن (لاحَولَ وَلا قُوَّةَ إلا بِاللە)، هەر ئەو زیكرە بكەن)) ئەوانیش چونەوە و هەر ئەو زیكرەیان كرد، لەناكاو شەو لە دەرگا دەدرێ وەختێك تەماشا ئەكەن كوڕەكەیانە هاتۆتەوە لای كافرەكان رای كردووە و مەڕ و ماڵاتیشیانی بەغەنیمەت هێناوەتەوە بۆیان، بۆیە خوای گەورە فەرمووی ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِبُ﴾ ۲، ۳– الطلاق: كەسێك پارێز لە خوا بكات خوای گەورە دەرگای خێری لێ دەكاتەوە، (مَخْرَجً)یانی دەرگای خێر، یانی دەرگای رۆشنایی، دەرگای ئازادیی و نەجات..، ﴿وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِبُ﴾: رزقیشی بۆ دەنێرێ لە شوێنێك كە بۆ خۆی هەر هەستی نەكردووە و بە خەیاڵیشیدا نەهاتووە! وەكو ئەو صەحابیە بەڕێزە كە خۆی و خێزانەكەی شادبوونەوە بە كوڕەكەیان وێرای مەڕ و ماڵات و سامانیش كە بۆیان هاتبوو.

**شەشەم، تەقوا دەبێتە مایەی كار بۆ ئاسانبوون:**

چەندە پارێز لە خوا بكەی ئەوەندە كاروبارت بۆ ئاسان دەبێ، ئیشی رۆژانە، ئیشی شەوانەت، ئیشی ئیدارەت ئیشی دائیرەت، ئیشی بازارت كاروباری دەرێ و ژووری، خوای گەورە هەموو كاروبارەكانت بۆ ئاسان دەكات، چونكە دەفەرموێ ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا﴾ ٤– الطلاق: هەر كەسێك پارێز لە بێ فەرمانی خوا بكات خوای گەورە (ئاسانی) داوێتە ناو ئیش و كارەكەی و كارەكانی بۆ ئاسان دەكات، چونكە پشتیوانی بەخوا بووە، خوای گەورەش لەگەڵیدایە و كاری بۆ ئاسان دەكات.

**حەوتەم، خوا (جل جلالە) تەقوادارانی خۆش دەوێت:**

خوای گەورە دەفەرموێ ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾ ۷– التوبة: بێگومان خوای گەورە تەقوادارانی خۆش دەوێن، جا چۆن تۆ خوات خۆش بوێ ئەو تۆی خۆش

ناوێ!؟ خوا ئەو (عادل)دیە، ئەو (أحكَمُ الحاكِمين)ەیە کە خۆی لە قورئاندا وەسفی خۆی دەکات[٢٩]، چۆن تۆی خۆش ناوێ وەختێك کە تۆ ئەوت خۆشدەوێ!؟ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ﴾ ٥٤- المائدة، خوای گەورە فەرمووی: ئەی ئیمانداریـنە ئەگەر ئێوە هەمووتان هەڵگەڕێنەوە لە دین و (مُرتد) ببنەوە-خوا ئێوە لادەبا، خەڵکێکی تر دێنێ کە خوا ئەوانی خۆش دەوێ و ئەوانیش خوایان خۆش دەوێ!

خۆشەویستەکانم: خوا پێویستی بە ئێمە نییە، ئێمە پێویستیمان بە خوایە، خوا (صمَد)د، ﴿اللَّهُ الصَّمَدُ﴾ ٢- الاخلاص، (صمد) یانی هەموو شتێك پێویستی بەخوا هەیە، ئەو پێویستی بە هیچ نییە!!، ئێمە پێویستیمان بە خوایە، خوای گەورە تەنها عیبادەتی لە ئێمە دەوێ ئەوەش بەوەنا کە خوا پێی دەوڵەمەند ببێ یا دەستەڵاتی زیاد بێ، بەڵکو خوا هەر خوایە عیبادەتی بکەین یا نەیکەین، هیچ لە موڵکی خوای پەروەردگار کەم ناکاتەوە! لەبەر ئەوە خوا ئێمەی خۆشدەوێ بەو ئەندازەی کە ئێمە ئەومان خۆشدەوێ.

### هەشتەم، سەقامگیربوونی ژیان و دەوڵەت لەسەر ئەساسی تەقوا:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَى تَقْوَى مِنَ اللّهِ وَرِضْوَانٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَىَ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَانْهَارَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ﴾ ١٠٩- التوبة، دەفەرموێ: ئایا کەسێك کارەکەی لەسەر ئەساسی تەقوا و ڕەزابوونی خوا دابمەزرێنێ چاکترەو خێری زیاترە یان کەسێك کارەکەی لەسەر لێواری کەندەلانێکی ڕوخەك دابمەزرێنێ؟!.

هەر شتێك بۆ خوا نەبێ، خوا دەیبڕێ!، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مَاكانَ للّهِ يَنمو وَماكَانَ لِغَيرِهِ يَنقَطِع): هەر کارێك بۆ خوا بێ خوا گەشەداری دەکات، گەشە دەکات!!، وە هەرشتێك بۆ خوا نەبێ کۆتایی دێ و بەرەکەتی نیە!،

---

[٢٩] وەکو دەفەرموێ: ((أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ)) ٨- التين.

نیشانەی ڕاستبوون و بەرەكەت و لەسەر خێربوون، گەشەكردنی ئەو كارەیە كـە تۆ لەسەری، بۆیە حەدیسی لەسەرە فەرمووی: (ئەگەر لە معامەلەیەكدا جارێك قازانجت نەكرد، دووجار قازانجت نەكرد، معامەلەكـەی بگـۆڕە!). لەبەرئـەوەی: ((مَاكانَ للهِ دامَ واتصَل وَمَاكانَ لِغَيْرِهِ انقَطَعَ وَانفَصَل)).

**نۆیەم، خوای گەورە لە دوژمنانت دەتپارێزێ:**

تەقوا مایەی پاراستنی تۆیە لە دوژمنانت!، خوا لە قورئان دەفـەرموێ ﴿وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُـواْ لا يَـضُرُّكُمْ كَيْـدُهُمْ شَيْئًا﴾ ١٢٠- آل عمـران: ئەگـەر ئێـوە صەبرتان هەبێ و تەقواشتان هەبێ، ﴿لا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا﴾: فێڵ و پـیلان و تاكتیكی دوژمن و ناحەزانتان زەرەر لە ئێوە نادات!!.

**دەیەم، بەهۆی تەقوا هەق و ناهەق لە یەكتر جیا دەكەیتەوە:**

جاری وایە تۆ بەرچاوت ڕوون نییە، تەم و مژێك دێتە بەرچاوت دوو شـتت لێ تێكەڵ دەبێ، حەق و ناحەقت لێ دەشێوێ، بەڵام لە خوا بترسـە خـوا ئیلـهامی ناو دڵت دەكات، حەقت نیشان دەداو دەیدۆزیەوە.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِن تَتَّقُواْ اللّهَ يَجْعَـل لَّكُـمْ فُرْقَانـاً﴾ ٢٩- الانفـال، ئەگەر ئێوە لە خوا بترسن، خوای گەورە (فُرقـان)تان دەداتـێ، واتـا زانیاریـەكی واتان دەداتێ كە جیاوازی بكەن لە نێوان حـەق و باتـڵ، خـوا لەگـەڵ تۆدایـە، بەمەرجێك تۆ لەگەڵ خوادا بیت!.

**یانزەیەم، چوونە بەهەشت بە تەقوارەیە،**

خوا دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ الدَّارُ الاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الارْضِ وَلا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ ٨٣- القـصص، واتە ئێمە ئەو ژیانـەی قیامـەت، ئەو ژیانەی بەهەشت ئەدەینە كەسانێك كە لە دونیـادا (تَكَبُّـر)یـان لێنـەداوە و فاك و فیتیان بەسەر خەڵكیدا نەكردووە، (تَكَبُّر)یان بەسـەر زەویـدا نـەكردووە،

خۆ بەزل ناگرن و فەساد لە زەوی دا ناکەن، ئـەو بەهەشـتـە کـە خـوا ئامـادەی کردووە، ئەفەرموێ دەیدەیـنە ئەو کەسانە، ﴿وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾: وە سەرەنجامیش بۆ تەقوادارانە.

بەڵێ خۆشەویستەکانم:

### ⋆ تەقوا لە سێ شتدا خۆی دەنوێنێ:

**یەکـەم:** پابەندبوون و پەسەندکردنی هەرچی کاری چاکە و، پەیڕەوکردنیەتی کە خوا ئەمری پێکردووە، کردنی کاری پەسەندو باش.

**دووهەم:** نەکردنی کاری ناپەسەند و خەراپ.

**سێهەم:** زێدەڕۆیی نەکردن لە کاری حەڵاڵ و موباح، یانی نەکردنی ئیسراف لە کاری رۆژانە، لەو هەڵسوکەوت(تَعامُل)ەی کە رۆژانە هەتە لە خـواردن و خواردنەوە، لە جلوبەرگ، لە پێکەوەژیان (تَعايش) لەگەڵ خەڵکی.

ئینجـا پەسـەندکردنی هەرچـی چـاکە و کـارپێکردنی ئـەوە خـوای گـەورە دەفەرموێ ﴿اتَّبِعْ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾[30] ١٠٦- الانعام، خوای گـەورە بـە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ ﴿ثُمَّ جَعَلْنَـاكَ عَلَـى شَـرِيعَةٍ مِّـنَ الامْـرِ فَاتَّبِعْهَـا﴾[31] ١٨- الجاثية، خوای گەورە پێمان دەفەرموێ ﴿اتَّبِعُواْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُـمْ﴾ ٣- الاعـراف: وە دوای ئـەو قورئانـە بکـەون کـە بۆتـان هـاتووە لەلایـەن پەروەردگاری خۆتان، ئەوەی رێنیشاندەرە بۆ چاکە و پێشگیری دەکا لـە خراپـە قورئانی پیرۆزە، جانبێکی پێمان دەڵێ ئەوە حەڵاڵـە و بیکـەن وە دوای کـەون،

---

[30] واتە: (تۆ ئەی موحەممەد ﷺ) شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەوە کە لەلایەن پەروەردگارتەوە بە سروش (وەحی) پێت راگەیەنراوە.

[31] واتە: لەوەو دوا ئێمە تۆمان ئەی موحەممەد ﷺ خستۆتە سەر بەرنامەیەکی راست و رەوان لە هەموو کاروبارێکی ئەم ئایینەدا، کەواتە شوێنی بکەوە و لێی لامەدە.

ئەوەش حەرامە و مەیکەن، پێغەمبەریش نموونەیە بۆ ئێوە ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا﴾ ٧- الحشر، هەرچی پێغەمبەرتان پێتان بفەرمووێ ((بیکەن)) جێبەجێی بکەن، وەهەرچی کە پێتان بفەرمووێ ((مەیکەن)) یانی مەیکەن و موناقەشەی تێدا مەکەن.

خۆشەویستەکانم: هەندێ شت هەیە زێدەڕۆیی تێدا دەکرێ، ئینسان توشی حەرام و گوناهباری دەبێ، بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ ﴿إِنَّهُ لا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾ ٣١- الاعراف: خوای گەورە ئەوانەی خۆشناوێ کە ئیسرافێ دەکەن، لە ئیمامی (عەلی)یان پرسیار کرد ((ئیسراف یانی چی؟))، فەرمووی (مَابَعدَ الكَفافِ إِسرَافٌ): لە دوای ئەوەی کە شت بەسە و کافییە ئیسرافە!، هەرچی تۆ دەیکەی ئەگەر زێدەبوو لە خۆت ئەوە پێی دەگوترێ ئیسراف.

زێدە لە (مَعيشة)ت، زێدە لە مسروفاتی رۆژانەت و جلوبەرگ و سەیارەت، زێدە لە خانووت، زێدە لە ژیان و حاڵ و باڵی خۆت ئەوە پێی دەگوترێ ئیسراف و نەیکەی چاکە!.

پێغەمبەرمان (عليه الصلاة والسلام) فەرمووی (إِنَّ الحَلالَ بَيِّن وَإِنَّ الحَرامَ بَيِّن)[٣٢]: حەڵاڵ دیاریکراوە، حەرامیش دیاریکراوە (وَبَينَهُما أُمُورٌ مُشتَبِهاتٌ): لە نێوان حەڵاڵ و حەرامدا هەندێك شت هەیە (شُبُهات)ی تێدان کە نازانی نەحەڵاڵە و نە

[٣٢] ((حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ عَنْ عَامِرٍ قَالَ سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ يَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ الْحَلالُ بَيِّنٌ وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ وَبَيْنَهُمَا مُشَبَّهَاتٌ لا يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ فَمَنْ اتَّقَى الْمُشَبَّهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ كَرَاعٍ يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ أَلا وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى أَلا إِنَّ حِمَى اللَّهِ فِي أَرْضِهِ مَحَارِمُهُ أَلا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ أَلا وَهِيَ الْقَلْبُ)) صحيح بخاري، جزء ١، كتاب الايمان، باب: فضل من استبرأ لدينه، صفحة ٢٨، رقم الحديث ٥٢، وأطراف الحديث في البخاري ((١٩٤٦)). وأخرجه مسلم في المسقاة، باب: أخذ الحلال وترك الشبهات، رقم الحديث ١٥٩٩

حەرام، مسوڵمان دەبێ خۆ لەوەش بپارێزێ، (فَمَن اتَّقَى الشُّبُهاتِ استَبَرأَ لِدِينِهِ وَعِرضِهِ): هەر كەسێك خۆی لەو شتەی پاراست كە نەزانێ نەحەڵاڵە و نەحەرام ئەوە خۆی و ماڵ و منداڵ و دینەكەی پاراستوە، (وَمَن وَقَعَ فِي الشُّبُهاتِ وَقَعَ فِي الحَرامِ): هەر كەسێك ئەمڕۆ بكەوێتە ناو شوبهە، دەكەوێتە ناو حەرام (كَالرَّاعِي يَرعَي حَولَ الحِمَى يُوشكُ أَن يَقَعَ فِيهِ): وەكو شوانێك كە مێگەلەكەی لە دەورەی پاوان بلەوەڕێنێ كە پەرژینی نەبێ، رۆژێك دێ ئەو ماڵاتە پێی داوێتە ناوی و زەڕەكەی دەكات، چونكە لە دەورەی دەلەوەڕێنێ!، تۆ كە لە دەورەی حەرام سوڕایەوە، رۆژێك دێت پێت داوێیە ناو حەرام! (أَلا إِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمىً أَلا وَإِنَّ حمى اللهِ فِي أَرْضِهِ مَحارِمُهُ): فەرمووی ئاگاداربن هەموو مەلیك و دەسەڵاتدارێك پاوان و قەدەغەی خۆی هەیە، (أَلا وَإِنَّ حِمى اللهِ فِي أَرْضِهِ مَحارِمُهُ): پاوان و قەدەغەی خواش ئەوشتانەن كە حەرامی كردوون و نابێ سنور بشكێنرێ و بچیە ناویەوە، وەختێ كە تۆ توشی حەرام بووی خوا دەتگرێت، سنووری خوا شكاندن یانی خۆ تووشی حەرامكردن لەبەر ئەوە زۆر دەبێ خۆت بپارێزیت.

ئێمە دەبێ نموونە بین بۆ خەڵكێك كە لە ئیسلام حاڵی نییە ئەمڕۆ موشتاقە و دیداری ئیسلامی پێخۆشە، باوەش بۆ ئیسلام دەكاتەوە، بەڵام عەیبی ئێمە دەبینێ بۆیە مسوڵمان نابێت، یان بۆیە نایەتە مەجلیسەكەمان دابنیشێ لەوانەیە عەیبمان ببینێ، ئێمە خۆمان كردووە بە نموونەی مسوڵمانان زۆرجاریش وایە زەرەرمان لە ئیسلام داوە لەبەر خووڕەوشتی خراپی خۆمان!، بەڕاستی پێویستە موراجەعەی خۆمان بكەینەوە، هەر لەسەرێ تا خوارێ پێشتر مامۆستایانی ئایینی لەگەڵ رێزم بۆیان بەڕاستی مامۆستایانی ئایینی وەكو زۆر لە زانایان دەڵێن (خوێی چێشتن) بەڕاستی خوێی چێشتن!، وەختێك كە مامۆستا چاك بێ میللەتیش چاك دەبێ! وەختێك كە مامۆستا سەری لێ

بـشێوێ، میللـەتیش سـەری لێ دەشـێوێ!، وەختـێ کـە مامۆسـتا لاربـۆوە میللەتیش لار دەبێتەوە!، وەختێك کە مامۆستا خۆی لە (شُبُهات)ێدا، خـەڵك خۆی لە حەرامێ دەدا، ئەها ئیمامی غەزالی دەفەرموێ چی!، دەفـەرموێ (إذا دَخَلَ العالِمُ في الشُّبُهاتِ دَخَلَ العَالَمُ في الحَرامِ): وەختێك کە زانا خـۆی تووشـی شتێك کرد کە شوبهەی تێدایە، خەڵك خـۆی تووشـی حـەرامێ دەکـا، چـونکە هەنگاوێك لە مامۆستا زیاتر دەچنە پێش!!.

خۆزگە مامۆستایانیش ئەمڕۆ وەختێك کە دەیانگوت ((حەرامـە کـچ سـەری رووت بێ)) کچەکەی هێندێکیان سـەری رووت نـەدەبوو!!، لەگـەڵ رێزیـشم بـۆ مامۆستایانی ئایینی بەڵام بەداخەوە هەندێك لـە مامۆسـتایانی ئـایینی ئـەو سەردەمەی خۆمان کە (مامۆستایانی ئـایینی)شـیان ناشـیرین کـردووە، رێـزی جوببە و مێزەریشیان بەڕاستی هێناوەتـە خـوارەوە! کـە حەقیقـەت مامۆسـتا دەبێتە رێنیشاندەری ئوممەت، وە پێشی ئوممەت کەوتووە یا بۆ بەهەشـتێ یـا بۆ جەهەننەمێ!، جا بەڕاستی پێویستە مامۆستایانی ئاینیش بـەخۆدا بێنـەوە ئەم قسەم لەگەڵ ئەوانە، بەڵێ من خۆم بـە قوتابیـەکی مامۆسـتایانی ئـایینی دەزانم، بەڵام بەڕاستی مەسئولییەتی گەورە ئـەمڕۆ لـە ئوممـەتی ئیـسلامیدا لەسـەر مامۆسـتایانی ئایینییـە، مامۆسـتایانی ئـایینی کـە دەڵـێن ((زوڵـم حەرامە)) نابێ بۆخۆیشی توخونی زوڵم بکەوێ و لە زاڵم نزیك بێتەوە!، وەختـێ کە دەڵێ ((خواردنی حەرام ئاگری جەهەننـەم خـۆش دەکـا)) دەبـێ خۆشـی لێ بیارێزێ، وەختێ کە دەڵێ ((ئـافرەت دەبـێ خـۆی داپۆشـی))، دەبـێ ئـەویش دەعوەی حیجاب بکاو داکۆکی لەسەر حیجاب بکا!، بەڕاستی مەسئولییەتێکە لەسـەر شـانی هـەموو لایـەکمان وە مامۆسـتایانی ئـایینیش یـەکێکن لـە پێشەوایانی ئوممەتی ئیسلامی، کە پێغەمبـەر فـەرمووی (زانایـان میراتگـری پێغەمبـەرانن، پێغەمبـەرانیش درەم و دیناریـان بـەجێ نەهێـشتووە بـەڵکو

عیلمیان بەجێ هێشتووە!)، وە هەروەها فەرموی ﷺ (الفُقَهاءُ أُمَناءُ الرُسُلِ ما لَم يَدخُلُوا فِي الدُنيا وَيتبَعوا السُلْطان)[٣٣] فەرمووی: زانایان ئەمینداری پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام)، بەلام بە مەرجێك لەگەڵ دەستەلاتداران -ی زالم- تێکەلاو نەبن)) وەختێك کە لەگەڵ دەستەلاتداران تێکەلاوبوون و دوایان کەوتن، فەرمووی (فَاِذا فَعَلُوا ذالِكَ فاحْذَرُوهُم): ئەوە خیانەتیان لەگەڵ پێغەمبەرانی خۆیانیان کردووە، ئێوە خۆتان لەو زانایانە بپارێزن.

بەڕاستی خەتەرێکە لەسەر شانی مامۆستایان، یەك لەوانە من خۆم لێرە کە ئەو قسەیە دەکەم خۆم بە مەسئول دەزانم لەو قسەیە، چونکە منیش دەگرێتەوە!!، منیش کە ئەمڕۆ نەسیحەتێك دەکەم و وتارێك دەخوێنمەوە حیسابە لەسەر منیش بەلام پێویستە ئێمە هەمووومان بەخۆماندا بێینەوە، پێش ئەوە مامۆستایانی ئایینی چونکە خەتەرێکە لەسەر ئومەتی ئیسلامی!!، کوفر لە هەموو لایەکەوە دەیەوێ رەگی ئیسلام ببڕێتەوە!، نەك هەر لەسەردوە بەڵکو یەکەیەکە رەگەکانی بکوتێ لەبنەوە کە من و تۆ هەستی پێنەکەین!، جا جاری وا هەیە مامۆستایەك دەگرێ بۆ ئەوەی کە خەڵکی تری پێ بگرێت، کە بەداخەوە نەدەبوایە مامۆستایان ئەمڕۆ ئەوەندە پەرش و بلاوبن و ئەوەندە پشتیان لەیەکبێ، کە نەتوانن واقیعێکی فاسد لە وڵاتی خۆمان بگۆڕن!!، یا لە هەموو دونیا، ئەگەر مامۆستایانی کوردستان ئەمڕۆ پاڵپشتی یەکتری بن، ئەمڕۆ هەشت هەزار مامۆستا لەوانەیە لە کوردستان هەبێ، هەشت هەزار مامۆستا!!، با مامۆستا لەسەر شەقام و جادە و کۆڵان لە دژی فەساد و بێ

[٣٣] ((الفُقَهاءُ أُمَناءُ الرُسُلِ ما لَم يَدخُلُوا فِي الدُنيا وَيتبَعوا السُلطان، فَاِذا فَعَلُوا ذالِكَ فَاحذَروهُم))، العسكري من حديث العوام بن حوشب عن أبي صادق عن علي به مرفوعا وهو ضعيف السند. انظر: (المقاصد الحسنة في بيان كثير من الاحاديث المشتهرة على الالسنة)، صفحة ٣٠٧، رقم الحديث ٧٤٦.

ئەخلاقی و قومارخانە، لە دژی مەیخانە و سینەما و شتی خراپ، دەنگی خۆی بەرزكاتەوە و بزانێ ئایا خەڵك بەقسەی دەكات، یان بەقسەی ناكا؟!.

بەڵام بەڕاستی ئێمە هەموومان (مُقَصِّر)ین، وەكو مسوڵمانێك لە بەرامبەر دینی خوا، بۆیەش دەڵێم مامۆستایان چونكە ئەوان بەڕاستی ڕۆژی قیامەت پرسیاریان لێدەكرێت، بەر لەوەی پرسیار لە عالەم بكرێ پرسیار لە عالیم دەكرێ!، وەكو ئیمامی عەلی ﷺ فەرمووی: (پرسیار لە جاهیل و لە قوتابی ناكرێت بۆ نەچوویت فێربیت؟ هەتا پرسیار لە زانای نەكرێ بۆ خەڵكت فێر نەكرد؟!!)، ئەو مامۆستایە دكتۆرە دەبێ خۆی بچێ سەردانی نەخۆشەكان بكات!، وە خۆی بچێ، بەو خەڵكە دابێتەوە.

بەڵێ خۆشەویستەكانم: بۆیە لە ڕۆژی قیامەتیشدا كەسێك دێنن دەیهاوێنە ناو ئاگری دۆزەخ وەكو پێغەمبەر ﷺ وەصفی دەكات (يُؤتَى بِالرَّجُلِ يَوم القِيامَةِ فَيُلقَى فِي النَّارِ)[٣٤]: ڕۆژی قیامەت كابرایەك دەهێنن و دەیخەنە ناو ئاگری جەهەننەم، (فَتَندَلِقُ أقتَاب بَطنِهِ): ڕیخۆڵەكانی دێنە دەرەوە لە زگی، (ويَدور حَولَه كَمَا يَدُور الحِمارُ بِالرَّحَى): لە دەوری ڕیخۆڵەی خۆدا دەسوڕێتەوە، هەروەكو چۆن گوێدرێژ بەدەوری (ناعور)یدا دەسوڕێتەوە!، (ناعور كە ئاو هەڵدێنجێ لەبیر، بەحەبلێك بەدەوریدا دەسوڕێتەوە)، ئەو ئینسانە ئاوایە لە جەهەننەم!!

---

[٣٤] ((عَن أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ قَالَ قِيلَ لَهُ أَلا تَدْخُلُ عَلَى عُثْمَانَ فَتُكَلِّمَهُ فَقَالَ أَتَرَوْنَ أَنِّي لا أُكَلِّمُهُ إِلا أُسْمِعُكُمْ وَاللَّهِ لَقَدْ كَلَّمْتُهُ فِيمَا بَينِي وَبَينَهُ مَا دُونَ أَنْ أَفْتَتِحَ أَمْرًا لا أُحِبُّ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ فَتَحَهُ وَلا أَقُولُ لأحَدٍ يَكُونُ عَلَيَّ أَمِيرًا إِنَّهُ خَيْرُ النَّاسِ بَعْدَ مَاسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ يُؤْتَى بِالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُلْقَى فِي النَّارِ فَتَنْدَلِقُ أَقْتَابُ بَطْنِه فَيَدُورُ بِهَا كَمَا يَدُورُ الْحِمَارُ بِالرَّحَى فَيَجْتَمِعُ إِلَيْهِ أَهْلُ النَّارِ فَيَقُولُونَ يَا فُلانُ مَا لَكَ أَلَمْ تَكُنْ تَأْمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَى عَنْ الْمُنْكَرِ فَيَقُولُ بَلَى قَدْ كُنْتُ آمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَلا آتِيهِ وَأَنْهَى عَنْ الْمُنْكَرِ وَآتِيهِ)) صحيح المسلم، كتاب الزهد والرقائق، باب: عقوبة من يأمر بالمعروف ولا يفعله وينهى عن المنكر ويفعله، صفحة ١٢٤٧، رقم الحديث (٢٩٨٩- ٥١)، و صححه مسلم.

(فَیجتَمَعُ إلیـە أهـلُ النَّـارِ): خەڵكەكـە لیـی كۆدەبێتـەوە، (فَیَقُولُـونَ) دەڵـێن (یَافُلان مَأ لَـك): ئەوە چیە فلانەكەس؟، ئـەوە تـۆی لێـرەی؟! (أَلَـم تَكُـنْ تَـأْمُرُ بِالَمعروفِ وَتنهی عَنِ المُنكَرِ؟): ئەی تۆ نەبوویت فـەرمانت بـە چـاكە دەكـرد و رێگریشت لە خراپە (مُنكر) دەكرد؟ ئەویش دەڵێ بەڵێ (كُنتُ آمُرُ بِالَمعروفِ وَلا آتِیهِ، وَأَنهی عَنِ المُنكرِ وَآتِیهِ): بەڵێ من ئـەمرم بـە چـاكە دەكـرد و خـۆم نـەم دەكرد، وە نەهیشم لە (مُنكـر) دەكـرد و خۆیـشم دەمكـرد!.. بەڕاسـتی ئـەوە خەتـەرێكی گەورەیـە!، نـەك هـەر لەسـەر ماموٚسـتا بـەڵكو لەسـەر هـەموو مسوڵمانێك، وەختێك كە بە یەكێك دەڵێ ((تەقوات هەبێ و لـە خـوا بترسـێ)) خۆیشی تەقوای نەبێ!!.

جا خۆشەویستانم: ئەوە مەبەستم ئەوەیە ئێمە خۆمان ئاگامان لەخۆمان بـێ، وەلاهی ئەگەر خۆمان ئاگامان لەخۆمان بێ وەك مسوڵمان دوژمنـانی ئیـسلام ناتوانن زەفەر بەمسوڵمانان بهێنن!!.. ﴿وَلَن يَجْعَلَ اللّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُـؤْمِنِينَ سَبِيلاً﴾ ١٤١- النساء، بەلام بەمـەرجێك ﴿يَعْبُـدُونَنِي لا يُـشْرِكُونَ بـي شَـيْئًا﴾ ٥٥- النور: عیبادەتم بكەن و شەریكم بۆ بڕیار نەدەن، بمپەرستن.

خوا عەبدی خۆی زەلیـل ناكـات! بـەلام عەبـد خـۆی خـۆی زەلیـل كـردووە بەڕاستی!، موسڵمان عـەزیزە!، خـوا مـەدحی كـردووە ﴿وَلِلَّـهِ الْعِـزَّةُ وَلِرَسُـولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ ٨- المنافقون.

بەڵێ خۆشەویستەكانم: تەقوا مایەی خوا لێ رازی بوونـە لـە ئینـسان، بۆیـە دەبێ وریابین و بەخۆماندا بچینەوە بتوانین ان شـاءاللە ئەو تەقوایە لە خۆمانـدا بهێنینە دی كە خوا دەیەوێ.

## تەقوا چۆن پەیدا دەبێ؟

بە پەیداکردنی عیلم، لە دین شارەزا بە خوا شارەزات دەکات و تەقوات پەیدا دەبێ، هاتوچۆی مزگەوت بکە قورئان بخوێنە و نوێژەکان بـە جەماعـەت بکـە تەقوات پەیدا دەبێ، لەگەڵ مسوڵمانان هەڵسە و دانیشە لە دەرسـیان دانیشـە، تەقوات پەیدا دەبێ، بە هاوڕێیەتیکردنی ئیمانداران.. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ هاوڕێیەتیکردنی ئیماندار وەکو ئەوەیە بچیت لەلای دوکانێك دانیشی کە بـۆنی خۆش دەفرۆشێت!، بەڵام هاوڕێیەتیکردنی پیاوی خراپ وەکو ئەوەیە بـچیە لای کورەیەك کە بەڕاستی ئەگەر نەشت سوتێنێ پشکت پێدەکەوێ!!.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: ئینجا با ئێمـە بگەڕێینـەوە لای خـوا و شـەرمی لـێ بکەین و لێی بترسین، هـەنگاوەکانمان بـۆ خـوا بـن، بـۆ ئـەوەی خـوای گـەورە بەرەکەت باوێتە ناو ئیشەکانمانەوە، چونکە بەڕاستی تۆ چـەندە قـەدری خـوات لەلابێ ئەوەندەش خوای گەورە قەدری تـۆی لەلایـە!!، چـەندەت خـوای گـەورە خۆشبوێ ئەوەندەش خوای گەورە تۆی خۆش دەوێت!، چەندە ڕەزامەنـدی خـۆت بوێ ئەوەندەش خوای گەورە ڕەزامەنـدی تـۆی دەوێ!، چـەندە خێرادەکـەی لـە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی ئەو، ئەوەندەش خوای گەورە لوتـف بەرامبـەر تـۆ دەنوێنێت!، چەندە ئەوت لەیاد بێت خـوای گـەورەش ئەوەنـدە تـۆی لـەیادە!، چەندە لەسەر خوا تووڕەببی و لەسەر خوا بە جواب بیت ئەوەندەش خوای گەورە لەسەر تۆ بە جوابە!، چەندە تۆ عادات و تەقالیدی خۆت بگۆڕی لەبـەر خـاتری خوا ئەوەندەش خوای گەورە لەگەڵتدایە، وەك چۆن خـوای گـەورە فـەرمانی بـە ئاگر کرد ساردبێ بۆ حەزرەتی ئیبراهیم کە قانونی ئاگر وایە شـت دەسـوتێنێ! خوای گەورە لەبەر خاتری حەزرەتی ئیبراهیم کە بـۆ خـوا گونجـا، وەختـێ کـە فڕێدرایە ناو ئاگرەکە فەرمووی: ﴿حَسبِيَ اللهُ وَنِعمَ الوَكِيلُ﴾: بەسە خوای گەورە

بۆ من پشت و كۆمەكم بێ..، ئیبراهیم بەتەنها بوو، خوای گـەورە دەفـەرموێ ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً﴾ ١٢٠- النحل، واتە: ئیبراهیم بە تەنها ئوممەتێك بـوو، ئاوا صولحا بۆ خوا: ﴿كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ ٦٧- آل عمران، كە فڕێیاندایە ناو ئاگر خوا فەرمووی: ﴿يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلامًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ﴾ ٦٩- الانبیاء: ئەی ئاگرە سارد ببە و سەلامەت بە لەسەر ئیـبراهیم!، ئەو ئاگرەی كە سوتێنەرە ساردبویەوە لەسەر حەزرەتی ئیبراهیم!! — كە قانونی سوتاندنە— خوا ئاوا قانوونی كەون بۆ ئینسان دەگۆڕێ لەبەر خاتری ئەوەی كـە ئەو ئینسانە لەگەڵ خوا گونجاوە و صولحاوە!.

جا با ئێمەش لەگەڵ خوای گەورەدا بگونجێین و پـشتمان بـەخوا قـاییم بێـت، پشت بەخوا ببەستین بۆ ئەوەی كە خوای گەورەش پشتمان بگرێت، وە بۆ ئەوەی خوای گەورە لە دونیادا و لە قیامەتیشدا فەزڵمان لەگەڵ بنوێنی....

لە خوای پەروەردگار دەپارێنەوە و دەڵێین: یاڕەببی خوایە پشتیوانمان هـەرتۆی و پشتمان بەر نەدەیت، یاڕەببی خوایە پشتیوانی هەموو مسوڵمانان بكـەی لـە دونیا، خوایە مسوڵمانان لەژێر دەستی زاڵم و سـتەمكاران رزگـار بكـەی، لـە میحنەت و دەرد و بـەڵای زاڵمـان رزگاریـان بكـەی، خوایـە توشـی تـەنگ و چەڵەمەیان نەكەی لە دونیا، خوایە ئێمەش و هەموو مسوڵمانان تەوفیق بـدەی بۆ ئەوەی تەقوادار بین، خوایە تەقوامان زیاد بكەی....

اللهم حَبِّبْ الینا الایمان وزینهُ في قلوبنا وكره الینا الكفر والفسوق والعصیان واجعلنا من الراشدین یاالله، أقول قولي هذا واستغفر الله لي ولكم ولسائر المسلمین فاستغفروه، أعوذ بالله من الشیطان الرجیم ((ربنا آتنا من لدنك رحمةً وهيء لنا من أمرنا رشدا))..

آمین

# شوکری خودا

﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ
وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ﴾ ٧- إبراهيم

# بسم الله الرحمن الرحيم

انَ الحَمدَ لِلهِ نَحمَدُهُ وِنَشكُرُهُ وَنَستَغفِرهُ وَنَستَهدِيه، ونعوذ بِالله مِن شُرُورِ أنفُسَنا وَسَيئات اَعمَالِنا، مَن يَهدِهِ اللهُ فَلا مُضِل لَـه، وَمـن يـضلِل فَـلا هـادِي لَـهُ..، نَشهَدُ أن لا الهَ الا اللهُ وَحدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، وَنشهَدُ اَن سيدَنا وَنَبينَا مُحمَداً عَبـدُه وَرَسُولهُ.. هَذا الرَسولُ الذِي بَلّغَ الرِسَالةَ وَأدَى الامانَةَ وَنَـصَحَ الامَـةَ وَجَاهَـدَ فِـي اللهِ حَقَ جِهَادِهِ وَتَرَكَنا عَلى المحجَةِ البَيـضاء، لَيلُهـا كَنَهارِهـا، لايَزِيـغُ عَنهـا الا هَالِك، اللَهُمَ صَلي وَسَلِم وَزِد وَبارِك عَلَى هَذا الرَسُول الكَرِيم وَعَلَى آلِهِ وَأصحَابِه وَالتَابِعينَ وَعَلَى اُمَتِه الى يومِ القِيامَـة اَجمَعِـين... اَمَـا بَعـدُ أُوصِـيكُم عِبـادَ الله وَنَفسِي أوَلاً بِتَقوَى اللهِ، فانَ اللهَ مَعَ الَذِينَ اتَّقُوا وَالذِينَ هُـم محـسُنون، قَـالَ اللهُ (سبحانه وتعالى) فِي كِتابِهِ الحَكِيم بِسمِ اللهِ الرَحمنِ الـرحِيم ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ ١-النساء.

برایـانی بـه‌ڕێز... ئیمانـدارانی خۆشه‌ویـست: لـه وتـاری رابـردوودا باسـی هه‌ڵوێستی ئیماندارانمان كرد له به‌رامبه‌ر بـه‌لاّ و ناخۆشـی و ناڕه‌حـه‌تی ژیـانی خۆیاندا، وتمان: ئاده‌میزاده‌كان به‌گشتی له دونیا تاقیكراونه‌وه به‌ناخۆشـیه‌كان، له‌ناو ئاده‌میزاده‌كانیشدا ئیمانـداران لـه هـه‌موو كـه‌س زیـاتر تووشـی بـه‌لاّو موصیبه‌ت ده‌بن!.. بۆچـی؟! چـونكه ئیمانـداران بـه‌دوای حه‌قـدا ده‌گـه‌ڕێن و هه‌ڵگری په‌یامی حه‌ق و عه‌داله‌تن، به ئه‌ندازه‌ی ئه‌وه‌ی كـه ئینـسان له‌حـه‌ق و عه‌داله‌ت نزیك بێ و هه‌ڵگری ئه‌و په‌یامه بێ..، ئه‌هلی باطل رقیان لێیـه‌تی و

دوژمنایـەتی دەكـەن، لـەناو ئیمانداراـنیـشدا ئەوانـەی كـە زۆر خۆیـان یـەكلا كردۆتەوە بۆ خوا (جل جلاله) زیاتر توشی بەڵا و ناخۆشی و سەر ئێشە و ئەزیـەت و ئـازار دەبـن، بـەڵام بۆچـی ئیمانـداران خـاوەنی صـەبری زۆر و (ثَبـات)و ئیستقامەتی زۆرن؟! لەبەر ئەوەی ئیمانداران دونیا بـە خـانووی نیـشتەجێبوون (دارالقرار)ی ژیانی خۆیانی نازانن!،

خۆیان لە دونیا بە رێبوار(مـسافر) دەزانن، دەڕۆنـەوە بـۆ لای خۆشەویـستانی خۆیان كە پێغەمبەران و شوێنكەوتوانی پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام) وە بـە خزمەتیان دەگەن، لەبەر ئەوە غەمی لێناخۆن، وە چۆك دانـادەن لـە بەرامبـەر ئەو موسیبەتانەی كە بەسەریان دێت.. وە هەر لەبەر ئەوەش خۆیان بە قوتـابی ئەو پێغەمبەرانە دەزانن (علیهم الصلاة والسلام) كە ئەوان توشی هـاتوون بێگومـان قوتابیەكانیش دەبێ رێگای ناخۆش و ئازار و ئەشكەنجە بێتە پێـشیان!، وە لـە هەمانكاتدا باوەڕیشیان هەیە كە قەزا و قـەدەری خوایـە، وە پاداشـتی خێـری قیامەتیشی لەسەر وەردەگرن بۆیە خاوەنی صەبرن، خۆڕاگرن لە بەرامبـەر ئـەو بەڵا و موصیبەتانەی كە بەسەریاندێت.

با ئەمڕۆش لە وتاری جومعەدا لە خزمەتی بابـەتێكی تـر بـین، كـە بریتییـە لەوە: (چۆن بتوانین شوكری خوا بكـەین (جـل جلالـه)؟) لـە بەرامبـەر ئـەو نـاز و نیعمەتانەی كە بەئێمەی بەخشیوە..

ئایـا شـوكری خـوا چـۆن دەكرێـت؟ ئەوانـەی كـە شـوكری خـوا دەكـەن چ بەرهەمێكیان لە دونیا و قیامەتدا دەست دەكەوێت؟ وە ئەوانـەی كـە شـوكری خوا ناكەن چ بەڵا و موصیبەتێكیان لە دونیا و قیامەتدا دێتە سەر و، شـوكری خوا چۆنە و بەچی دەكرێت؟

خۆشەویستەکانم، خوای پەروەردگار نیعمەتی زۆری بە ئادەمیزادەکان بەخشیوە کە لەژمار نایەن، خوای پەروەردگار فەرمووی (جل جلاله) ﴿وَآتَاكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ اللّهِ لاَ تُحْصُوهَا﴾ ٣٤- ابراهیم، ئەفەرموێ: هەرچی کە داواتان کردبێ ئەی بەنی ئادەم..، هەرچی کە ئێوە دەتانەوێ و پێتان خۆشە و ئارەزوتان لێی هەیە پێمان بەخشیون! ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ اللّهِ لاَ تُحْصُوهَا﴾ ئەگەر بتانەوێ ناز و نیعمەتەکانی خوا بژمێرن ناتوانن چونکە نیعمەتەکانی خوا لەژمار نایەن وە ئینسان ناتوانێ بیانژمێرێ! لەبەر ئەوە هەتا ئێمە پاداشتی ئەو نیعمەتانە بدەینەوە هێشتا هەر ئێمە قەرزاری (رب العالمین)ین، ئەو دونیایە بۆ تاقیکردنەوە خودا خولقاندویەتی، ئەو ئینسانەش ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی کە بەسەریدا باریون و پێی دراون، هەر بۆ ئەوەیە ئایا ئەو ئینسانە لە موقابل ئەو نیعمەتانەدا چی دەکات؟ ئایا ئەو نیعمەتانە بەهی خودا دەزانێ، یان بەهی خۆی؟... شوکری لەسەر دەکاو پێی رازیە، یان پێی رازی نییە!، ئایا چ جۆرە هەڵوێستێك دەنوێنی بەرامبەر خوای گەورە لەسەر ئەو نیعمەتانە؟، بۆیە خوای گەورە فەرمووی: ﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ ٣- الانسان: ئێمە ئینسانمان هیدایەت داوە -هیدایەت داوە بەمانای هیدایەتی موتڵەق- مانای وایە چاومان پێداوە، گوێچکەمان پێداوە، بینین و بیستن و زمانمان پێی داوە، عەقڵمان پێی داوە، تێگەیشتنمان پێی داوە، رێگای راست و رێگای لارمان بۆ روون کردۆتەوە، ئەوە هیدایەتی (رب العالمین)ە، ﴿إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾، ئینجا ئەو ئینسانە لەو دوو رێگایە یەکیان بەکەیفی خۆی هەڵدەبژێرێ!:

﴿إِمَّا شَاكِرًا﴾: یا بەرێگای شوکرانەدا دەڕوات و شاکیر دەبێت، سوپاسی خودا دەکات و خوا دەناسێ.

﴿وَإِمَّا كَفُوراً﴾: یان سپڵە دەبێ و خوا ناناسێ، ڕێگای چەوت و لار دەگرێت. ڕێگای هەڵدێر دەگرێ، ﴿إِمَّا شَاكِراً وَإِمَّا كَفُوراً﴾ ئەوە دوای چی؟ دوای ئەوەی ﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ﴾ دوای ئەوەی کە ڕێگامان بۆ ڕوون کردۆتەوە و هیدایەتمان داوە، دوای ئەوەی کە ئەو پێداویستیانەمان پێداوە کە (تكليف)ی لەسەر ئەو ئینسانە دادەنێن! بەڵێ ﴿وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ﴾ ١٢- لقمان: جا کەسێك کە بەڕێگای خوا پەرستیدا دەڕوا، بەڕێگای پێغەمبەر دەڕوا ﷺ بۆ بەهەشتێ، ئەوە بۆ قازانجی خۆیەتی، خوا دەوڵەمەندە: ﴿وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ﴾ هەر کەسێك شاکیر و سوپاسگوزار بێت، مسوڵمان بێت، ئەوە بۆ خۆیەتی!

ئەدی ئەگەر کەسێك کافر بێت: ﴿فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ ١٢- لقمان، خوا دەوڵەمەندە، ئەگەر ئێمە سوپاسی خوداش نەکەین خودا سوپاسی دەکرێ! خوا دەوڵەمەندە و نە بە مسوڵمانبونی ئێمە خوا دەوڵەمەندتر دەبێ، نە بە کافربوونی ئێمە خوا لە دەوڵەمەندی و دەستەڵاتی کەم دەبێتەوە!، بۆیە فەرمووی ﴿وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ﴾، ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلا يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ﴾ ٤٤- الاسراء، خوا فەرمووی: هەر حەوت ئاسمانەکان تەسبحاتی (رب العالمین) دەکەن، وە ئەرزیش وە ئەوەش کە تێیاندایە، ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلا يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَكِن لا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ ٤٤- الاسراء: هەموو شتێك تەسبیحاتی (رب العالمین) دەکات بەڵام ئێوە ئەی ئینسان تێناگەن.

بەردەوام وشکانی و دەریا، ئاو و هەوا، شەو و ڕۆژ، ئەستێرەکان، ئاسمان و زەوی، گیاندارەکان، هەموو شتێك، ئەوەی کە روحی لەبەرە، وە ئەوەی کە روحی لەبەر نییە شوکری خودا دەکات. ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلا يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَكِن لا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ ٤٤- الاسراء.

بەڵێ خۆشەویستەكانم: خوای پەروەردگار ئەو ناز و نیعمەتانە كە بە ئێمەی نیشانداوە، خستویەتیە بەر دەستی ئێمە هەمووی بۆ تاقیكردنەوەی ئینسانە. ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الارْضِ جَمِيعاً مِّنْهُ﴾ ١٣- الجاثية.

حەزرەتی سولەیمان ﷺ ئەو هەموو نیعمەتانەی كە خوای پەروەردگار بەسەریدا باراندبوو، ئەوەكە:

(با) بەكەیفی ئەو دەڕۆیشت بۆ هەر كوێیەك بیوستبایە!.

زمانزانی، لەگەڵ هەموو زیندەوەرێكا بە زمانی ئەو تێی دەگەیشت، لە مێرووڵەیەك حاڵی دەبوو كە چی دەڵێ؟!.

(شەیطانەكان)و جنۆكە لەبەردەستی ئەودا كاریان دەكرد!، ئینجا فەرمووی ﴿هَذَا مِن فَضْلِ رَبِّي﴾ ٤٠- النمل: ئەوە لە چاكەی خوایە لەگەڵ من!، ﴿لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ﴾ ٤٠- النمل، ئەوە بۆ ئەوەیە تاقیم دەكاتەوە ئاخۆ ئەمن شوكرانەی خوا دەكەم و خوا دەناسم و ئەو شتانە لە خواوە دەزانم یان لە خۆمیانەوە دەزانم، ﴿لِيَبْلُوَنِي﴾ بۆ ئەوەی تاقیم بكاتەوە ﴿أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ﴾ شوكرانە دەكەم، سوپاسگوزار دەبم، مسوڵمان دەبم، خواپەرست دەبم؟ یا بەپێچەوانەوە ﴿أَمْ أَكْفُرُ﴾، ﴿وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ﴾ ٤٠- النمل، وە فەرمووی: وە هەر كەسێ شوكرانەی خوا بكات بۆ خۆی دەیكات.

بەڵێ خۆشەویستەكانم: بە ئەندازەی ئەوە كە ئینسان شوكری خوا دەكا خوای پەروەردگار ئاشتی و ئارامی و خۆشگوزەرانی و رزق و رۆزی زۆری بۆ دەنێرێ..، وە بە ئەندازەی ئەوەی لە شوكری خوا دوور دەكەوێتەوەو بێ نمەك دەبێ، بێ وەفا دەبێ، سپڵە دەبێ، خوا نا ناسێ، رووی لە ئیسلام و خوا پەرستی وەردەگێڕێ، ئەو نیعمەتانە لە خواوە نازانێ و ئەوكاتە توشی بەلا و نەگبەتی و ناڕەحەتی دەبێ!!، بۆیە خوای پەروەردگار بۆ ئێمەی موسڵمان

دەگێڕێتەوە لە قورئان، دەفەرموێ ﴿وَضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَداً مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللّهِ فَأَذَاقَهَا اللّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ﴾ ١١٢- النحل، واتە: لە زەمانێكدا پێش ئومەتی ئیسلام ئاوەدانیەك بووە خوای گەورە هەموو ناز و نیعمەتێكی خۆی بەسەردا باراندووە، ناز و نیعمەتی زۆر، بەتایبەت دوو نیعمەتی زۆر گەورە لە ژیانی ئادەمیزادا هەن:

- یەكیان ئەمن و ئاسایش كە ئینسان لە خۆی و ماڵی و ناموسی خۆی ئەمین بێ و لە سەروەت و سامانی خۆی و خزم و كەس و كاری خۆی ئەمین بێ و لە ئەمن و ئاسایشدا بژیێ! ئەوە یەك لە نیعمەتە هەرە گەورەكانە.
- دووەهەمیان رزق و رۆزی، ئەوە كە ئینسان نەكەوێتە بەر شاڵاوی گرانی و قات و قڕی و لە فراوانی رزق و رۆزیدا بژیێ.

ئەو دوو نیعمەتە، كە خوای پەروەردگار بۆمان دەگێڕێتەوە لەو ئاوەدانیە لە پێش ئیسلامدا، خوا ئەفەرموێ: ئێمە تاقیمان كردونەتەوە كە ناز و نیعمەتی زۆرمان بەسەردا باراندن، بەڵام!!، ﴿فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللّهِ﴾: ئەوان سپڵەبوون بەرانبەر نیعمەتەكانی خواو رویان لە ئیسلام و لە خوا پەرستی وەرگێرا، ﴿فَأَذَاقَهَا اللّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ﴾ ١١٢- النحل: خوای گەورە هەم جلوبەرگی برسیەتی بۆ ناردن، هەم ترس، واتا هەم ئەو رزق و رۆزیەی لێستاندنەوە..! وە هەم ئەو ئەمن و ئاسایشەی لێ ستاندنەوە سەرئەنجام كەوتنە ترس و برسیەتیەوە. خوای پەروەردگار بۆیە منەت بەسەر ئەهلی مەككەشدا دەكات، دەفەرموێت ﴿فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ ٭ الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ﴾ ٣، ٤- القریش، قورەیش خوای ئەو كەعبەیە بپەرستن كە وەختێك بووە ئەهلی ئەو مەككەیە خوا پاراستونی هەم لە برسیەتی وە هەم لە ترس و ناڕەحەتی و تۆقاندن.

خۆشەویستەكانم: وەعدی خوایە (جل جلالە) بە ئەندازەی ئەوەی ئینسان موسڵمان بێ، تەقوادار بێ و لە خوا ترس بێ و، شوكرانەی خوا بكات خوای پەروەردگار ناز و نیعمەتی خۆی زیاتر بەسەردا دەبارێنێ! وەكو فەرمووی: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ﴾ ٧- ابراهیم، ئەگەر شوكری خوا بكەن خوا بۆتان زیاد دەكات، وە ئەگەر بێ نمەك و سپڵەبن ئەوە خوای گەورە (جل جلالە) عەزابتان دەدات و لێتان ناگەرێت، ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُواْ وَاتَّقَواْ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ﴾ ٩٦- الاعراف، خوا دەفەرموێ، ئەگەر ئەهلی ئاوەدانییەكان -شارو شارۆچكەكان- بروا بێنن و پارێزكاربن، لە ئاسمان و زەوییەوە پیت و پێزمان بۆ فەراهەم دەهێنان، لە شوێنیكی تر دەفەرموێ ﴿فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ ٩٦- الاعراف، ئێمە ئەوانمان گرت بەهۆی ئەو كردەوە ناشیرینەی كە ئەیانكرد، ئەو خورەوشتە بەدو ناشیرینەی كە پیادەیان دەكرد..! جا بە ئەندازەی ئەوەی كە ئێمە لەگەڵ خوا بین خوا حاڵمان خۆش دەكات..بەڵام بەو ئەندازەیەی كە روو لە خوا وەردەگێرین، خواپەرست نەبین، خوا ژیانمان تاڵتر دەكات ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾ ١١- الرعد، خوا حاڵی هیچ قەومێك ناگۆرێ هەتا ئەوان دڵ و دەرونیان نەگۆرن، خۆیان بیر و باوەڕ و قەناعەتی خۆیان نەگۆرن..!.

خوا ئەگەر نیعمەتێكی بەسەر میللەتێك داباراند لێیان ناستێنێتەوە هەتا ئەو میللەتە بۆ خۆی قەناعەتی خۆی نەگۆرێ، هەتا پشت لە خوا نەكات خوا ئەو نیعمەتەیان لێ ناستێنێتەوە، ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّراً نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَى قَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ ٥٣- الانفال.

## بەڵێ خۆشەویستەكان: چۆن شوكرانەی خوا بكەین؟

شوكرانەی خوا بە هەموو ئەندامەكان دەكرێ!، زمان ئەگەر قسە بكات - قسەی خێر بكا- ئەوە شوكری خوایە دەیكا..!، شوكری خوا هەر ئەوە نییە ئینسان بڵێ: ((الحمدُلله)) یا: ((الشُّكر لله)): سوپاس بۆ خوا، بەڵكو هەر قسەیەكی خێر لە زمانی تۆ دەرچێ.. ئەوە بریتییە لە شوكری خوا!، شوكری خوات بەو زمانە كردووە و ئەو زمانە خوا داویەتی بە تۆ باشترین وەفاش كە بەو زمانە دەیدەیەوە خوای گەورە (جل جلاله) بریتییە لەوە كە لە خێردا بەكاری بێنی..

ئەو زمانە ئەگەر لە جیاتی ئەوەی لە جوێن و لە غەیبەت و بوهتان و لە (نمیمة)[35]ی و جاسوسی و فیتنەیی و خەراپەكاری ئینسان بەكاری بێنێ لە قسەی خێر بەكاری بێنێ.. لە چاكسازی نێوانی خەڵكی (إصلاحٌ بینَ النَّاس) و ئامۆژگاریكردنی خەڵك بەكاری بێنی، ئەوە بریتییە لە شوكری خوا بە زمان..!

شوكری خوا بە گوێچكەكان: ئەو گوێچكانە كە خوا پێی داویت ئەگەر گوێی پێ لە ئامۆژگاری بگری و گوێی پێ لە نەصیحەت و وتاری مامۆستایان بگریت و گوێی پێ لە قورئان خوێندن بگری، ئەوە شوكری خوایە بە گوێیەكانت، لە جیاتی ئەوەی گوێی پێ لە غەیبەت بگری، گوێی پێ لە فیتنە بگری، لە جیاتی ئەوەی گوێی پێ لە گۆرانی و هەڵپەڕكێ و مۆسیقا و لە خەراپەكاری بگریت..

بەڵێ وە هەروەها چاوەكانت: ئەو چاوانەی كە قورئانی پێ دەخوێنی، ئەوە شوكری خوایە!، ئەو چاوانە كە تەماشای ئاسمان و زەوی دەكەن و دەڵێن: ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ ١٩١- آل عمران، ئەوە شوكرە بەچاوەكانت! ئەو چاوانەی كە ئینسان كیتابێكی پێ دەخوێنێتەوە و كار

---

[35] واتە قسە هێنان و بردن لە نێو موسڵماناندا.

و وەزیفەی خۆی -وەزیفەی حەلاڵی خۆی- پێ ئەنجام دەدا، زەراعەتی خۆی ئاو دەدات، ئەوە عیبادەتی خوایە بە چاوەکانت!، وە هەروەها دەستەکانت: ئەو دەستانەی کە عیبادەتی پێ دەکەی، ئەو دەستەی کە کاری شەرعی پێ دەکەی، ئەوە هەمووی شوکری خوایە، بە قاچەکانت دەڕۆی بۆ شوێنی پاك..بۆ خزمەتکردنی دین، بۆ خزمەتکردنی موسڵمانان، بۆ راپەڕاندنی کاری شەرعی خۆت، وەزیفەی شەرعی خۆت.. ئەوە شوکری خوایە بە پێیەکانی خۆت ئەنجامی دەدەی!، وە هەروەها دڵ: ئەو دڵەی کە پڕە لە ئیمانی ڕاست و ساغ، کە رازییە بە قەزا و قەدەری خوا، ئەو دڵەی کە قەناعەتی وایە خوای پەروەردگار ئەو ناز و نیعمەتانەی پێداوە ئەوە شوکری خوایە بە دڵ، لەبەر ئەوە شوکری خوا بە هەموو ئەندامەکانی لەش دەکرێت!

خۆشەویستەکانم: یەکەم جۆری شوکری خوا بریتییە لەوە ((**سەلماندنی عەبدایەتیمان بۆ خوا**))، ئەوە کە ئینسانی مسوڵمان بیسەلمێنێ کە عەبدی خوایە، ئەوە شوکری خوایە!، ئێمە عەبدین خوا مەعبودمانە، ئێمە خوا ئەپەرستین.. ئێمە عەبدێکی بێ دەسەڵاتین، خوا خاوەنی پەرستنە، شایانی کرنۆش بۆ بردن و خاوەنی لێ ترسانە، ﴿هو أَهْلُ التَّقْوَى وَأَهْلُ الْمَغْفِرَةِ﴾ **٥٦-المدثر**، هەر ئەو لێمان دەبورێ ئەگەر غەڵەتێك بکەین!، هەر دەبێ پەنا ببەینەوە بەر خوا، خۆ ئەگەر هەڵەیەکمان کرد کێ لێمان دەبورێ؟! کێ لێمان خۆش دەبێ؟! کێ چاوپۆشیمان لێ دەکا ئەگەر خوا نەبێ (جل جلالە)؟! ئەی نابینی خوای پەروەردگار (حەج)ی داناوە؟، هەموو ساڵێك حەجی ماڵی خوای داناوە مزگەوت و ماڵی خۆی لە هەموو شوێنێك و لە هەموو ئاوەدانیەکدا هەیە، مسوڵمان لە نوێژەکانیدا، لە سوجدەکانیدا، لە دوای نوێژەکانی لە خوا دەپاڕێتەوە، داوای لێخۆشبوونی لێ دەکا، ئەوە سەلماندنی عەبدایەتییە بۆ خوا

(جل جلاله) خۆ بەکەم زانینە بەرامبەربە خوا، ئەوە کە ئینسان خوا بەخالیق بزانێ و خۆی بە (مخلوق) بزانێ ئەوە کە خوا (جل جلاله) بە دەستەڵاتدار بزانێ و خۆی بەبێ دەستەڵات بزانێ، خوا (جل جلاله) بە دەوڵەمەند بزانێ و خۆی بەفەقیر بزانێ.. ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاء إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ ١٥- فاطر، خوا فەرمووی: ئەی ئادەمیزادەکان، ئەی خەڵکینە، ئێوە فەقیرن خوا دەوڵەمەندە، خۆتان بەدەوڵەمەند مەزانن!، ﴿وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إلا قَلِيلا﴾ ٨٥- الاسراء، زانیاریەکی کەمم داوە بە ئێوە، خۆتان بە (عالم) مەزانن، بۆیە: ((مَنْ قالَ إني عَالِمٌ فَهو جَاهل)): هەر کەسێك بڵێ من (عالم)م ئەوە جاهیلە، کەس نابێ بە عیلمی خۆی بنازێ، کەس نابێ بە دەستەڵاتی خۆی یان بە زۆرزانی خۆی بنازێ، کەس نابێ بە دەور و بەری خۆی و بە خزم و عەشیرەتی خۆی و قەومی خۆی بنازێ، لەبەر ئەوە خوا (جل جلاله) خاوەنی عیزەتە، خاوەنی دەستەڵاتە، خاوەنی عیلمە، خاوەنی ژیان و مردنە، خاوەنی دەوڵەمەندیە، خاوەنی فەقیریە بۆ ئینسان هەر خوا ئینسانی دەوڵەمەند دەکا، ئینسانی فەقیر دەکا، زۆر کەسمان بینی لە ژیانی خۆماندا سالانێکی زۆر دەوڵەمەندە بەڵام لەناکاو فەقیر دەبێ! کێ فەقیری دەکا؟ بە خۆی خۆی فەقیر دەکا؟ نا خوا، جا یا تاقی دەکاتەوە و ئیمتحانە بۆی یا ئینتیقامە بۆی! یا تۆڵەسەندنەوەیە یان نیعمەتە.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: لەبەر ئەوە کاتێك کە ئێمەی موسڵمان بە قەناعەتەوە باوەڕمان وایە خوا خالیقمانە، رازیقمانە، (مالِك)مانە، مرێنەرمانە، ژیێنەرمانە، رزقدەرمانە، زەرەر و قازانجمان بەدەستی ئەوە، دەوڵەمەندی و فەقیریمان بەدەستی ئەوە، ئەوە شوکرانەی خوایە بەدڵ، کە ئێمە دەیسەلمێنین عەبدی خواین، خوا (صَمَد)ە ئێمە موحتاجین، خوا پێویستی بەهیچ نییە!، ئێمە

پێویستیمان بەخوایە.. ناچارین لێی بپاڕێینـەوە ئەگـەر تـەنگاو بـووین، هـیچ كەسێك نییە پەنای بۆ بەرین تەنها خوا نەبێ (جل جلالـه)، ﴿لا مَلْجَأَ مِـنَ اللّـهِ إِلا إِلَيْهِ﴾ ١١٨- التوبة: كەس ناتوانێ لەبەردەستی خوا رزگـاری ببـێ هـەموومان دەبێ هاوار كەینەوە لای خوا (جل جلاله).

بۆیە حەزرەتی ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام) دەیفـەرموو: ﴿الَّـذِي خَلَقَنِـي فَهـوَ يَهْدِينِ﴾ ٧٨- الشعراء: ئەو خوایەی كە منـی دروسـت كـردووە هـەر ئـەویش رێگای راستم نیشان دەدا.. ﴿وَالَّذِي هو يُطْعِمُنِي وَيَـسْقِينِ﴾ ٧٩- الـشعراء: وە هەر ئەو خوایەیە كە خـواردنم دەداتـێ وە ئاویـشم دەدا..، ﴿وَإِذَا مَرِضْتُ فَهـو يَشْفِينِ﴾ ٨٠- الشعراء: ئەگەر نەخۆشیش بم هەر ئەو شیفام دەدا، ﴿وَالَّـذِي أَطْمَـعُ أَن يَغْفِرَ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ﴾ ٨٢- الشعراء: وە هەر ئەویشە ئەمن ئومێدم وایـە لە رۆژی قیامەتێ لە گوناهەكانم ببورێ، كـەوا بـوو ئینـسان بـەو حەقیقەتـە خـوا بناسێ ئەوە شوكری خوای كردووە، خۆی بە عەبدێكی بێ دەستەڵاتی فەقیر دەزانـێ لە بەرامبەر پەروەردگاری خۆی كە (ربُ العالمین)ـە.

خۆشەویـستەكانم: خـاڵی دووەم، **تەسلیمبوونمان بە ئەمری خوا**.. شوكری جۆری دووەم ئەوەیە كە دوای ئەوەی خوامـان ناسـی و خۆمـان بـە عەبد زانی لە بەرامبـەر ئـەو خوایـە، بـێ دەسـتەڵات لـە بەرامبـەر ئـەو دەستەڵاتدارە، خۆمان تەسلیمی ئەمری ئەو كەین ئـەوە شـوكری خوایـە..! خوای پەروەردگار مەرجی داناوە بۆ ئەوەی كە ئینسان ئیسپاتی بكـات كـە خۆی تەسلیمی ئەو كردووە..

زۆر خەڵك دەڵێ موسڵمانم، بەڵام خوای پەروەردگار مەرجی داناوە ئەوەی كـە دەڵێ: ئەمن خۆم تەسلیمی (ربُ العالَمین) كردوە و بە ئـەمری ئـەو رازیـم دەبـێ شوێنكەوتووی پێغەمبەرەكەی ﷺ ئەو بێ، دەبـێ بـە رێگـای پێغەمبەرەكـەی

ئەودا بڕوات (علیه الصلاة والسلام)، بۆیــە فــەرمووی ﴿قُـلْ إِن كُنـتُمْ تُحِبُّـونَ اللَّـهَ فَاتَّبِعُونِي﴾ ٣١- آل عمران، پێیان بڵێ -ئـەی موحەمــەد ﷺ- ئەگـەر راسـت دەکەن خواتان خۆش دەوێ، شوکری خوا دەکەن و عیبادەتی دەکەن. دەتانـەوێ خوا لێتان رازی بێ ﴿فَاتَّبِعُونِي﴾ بە دوای مندا وەرن، شوێن من کـەون، رێگـای خوام (جل جلاله) گرتۆتەبەر، جـا ئـەو کاتـە دوو نیعمـەتی گـەورەتان بـۆ دێـت: ﴿يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾ ٣١- ال عمران.

یەکەم: ﴿يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾، خوا ئێوەی خۆش دەوێ...

دووهەمیش: لە گوناهەکانتان دەبورێ ﴿وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾، بەڵێ کێ پێـی خۆش نیە خوا لە گوناهی ببورێ؟! کێ پێـی خـۆش نیـە خـوا خۆشـی بـوێ؟! هەموو ئینسانێکی موسڵمان پێی خۆشە، جا ئەگەر کەسێك کە راسـت نـەکات لەگەڵ خوا، درۆبکا لەگەڵ خوا (جل جلالـه) ئەوە پێی خۆش نیە، ئەوە ملی لادەدا لە رێگای شەرع، ئەوە خۆی لادەدا.. ئەمما ئەوی تر هەمووی پێی خۆشە، کـەوا بوو ئەگەر دەمانەوێ خوا خۆشی بوێین، ئەگەر دەمانەوێ خوا لـە گوناهـەکانمان ببورێ، با بەرێگای پێغەمبەر ﷺ بڕۆین، چونکە پێغەمبەر ﷺ بانگمان دەکـاو پێمان دەفەرموێ بەدوای مندا وەرن، بە رێگای سەعادەتدا وەرن، چـونکە ئـەو پێغەمبەرە دەزانێ رێگای سەعادەت کامەیە، ئـەو پێغەمبــەرەی ﷺ موباشـر چۆتە خزمــەت خــودا (جل جلالـه)وە لــەوێ ئامۆژگاریــەکانی وەرگرتــووە!، ئــەو پێغەمبەرە ﷺ، باشترین شاکیر بووە، کە شەو نەخەوتووە لەبەر شـەونوێژ، کـە شـەو نەخـەتووە لەبـەر عیبـادەت، وەختێـك عائیـشە (خـوای لێ رازی بـێ) پێـی دەفەرموێ: یا (رسول الله) ئەو هەموو ماندووبوونە بۆچی خۆ خوای پەروەردگار لــە هــەموو گوناهــەکانت خــۆش بــووە!!، ئەفــەرموێ ﷺ ((أَفَـلا أَكُـونُ عَبـدًا

شَكُوراً))[٣٦]، ئەفەرموێ ئایا عەبدێکی شاکر نەبم؟!، سوپاسی خوا نەکەم بەوەی ئەو عیبادەتە ئەنجام بدەم، جا خۆ ئینسان شەو و ڕۆژی هەموو دەبێ لە شوکرانەی خوای پەروەردگاردا سەرف بکا.. هەموو ڕۆژێ شوکرانەی خوای لەگەڵ خۆدایە!! هەموو شەوێك شوکرانەی خوای لەگەڵ خۆدایە!!، حەقی ئەمڕۆ کە تێیدا دەژیت چییە بیدەینە خوا؟، وەحەقی ئەمشە و کە خوا ڕێگای پێداوین بژین چیە بیدەینە خوا؟، هەر ئەوە نیە کە نوێژەکانی تێدا ئەنجام بدەیت و بەس؛ بەڵکو هەموو ڕۆژێك کە چاوەکەمان ساغە، گوێچکەکەمان ساغە، دەم و ددانمان ساغە، زمانمان سەلامەتە، جسممان سەلامەتە، شوکری خوامان لەسەرە کە لە بەرامبەر خوای پەروەردگاردا ئەنجامی بدەین..، بەڵێ شوکری خوا بە عەمەلی نەك هەر بەقسە، وەکو خوای پەروەردگار بە حەزرەتی (داوود) دەفەرموێ: ﴿اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْراً وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ﴾

١٣- سباء، کەمێك لە بەندەکانی خوا شاکرن، زۆر جێگای تێفکرینە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (کەمێك لە بەندەکانی خوا شاکرن!!) سوپاسی خوا دەکەن و ڕازین بەدینی خوا.. خوا پەرستن، کەمێکن.. بۆ؟! چونکە دیارە شوکری خوا تەنیا بەزمان نیە، شوکری خوا بە (عَمَل)ە، خوا فەرمووی ﴿اعْمَلُوا﴾، ماندوو بن کار بکەن کار کردنتان شوکرە، ﴿اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْراً﴾ ئەو کارکردنە شوکرە، ﴿وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ﴾ بۆیە کەم کەس

---

[٣٦] ((حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ عَنْ زِيَادٍ قَالَ سَمِعْتُ الْمُغِيرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ إِنْ كَانَ النَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيَقُومُ لِيُصَلِّي حَتَّى تَرِمُ قَدَمَاهُ أَوْ سَاقَاهُ فَيُقَالُ لَهُ فَيَقُولُ أَفَلا أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا))، صحيح البخاري، جزء ١، كتاب أبواب التهجد، باب: قيام النبي حتى ترما قدماه، صفحة ٣٧٠، رقم الحديث ١٠٧٨، وأطراف الحديث في البخاري ((٤٥٥٦، ٦١٠٦)). وأخرجه مسلم في صفات المنافقين وأحكامهم، باب: أكثار الاعمال والاجتهاد، رقم ٢٨١٩

وەك پێویست بە عەمەل ئامادەیە خزمەتی دینی خوا بکات، بۆیە ئەفەرمویٚ ﴿وَقَلِيلٌ﴾ کەمن ئەوانەی شوکری خوا بە عەمەل دەکەن، بەڵکو زۆر کەس هەیە بە زمان شوکری خوا دەکا بەڵام بە عەمەل نایکا بۆیە عەجایب نیە ئەو (قليل)ەی ئەمڕۆ لە سەرتاسەری دونیا خەڵکی ناحەق و فاسق و موجریم و زاڵم رقیان لێ بێتەوە!، چونکە دائیمەن قەلیل لەناو (كثير)دا دیارە، کەم لەناو زۆردا زۆر چاك دیارە، جا ئەو (قلیل)ەی شاکیرە کە خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ: ﴿وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ﴾ هەمیشە لەناو خەڵکی زۆردا زۆر دیارە و زۆر دوژمنایەتی دەکریٚ، قانوونی خوایە (جل جلاله): ﴿أَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ﴾ ٧٨- الزخرف، خەڵکی سەر رووی زەوی زۆربە (اكثر)یان رقیان لەحەق دەبێتەوە، ﴿كَم من فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّهِ وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِين﴾ ٢٤٩- البقرة، بەڵام ئەو قەلیلە هەر بەسەر ئەو (كثير)ەدا زاڵ دەبێ بە ئیزنی خوا (جل جلاله)..

خوا دەفەرموێت: وەعدی خوایە (جل جلاله): ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ مَوْلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَأَنَّ الْكَافِرِينَ لا مَوْلَى لَهُمْ﴾ ١١- محمد، ئەو (قلیل)ە ئەگەر خوا لە پشتی بێ نابێ لە هیچ بترسێ، بۆیە عەبدوڵای کوڕی عەباس (خوا لێی رازی بێ) فەرمووی: (عَجِبتُ مِنَ النَاسِ يَخَافُونَ وفي القُرآنِ حَسبِي اللهُ وَنِعم الوَكِيل): عەجایب دەمێنم موسڵمان بترسێ قورئانیش دەفەرمویٚ: ﴿الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاس قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ ١٧٣- آل عمران، ﴿اللّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّوُرِ وَالَّذِينَ كَفَرُواْ أَوْلِيَآؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُوْلَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ٢٥٧- البقرة، هەمیشە خوای پەروەردگار پشتیوانی موسڵمانانە، بەڵام بێ حیکمەت نیە جار جار خوای پەروەردگار موسڵمانی تاقی دەکاتەوە، ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِؤُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ

﴿الْكَـافِرُونَ﴾ ٨- الـصف، خـوا نـووری خـۆی هـەر تـەواو دەكـا، خـوا ئـەو ئیسلامەتیە هەر دەگەیەنێ بە (قِمة)، با كافرەكـانیش پێیـان نـاخۆش بـێ..!، فەرموودەی پێغەمبـەرە ﷺ رۆژێـك دێ ئـەو موسـڵمانانە لەسـەر رووی زەوی جەنگ لەگەڵ جولەكەدا ئەكـەن هـەموو دار و بـەرد شـاهێدی ئـەدا و بـانگی موسڵمانی دەكا: وەرە موسڵمان ئەوە جولەكەیەك لە پاشە من خۆی شاردۆتەوە بیكوژە، (تعالَ یـا عبـدالله هـذا یَهُـوديٌّ خَلفِـي فَاقتلـه)، بـەڵێ ئـەو رۆژە دێ. ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ اللَّهُ وَعْدَهُ وَإِنَّ يَوْماً عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ ٤٧- الحج، خوای پەروەردگاریش وەعدی خۆی دەگەیەنێتەجێ.

بەڵێ خۆشەویستەكانم: كـەوا بـوو شـاكیرەكان ئەوانـەن كـە لەسـەر رێگـای پێغەمبەرن ﷺ ﴿يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَأُوْلَـئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ ١١٤- آل عمـران، كەسێك پشت لـە ئیـسلام كـات زەرەر بـەخۆی دەگەیـەنێ، بـەخوا ناگەیـەنێ ﴿وسيجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِين﴾ ١٤٤- ال عمران: خوا پاداشتی سوپاسگوزاران شاكیرەكان- دەداتەوە. كەوابوو ئەوانـەی سوپاسـی خـوا دەكـەن ئەوانـەن كـە موسڵمانن، ئەوەی كە موسڵمان و خوا پەرست نەبێ، ئـەو نیعمەتانـە لـە خـوا نەزانێ سوپاسی خواشی لەسەر ناكات، خاڵی سێیەم: هـەموو نیعمەتـەكان لە خواوە بزانێت، ئەو نیعمەتانە هـی خۆمـان نیـە! ئینـسان ئەگـەر هەوڵبـدا هەموو دنیا بنۆرێ، مەشریق و مـەغریب بگـەرێ، خـوا شـتێكی بـە نـسیب نەكردبێ بۆی نایێ، ئەگەر بەنی ئادەم رازی بێ بەو بەشـەی كـە خـوای گـەورە پێی داوە، خوا دڵی مورتاح دەكات.! بەڵام ئەگەر رازی نەبێ بـەو بەشـەی كـە پێی داوە ئەو دونیایەی لەسەر زاڵ دەكات ، دونیا هەڵی دەفرێوێنێ ..، چونكە ئەو دونیایە زۆر خەڵكی هەڵخەڵەتانـدووە!! وە پێـت ناگـاو بـۆت نایـێ ئـیللا ئەوەی كە خوا بۆتی نوسیبێ..! لەبـەر ئـەوە پێویـستە مـرۆڤ ئـەو نیعمەتانـە

هەمووی لە خواوە بزانێت ﴿وَآتَاكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ﴾ ٣٤- إبراهيم، خوا فەرمووی، هەرچی کە ئێوە داواتان کردبێ و پێتان خۆش بێ خوا پێی داون، نەیفەرمووە هەروا هاتۆتە بەردستتان و خۆتان بە کردەوەی خۆتان وەدەستتان هێناوە، نا (وآتاکم): خوا پێی داون، (وسخر لکم): خوا خستویەتە ژێر دەستی ئێوە، ﴿هوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الارْض ذَلُولا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾ ١٥- الملك، خوا ئەو ئەرزەی بۆ ئێوە زەلیل کردووە، لەسەری بڕۆن، کەسابەتی لەسەر بکەن، لەبەر ئەوە هەمرزی لە خواوە دەزانێت، خاڵی چوارەمینیش ئەوەیە: کە لە بەرامبەر هەموو ئەو نیعمەتانەدا شوکری خوا بکەین، شوکری خوامان لەسەر فەرزە، جا گەورەترین نیعمەت بۆ بچوکترین نیعمەت، حەزرەتی (داوود) (علیه الصلاة والسلام) پرسیاری کرد فەرمووی: یا (رب العالمین) بچووکترین نیعمەت کە بە ئێمەت داوە چیە؟، خوا فەرمووی، داوود هەناسەیەك هەڵکێشە، حەزرەتی داوود هەناسەیەکی هەڵکێشا، خوا فەرمووی: ﴿هذا ادنی نِعمَتي عَلَيكَ﴾ فەرمووی: ئەوە بچوکترین نیعمەتی منە بەسەر تۆوە، یەك هەناسە، هەناسەکەت بدەوە ئەوە بچوکترین نیعمەتی منە بەسەر تۆوە!، ئایا ئێمەی ئینسان لە ژیانماندا چەند هەناسە هەڵئەکێشین و چەندی ئەدەینەوە؟! چەند قومە ئاومان خواردۆتەوە لەو ئاوە سازگارەی سەر رووی دونیا؟! ئایا ئەوانە هەمووی نیعمەتی خوا نین؟، ئەی نیعمەتە گەورەکان؟، خۆشەویستەکانم: ناتوانین نیعمەتەکانی خوا باس بکەین، بەڵام دەتوانین بڵێین گەورەترین نیعمەتی خوا بریتیە لە (ئیمان).. خوا ئیمانی پێداوین، ئەوە گەورەترین نیعمەتی خوایە! ﴿يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلإيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ١٧- الحجرات، ئەفەرموێ: با منەتم لەسەر نەکەن کە موسڵمان بوون، بەڵکو خوا منەتیان بەسەر دەکا کە هیدایەتی داون بۆ ڕێگای ئیسلام کە ئیمانیان

هێناوە، خوا منەت لەسەر ئێمە دەكا، خوا هیدایەتی ئێمەی داوە، گەورەترین نیعمەت نیعمەتی ئیمانە!، جا بۆیە دەبێ شوكری خوا بكەین كە خوا ئێمەی نەكردووە بە كافر، باوك و باپیرمان كافر نەبوون دوای ئەوە شوكری خوا بكەین لەسەر ئەوە كە (الحمدلله) زاڵمیش نەبووین، خوا لە زوڵمیش پاراستونی.. ئەوەش شوكری دەوێ، ئەدی ئەگەر زاڵم بوینایە؟! چونكە زۆر كەس هەیە موسڵمانە بەڵام زاڵمە، موسڵمانە و باوك و دایكی خۆی ئەزیەت دەدا، ئەوە زوڵمە.. ئەوە گەورەترین زوڵمە كە منداڵێك كوڕ بێ یان كچ، باوك و دایكی خۆی ئەزیەت بدا كە بە دە ساڵ و بە زیاتر فرمێسكیان لەسەری رشتوە و سەرما و گەرمایان پێوە بینیوە، ئەوە زوڵمە كە ئینسانێك ئەزیەتی ماڵ و منداڵی خۆی بدا، موسڵمانیشە و خۆیشی بە موسڵمان دەزانێ و ئەهلی جومعە و جەماعەتیشە، ئەوە زوڵمە كە رێگای كچەكەی ئەدا سەری رووت بێ و لاقی رووت بێ و بەرەڵا بێ و بچێ بۆ ناو پیاوانی بێگانە و لەگەڵ پیاوانی بێگانە هەڵسێ و دانیشێ و بە تەنها بچێتە بازار و بە تەنهاش سەفەر بكا، ئەوە كە كوڕی تەشجیع بكا بۆ خەراپە و خراپەكاری، بینێرێ بۆ خارج بۆ ئەوەی بەناو گوناهاندا تێپەرێ ئەوە زوڵمە، جا دەبێ ئەو موسڵمانە سوپاسی خوا بكات كە خوا لە كوفری دەرهێناوە بۆ ناو ئیسلامەتی هەر چەندە كە زوڵمێ دەكا و زاڵمە، بەڵام كەسێك كە موسڵمانیشە و ئەو جۆرە زوڵمانەش ناكات زۆر شوكری لەسەرە:

یەكەم: شوكری خوا دەكا كە خوای گەورە لە كوفر دەریهێناوە بۆ ئیسلام، لە كافربونەوە بۆ ئیسلام رزگاری كردووە.

دووەمینیش: لە زوڵمەوە بەرە و خوا پەرستی راستەقینە، خوایە ئێمە زۆر شكورین، زۆر سوپاسی تۆ دەكەین كە ئێمەت كردووە بە موسڵمانێك كە (إن شاء الله) زوڵمێ ناكەین، سێیەمینیش شوكری خوا بكا لەسەر ئەوە كە

نەیکردوە بە شوێنکەوتوی زاڵمان، ئاخر ئەوەش زۆر گرنگە!، ئینسانێك کافر نەبێ شوکری خوای دەوێ، ئینسانێك موسڵمان بێ و زاڵم نەبێ شوکری خوای دەوێ، وە ئینسانێك شوێنکەوتی زاڵمانیش نەبێ و تەئیدی زوڵمیش نەکا ئەوە شوکری خوای دەوێ بەڕاستی، کە خوای پەروەردگار وایکردووە ئەو ئینسانەی هیدایەت داوە و دڵی نەرم کردووە، خۆشەویستی خۆی وە خۆشەویستی پێغەمبەرەکەی ﷺ و خۆشەویستی دینەکەی، خۆشەویستی قورئانەکەی و بەهەشتەکەی خستۆتە نێو دڵی ئەو ئینسانە، نەکافر بووە نەزاڵم بووە ئەو ئینسانە، وە نە بەدوای زوڵمێ دەکەوێ ئەوە بەڕاستی شوکری خوای دەوێ.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: شوکری خوا بکەیت لەسەر هەموو ئەو نیعمەتانەی کە خوا پێی داویت، ئەگەر منداڵێك خوا پێی بەخشیویت کچ بێ یان کوڕ بێ دەبێ شوکری خوای لەسەر بکەیت: ﴿أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَاناً وَإِنَاثاً وَيَجْعَلُ مَن يَشَاءُ عَقِيماً إِنَّهُ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾ ٥٠- الشورى، هی وا هەیە خوا کوڕ و کچی دەداتێ، هی وا هەیە خوا بەس کوڕی ئەداتێ، هی واهەیە خوا بەس کچی ئەداتێ، هی وا هەیە هیچیانی ناداتێ، هەمویشی دەبێ شوکری خوای لەسەر بکا!، ئەگەر کەسێك خوای گەورە ئافرەتێکی صالیحە و ئیمانداری داوەتێ دەبێ شوکری خوای لەسەر بکا کە خوای پەروەردگار ئەو ئافرەتەی بۆ هێناوەتە پێش و ئەو ئافرەتە صاڵیحەی داوەتێ، ئافرەتێکی صاڵیحە دەبێ شوکری خوای بکا کە مێردێکی موسڵمانی هەیە! پیاوێکی موسڵمانی هەیە کە بۆ بەهەشت دەستی دەگرێ نەك بۆ جەهەننەم، بۆ ناو مسوڵمانان دەستی دەگرێ نەك بۆ ناو شایی و هەڵپەڕکێ و خەراپە!!، ئەو ئافرەتە دەبێ شوکری خوا بکات کە مێردەکەی دەگەڕێ پاروێ نانی حەلاڵی بۆ پەیدا دەکا نەك پارەی زۆری بۆ دێنێ و لەسەر یەکی دادەنێ و بە حەرام پەروەردەی دەکا، موویەك بەحەڕام پەروەردە بێ ئاگر باشترە بۆی وەکو ئەبوو بەکری صدیق فەرمووی (ﷺ)...

بەڵێ خۆشەویستانم، شوکری خوا بکە لەسەر هەموو ئەو هەوایەی کە پێت دراوە، لەسەر ئەو زەویەی کە لەسەری ئەژی، لەسەر ئەو ئاسمانە کە خوا رۆژی تێدا داناوە، خۆرێك کە روناکیمان ئەداتێ!، مانگ و شەو رۆژ..، لەسەر ئەو هەموو ناز و نیعمەتە، ئەو پێداویستیانەی ژیانی ئینسان کە خوای پەروەردگار (جل جلالە) دابینی کردووە بۆ ئینسانەکان شوکری لەسەر بکا، شوکری خوا بکەین ئێمە بەتایبەت لەسەر ئەو وڵات و مەملەکەتەی خۆمان، کوردستانێکی ئازاد، کوردستانێك کە شوێنێکی وا ئاو و هەوا سازگار زۆر کەمە لە دنیادا!، شوێنی وا هەیە هەر بارانی لێ نابارێ و هەمیشە هەر گەرمە!، چوار فەسڵەکانیساڵی نین، شوێنی وا هەیە هەمیشە هەر زستانە! هەمیشە هەر بەستەڵەکە! ئێمە (موقع)ی جوگرافیمان خوای پەروەردگار وای پێ داوین کە زۆر تایبەتمەندە و هەر چوار فەسڵەکانی ساڵی تێدایە ئەوە شوکری خوای دەوێ بەڕاستی، شوکری خوا بکەین لەسەر وڵاتی پڕ لە مزگەوت و حوجرە و فەقێ و مامۆستا، شوکری خوا بکەین لەسەر ئەو دینەی کە پێمان گەیشتوە لە سەردەمی ئەصحابەوە (ﷺ) وە سوپاسی ئەو صحابانە بکەین و دوعای خێریان بۆ بکەین کە دینی ئیسلامیان هێناوە بۆ ئێمە نەك خوا نەخواستە پێمان وابێ کە کاتی خۆی هاتوون وڵاتیان لێ داگیر کردووین وەکو کەسانێك دەڵێن، بەڵکو دەبێ شوکری خوا بکەین وە سوپاسی ئەو صحابانە بکەین، سوپاسی ئەو کەڵە پیاوانە بکەین کە وڵاتی ئێمەیان بەرەکەتدار کردووە بەهۆی ئیسلامەوە، شانازی بەو ئیسلامەوە دەکەین، شانازی بەدینی باو و باپیرانمانەوە دەکەین کە باوك و باپیرانمان لەسەر ئەوە ژیان وە لەسەر ئەوەش مردن، ئەو عیززەتەش کە ئەو کاتە هەبوو بەهۆی ئیسلامەوە ئێستا فەرموون هەموو وڵاتەکان چیان لێهاتووە؟! لەبەر ئەوەی عیززەتی ئیسلامیان لەدەست داوە، هەموو وڵاتانی عەرەبی ببینە کە چۆن زیللەتێکیان توش هاتووە لە بەرامبەر چەند ملیۆنێك

جولەکە  کە زوڵم لە فەڵەستین دەکا، زوڵم لەو هەموو موسڵمانە دەکا، جا نەك هەر لەبەر ئیسلام بەڵکو لەبەر عەرەبایەتی و قەومایەتی خۆشیان لە وەڵام نایێن، عیززەتی ئیسلام لە کوێ وە بێ عیززەتی ئەمڕۆ لە کوێ!!، کاتێ خۆی —هەر بۆ نموونە دەڵێم— هارونە رەشید (رحمە اللە) خەلیفەی موسڵمانان بوو رۆژێك هاتە دەرەوە هەور بوو لەئاسمان، گوتی: ئەی هەورە ببارە لە هەر کوێیەك لەو دنیایە دەباری ببارە خۆ بەرهەمەکەت هەر دێتەوە لای من!! (أمطري فإنَ لي خَرَاجُكَ): فەرمووی ببارە، خۆ لەهەر شوێنێکی بباری بەرهەمەکەت و بەروبومەکەت دێتەوە بەردەستی من، دەستەڵاتی مسوڵمانان ئاوابوو!!، ئەوە دەستەڵاتی ئیسلام و موسڵمانان بوو..، بەڵام ئەمڕۆ وەرە موقارەنەی بکە لەگەڵ دەستەڵاتی ئەو بەناو موسڵمانانەی کە هەن بۆیە حاڵی مسوڵمانان وایە، بەڵام وەعدی خوایە دەبێ ئەو ئیسلامە و ئەو (قِلة قَلِيلَة)ی کە خوا لە قورئاندا باسی کردووە هەر هەبن، خوای پەروەردگاریش دین لەسەر دەستی ئەوان دێنێتەوە..!

یارەببی خوایە، هیدایەتمان بدەی بۆ ئەوەی ببینە ئەو (قلة وقليلة)ی کە خوای پەروەردگار هەڵی بژاردوون، یارەببی خوایە هیدایەتمان بدەی بۆ ئەوەی عەبدی راستەقینەی تۆ بین خوایە هیدایەتمان بدە بۆ ئەوەی بەوەی کە تۆ لەخۆ رازی کەین، یارەببی خوایە هەرچی خێرە بمانهێنە پێش، ئەوەی کە شەڕ و ناخۆشییە لێمان دوور کەیەوە، یارەببی خوایە خێر و بێر بەسەر وڵاتەکەماندا بباری، یارەببی خوایە وڵاتەکەمان لە ناخۆشی و ناڕەحەتی و بەڵاو موصیبەت بەدوور بگریت.

خوایە وەزعی ئێمە و هەموو موسڵمانانی دونیا چاکتر بکەی یارەببی خوایە ئەو دەرد و بەڵایەی کە بۆ موسڵمانانی دونیا بەتایبەت موسڵمانانی کوردستان

و عێراق و ئەو مەنتیقەیە بەرێودیە خوایە هەموو موسڵمانانی لیّ بپارێزی (یا ربَ العالَمین)، یارەببی خوایە شیفای نەخۆشیەکانمان بێنی، یارەببی خوایە لە مردووەکانمان خۆشبی...

اقول قولي هذا واستغفر الله لي ولكم و لسائر المسلمين فاستغفروه انه كانَ غفاراً، أعوذ بالله من الشيطان الرجيم ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾.

آمين

# نیعمەتەکانی خودا بەسەر ئینسانەوە

﴿وَآتَاكُم من كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوه وَإِن تَعدُّواْ نعْمَتَ اللّه لاَ تحْصوهَا إِنَّ الإِنسانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ ٣٤- إبراهيم

# بسم الله الرحمن الرحيم

انَ الحَمدَ لِلهِ نَحمَدُهُ ونَشكُرُهُ وَنَستَغفِره وَنَستَهدِيه، ونعوذ بِاللهِ مِن شُرُورِ أَنفُسَنا وَسَيئات اَعمَالِنا، مَن يَهدِهِ اللهُ فَلا مُضِل لَـه، وَمـن يـضلِل فَـلا هـادِي لَـهُ..، نَشهَدُ أَن لا الهَ الا اللهُ وحدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، وَنشهَدُ اَن سيدَنا وَنَبينَا محمـداً عَبـدُه ورسوله.. هَذا الرَسُولُ الذِي بَلَغَ الرِسَالَةَ وَأَدَى الامانَةَ وَنَـصَحَ الامَـةَ وجَاهَـدَ فِـي اللهِ حَقَ جِهَادِهِ وَتَركَنا عَلى المحجَةِ البَيـضاء، لَيلُهـا كَنَهارِهـا، لايَزيـغُ عَنهـا الا هَالِك، اَللهُمَ صَلي وَسَلِم وَزِد وَبارِك عَلَى هَذا الرَسُول الكَرِيم وَعَلَى آلِهِ وَأَصحَابِهِ وَالتَابِعينَ وَعَلَى اُمَتِه الى يَومِ القِيامَـة اَجمعِـين... اَمَـا بَعـدُ أُوصِـيكُم عِبـادَ الله وَنَفسِي أَوَلاً بِتَقُوى اللهِ، فانَ اللهَ مع الَذِين اتَّقُوا وَالذِين هـم محـسِنون، قَـالَ اللهُ (سبحانه وتعالى) فِي كِتابِهِ الحَكِيمِ بِسمِ اللهِ الرَحمنِ الـرَحِيم ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِـسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ ١- النساء.

سوپاس و ستایشی بێ پایان و نەبڕاوە بۆ خـوای گـەورە (جل جلالـه) وە درود و سەلام بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ وە بۆ سـەرگیانی یـاوەرانی و شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی قیامەت..، موسڵمانانی بەڕێز: کە خوای پەروەردگار ئێمەی ئینسانی دروست کردووە کۆمەڵێك ماف و نـاز و نیعمـەتی لـە ژمـارە نەهاتووی بەسەردا ڕشتوین وە لە بەرامبەریشدا کۆمـەڵێك واجبـی لەسەرشـان داناوین..، (حُقوق) و (واجِبات) لـە عەدالـەتی (ربُ العـالَمِين)ە (جل جلالـه) هـەم مـافی بە ئینسان داوە، ناز و نیعیمەتی زۆری پێ داون، وە هەم کۆمـەڵێك ئـەرك

و وەزیفەی خستۆتەسەر شان وەکو واجب، بۆچی خوای پەروەردگار ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی لەگەڵ ئێمە کردووە؟، بۆ ئەوەی لە موقابیلدا واجبمان لەسەر دابنێ چونکە لە موقابیلی هەر نیعمەتێکدا پێویستمان بە شوکرێك هەیە بۆ خوای پەروەردگار، نیعمەتەکانی خوای پەروەردگاریش لەژمار نەهاتوون بەڵام ئێمەی ئینسانی زەعیف.. ئێمەی ئینسانی نەفام، کە خوای پەروەردگار کەمێك زانیاری پێداوین[37] کەواتە هەر چەندە زانابین هەر نابێ بڵێین شت دەزانین، ئێمە نەك هەر ئەو واجباتی سەر شانمان بەرامبەر بە نیعەتەکانی خوای گەورە جێبەجێ نەکردووە بەڵکو ئەو ناز و نیعەتانەش نابینین کە خوای پەروەردگار بەسەریدا بارانـدوین!، مافەکانی خۆشمان کە خوای پەروەردگار بەسەریدا باراندووین هەستیان پێ ناکەین، بۆیە بەچاکی دەزانم ئەمڕۆ بچینە خزمەتی ئەو نیعمەتانەی خوای پەروەردگار...، بادڵۆپێك لە دەریای نیعمەتەکانی خوای پەروەردگار بەسەر خۆماندا باس کەین، بۆ ئەوەی ئێمەی ئینسان بەگشتی وە ئێمەی موسڵمانیش بەتایبەتی بزانین چەندە ئێمە قەرزداری (رب العالمین)ین؟!، نیعمەتەکانی خوا (جل جلاله) چین؟، نیعمەتەکانی خوای پەروەردگار بەچی زیاد دەبن یان کەم دەبن لەسەر عەبدەکان؟ وە عەبدەکان لە بەرامبەر خوا، وە لە بەرامبەر ئەو ناز و نعیمەتانەی خوا (جل جلاله) پێویستە چی بکەن؟، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێ (جل جلاله) ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَةَ اللّهِ لاَ تُحْصُوهَا﴾ ١٨- النحل: ئەگەر ئێوە بتانەوێ نیعمەتەکانی خوا بژمێرن ناتوانن، ئەوە تەحەدایەکی (ربُ العالمین)ە بۆ بەندەکان.. هەموو کۆمپیوتەری دونیا کۆبکەوە، هەموو رەقەم حیسابەکانی دونیا کۆبکەوە، هەرچی حیسابزان (محاسب)ی لەسەر رووی ئەم زەویە لە هەموو زەمەنەکان کۆی بکەوە ناتوانێ نیعمەتەکانی خوا بژمێرێ!، چونکە هەر هەناسەیەك لە هەناسەکانی ئەو ژیانە

---

[37] وەکو دەفەرموێ (جل جلاله) ((وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلا قَلِيلا)) ٨٥- الاسراء.

نیعمەتێکە!، هەر دلۆپە ئاوێك لە دلۆپە ئاوەکانی ئەو کەونە نیعمەتێکە!، هەر دەنکە دانەوێڵەیەك بە هەموو جۆرەکانی لەو کەونە نیعمەتێکە!، هەر درەختێك نیعمەتێکە..! هەر وشکانیەك، هەر تەرایەتیەك، ئاسمانەکان، ئەستێرەکان، مانگ و رۆژ، هەموو ئەندامەکانی لاشەی ئینسان، دەست بەرزکردنەوە بۆ خواردن، بۆ ئاوخواردنەوە، هەمووی نیعمەتن!، منداڵ و نەوە و خزم و کەس و عەشیرەت و وڵات و نیشتمان و هەست و نەست و عەقڵ و... ئەوانە هەمووی نیعمەتی خوان کێ ئەتوانێ بیانژمێرێ؟! بێگومان ناتوانین، بۆیە دەڵێین (صَدقَ اللّٰهُ العَظیم)، ناتوانین بیانژمێرین.

خۆشەویستەکانم.. با ئاورێك لە دەوروبەری خۆمان بدەینەوە، هەندێ هەست بکەین بەو نیعمەتە گەورانەی کە خوای گەورە لەگەڵ ئێمەی کردووە.. بۆ ئەوەی بزانین لە موقابیلدا چی پێویستە لەسەرمان، لە نیعمەتەکانی خوای پەروەردگارە ئێمەی بە ئینسان وە بە باشترین شێوە خولقاندووە..! رەخنەت لە خۆت هەیە؟!. بڵێی خوایە حەزم دەکرد چاوەکانم لە پشتی برۆیەکانم بوونایە و برۆیەکانم لە راستی چاوەکانم بوونایە..، چاوەکەم لەجێی کەپوو (لوت)م بوایە و لوتم لە جێگای گوێیەکانم بوایە!، ئایا کەسمان ئەتوانین گۆرانکاری (تغیر)ی ئەو نیزامەی خۆمان بکەین بە چاکتر؟، کەسمان پێمان دەکرێ؟!، نەخێر چونکە خوا دەفەرموێ کە ئێمەی ئینسانی لە باشترین شێوە دروست کردووە: ﴿فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاء رَكَّبَكَ﴾ ٨- الانفطار، ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الانسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ ٤- التین، واتە: بەڕاستی ئینسانمان لە باشترین شێوە خولقاندووە..!

لە نیعمەتەکانی خوای پەروەردگارە بۆ ئێمەی موسڵمان -بە تایبەتی تر- کە ئیمانی پێداوین ئێمەی کردووە بە موسڵمان، دوای ئەوەی بۆ هەموو ئینسانەکان رێگای راست و رێگای هەڵەی روون کردۆتەوە: ﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِراً وَإِمَّا كَفُوراً﴾ ٣- الانسان، خوا فەرمووی: ئێمە رێگای راست و

ڕێگای چەوتمان بۆ عەبدەکەی خۆمان روون کردۆتەوە جا حەزی لێیە با (شاکر) بێ، حەزی لێ نیە با (کفور) بێ، ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ﴾ ٢٩- کهف، ئەوە حەقە لەلای خواوە هاتووە ئیمانە، ئیسلامە، قورئانە، پێغەمبەرە ﷺ ، هەر کەسێك حەزی لێیە با موسڵمان بێ دونیا و قیامەتی هەیە، هەرکەسێك حەزی لێیە با کافربێ نە دونیاشی دەمێنێ نە قیامەتیشی دەبێ!، نیعمەتی ئیمان گەورەترینی نیعمەتە لەسەر رووی زەوی خوای گەورە داویەتی بە موسڵمانان، داویەتی بە ئینسان -بەگشتی-، ئەگەر ئیمانمان هەبێ دونیاشمان هەیە و قیامەتیشمان هەیە، خۆ ئەگەر ئیمانمان هەبێ دونیاشمان نەبێ قیامەتمان هەر هەیە!، بەڵام ئەگەر ئیمانمان نەبێ هەموو نیعمەتەکانی دونیامان هەبێ هیچمان نیە!، خۆشحاڵی بۆ ئەو کەسەی ئیمانداره! خۆشحاڵی بۆ ئەو کەسەی بە مسوڵمانی دەژی و بە مسوڵمانی دەمری، وە بە موسڵمانیش زیندوو دەکرێتەوە و لەژێر بەیداغی (لاالە الا اللە) لە مەیدانی مەحشەر رادەوەستێ، لەسەر حەوزی کەوسەر ئاو بەدەستی موحەمەد دەخواتەوە ﷺ، دەچێتە ئەو بەهەشتەی کە بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) خوای گەورە رازاندویەتیەوە، بەڵام خەجاڵەتی بۆ ئەو کەسەی موسڵمان نیە و ئیمانی نیە، کە دەست بەتاڵ دەبێ لە دونیا وە بەدەست بەتاڵی دەچێتەدەر لە دونیا، دەچێتە ناو چاڵی ئاگرینی ناو قەبر، پاشان لە مەیدانی مەحشەریشدا روو زەردە، تۆز و غوباری بەسەر دەمووچاوی هەیە، خەجاڵەتی بەردەستی خوایە (جل جلالە)، غەرق دەبێ لە عەرەقی رۆژی قیامەت و لە گەرمایی ئەو رۆژە!، کە خۆر یەك میل بەسەر سەری ئینسانەوە دوورە، دەچێتە ئەو جەهەنەمەی کە هەتاهەتایێ ئینسان تێیدا دەمێنێتەوە مادام موسڵمان نەبووە!!.

بۆیە بەڕاستی ئیمان گەورەترین نیعمەتە بۆ ئینسانەکان، دەبێ ئەو نیعمەتە هەست پێ بکەین، ئێمە منەت بەسەر خوا ناکەین (جل جلالە) خوا منەتمان

لەسەر دەكا: ﴿يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلايمَان إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ١٧- الحجرات، خوا ئەفەرموێ: ئەی موحەمەد خەڵكێك منەتت بەسەردا ئەكا لەبەر ئەوەی موسڵمان بووە، پێیان بڵێ خوا منەتتان لەسەر دەكا ئێوەی كردووە بە موسڵمان، ئەگەر ئێوە راست دەكەن بۆ شوكری خوا ناكەن؟!.. بەڵكو دەبێ بڵێین: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلا أَنْ هَدَانَا اللَّهُ﴾ ٤٣- الاعراف، سوپاسی ئەو خوایە دەكەین كە ئێمەی هیدایەت داوە بۆ ئەو ئیمانە، ئەگەر خوا ئێمەی هیدایەت نەدابایە ئەو هیدایەتەمان وەرنەدەگرت!!، هەموومان دەبێ بڵێین (الحمدلله).. دە ئێوەش لەگەڵ من بڵێن (الحمدلله)...

برا بەڕێزەكانم.. یەكێك لە نیعمەتەكانی تر بەسەر ئینسانەوە عەقڵە!، ئێمە زۆرجار بەلای كەسێكدا تێئەپەڕین كە شێت بووە، بۆ خۆمان سكمان بۆی دەسوتێ، بە پەرۆشەوە بۆی دەڕوانین، یا ئەگەر زەمیر و ویژدانمان نەبێ پێی پێدەكەنین، هەر بۆ خۆت بیركەوە ئینسان هەتا شێتێك نەبینێ قەدری عەقڵ نازانێ!.

كە تەماشا ئەكەی پاك و پیسی لێك جیاناكاتەوە و جلی بەری پیسە!، عەورەتی خۆی ناشارێتەوە، بۆ خۆی نازانێ چۆن دەژیێ، نازانێ كێی دۆستە، كێی دوژمنە، كوێ زەرەرە كوێ قازانجە؟! بۆ بیر لەوە ناكەیتەوە كە عەقڵ ئێمەی وا لێ كردووە (زەبت)مان بكا، ئەو عەقڵەی كە خوای گەورە كردوویەتی بە شوانی نەفس ئەگەر نەفس ویستی هەڵەیەك بكا عەقڵ دەبێ جڵەوی بگرێ، عەقڵی چاك ئەو عەقڵەیە كە شوانی نەفس بێ، نەفس پێی خۆش بوو شتێك بكاو پێی توشی دۆزەخ بێ دەبێ ئەو عەقڵە جڵەوی توند بكا نەهێڵێ، بۆیە خۆشەویستەكانم یەكێك لە نیعمەتەكانیش عەقڵە، پاشان یەكێكی تر لە نیعمەتەكان ئەو ئیسلامەیە -كە شەریعەتی ژیانە- دوای ئیمان، ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەیە ﷺ كە خوا ناردویەتی بۆ رزگاری عەبدەكان، ئەو

قورئانەیـە كـە مەصـدەری ژیـانی ئێمەیـە، ژیـانی سـەعادەتمەندی دونیـا و مسۆگەركردنی قیامەت، ئەو شەریعەتە كە ئینسان هەتا نەچێتە ناوی لـەزەتی ماناكانی قورئان نازانێ، نازانێ تامی شەریعەتی ئیسلام چۆنە، هی وا هەیە لە خۆڕا رەخنە لە قورئان دەگرێت رەخنە لە دین دەگرێ، هەتا زۆر كەس لە ولاتی خۆمان بەداخەوە.. لەو ماوەی پێشوو برادەرێك كۆڕی بەستووە -نـاوی نـادەم- گوتویەتی (كێ دەڵێ خوای گەورە راستی كردووە لە قورئان، لەبەر ئەوەی گوایە وتراوە حەزرەتی (موسی) روباری شەق كردووە، كێ باوەڕ بە من دەكا بچمەسەر زێی دوكان و بڵێم رووبارم بۆ شەق بوو؟!).

ئەوە تەحەددایەكی خوایە (جل جلاله)، ئایا ئێمـەی موسـڵمان مـافی ئـەوەمان هەیە كە رەخنە لە خوا بگرین، رەخنە لە قورئان و دینەكـەمان بگـرین؟!! ئـەو دینەی نیعمەتە بۆ ئێمە، بۆیە دەڵێم: هەتا ئێمە نەچینە ناو ناوەڕۆكی قورئـانی پـیرۆز و لـە ماناكـانی حـاڵی نـەبین، نـازانین ئـەو ئیـسلامە چـەندە مـەزن (عظیم)ـە!!، ئەو قورئانە چەندە شیفایە بۆ دەردەكانی ئێمە، وە بۆ (مستقبل)ی دونیا و قیامەتی ئێمە.

خۆشەویـستەكانم ئەوانـە نیعمـەتی خـوان بەسـەر ئێمـەوە بـەلاّم بەداخـەوە هەستیان پێ ناكەین، پاشان: صیحەتی باش، ئینسان تا نەخۆش نـەبێ قـەدری سـاغی نازانـێ، ئـەو صـیحەتە نیعمەتـە، دەسـتت سـاغە، زمانـت سـاغە، گوێچكەت ساغە، چاوت ساغە، بەدەنت سـاغە، ئـەتوانی چـاكە بكـەیت بـە دەست، بە زمان، بە چاو، بە گوێچكە، گوێ لە قسەی باش رابگری، تەماشـای شتی چاك بكەی، شتی چاكت بە دڵ دابێ، بەرامبەر بە خوا بەرامبەر بـە دیـن و بە مسوڵمانان، دڵت غەش و بوغز و حەسـودی تێدانـەبێ، تـوڕەیی و ئینتقـامی تێدانەبێ، ئەوەش چاكەی دڵە، ئەو صیحەتەی كە خوای گەورە بە ئینـسانی داوە بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی دوو نیعمەت هەن ئینسان زۆر لێیان بێ ئاگایە:

یەكیان: **تەندورستی باشە**، لەش ساغییە، ئەوی تریشیان: (الفراغ): ئەوە كە ئینسان بێ ئیش بێ! زۆرجار ئینسان كاتی بە دەستەوە هەیە ئەو بێ ئیشیە ئیستغلال ناكا چاكەی تێدا بكا، دوو ركات نوێژی تێدا بكا و قورئانی تێدا بخوێنی، زیكری تێدا بكا، قسەیەكی خێر، سەردانی نەخۆش، هەموو ئەو خێرانە لە وەختی فەراغدا دەكرێ كە ئێمە قەدری نازانین.

خۆشەویستەكانم: یەكێكی تر لە نیعمەتەكان ئەو رزقەیە كە خوای گەورە بە ئێمەی داوە، لە دانەوێڵە و میوەجات، لە بارانی ئاسمان، خوای پەروەردگار داویەتی، بەڵام ئێمە هەستی پێ ناكەین.. ئێمە برسێتیمان نەبینوە بۆیە نازانین قەدری ئەو وەزعەی ئێمە كە ئێستا تێدا دەژین كە تێرین، نیعمەتی خوایە!!، ئەوانەی كە لە برسێتیدا دەژین و برسێتیان بینیوە دەزانن، ئێستاش لە زۆر وڵاتان بە هەزاران كەس لە برسان دەمرن! بەڵام ئێمە نابینین و هەستی پێ ناكەین بۆیە بۆ خۆمان نازانین وە بیریشی لێ ناكەینەوە..

وەختێك كە خوای پەروەردگار ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ﴾ ٨- التكاثر، -خوا فەرمووی- بە تەئكید لە هەموو نیعمەتێك پرسیارتان لێ دەكرێ رۆژی قیامەت، صەحابەیەك هەڵساوە فەرمووی: (یا رسولَ الله) ﷺ لەچی پرسیارمان لێ دەكرێ لە كاتێكدا ئێمە لەوەتی هەین لە شەڕ و شۆڕداین، لەوەتی هەین نانی گەنمان نەخواردووە ئەویش بە نیوەسكی نانی جۆمان خواردووە، خوا لەوەش پرسیارمان لێ دەكا؟!، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (ئایا ئێوە نابینن نەعلەتان لەپێیە؟، وە ئەوە نابینن كە خوای گەورە ئاوێكی سازگاری پێ داون؟!) فەرموویان: بەڵێ، فەرمووی ئەوە نیعمەتە و لەوە پرسیارتان لێ دەكرێتەوە لە رۆژی قیامەتدا!: (انَّ هَذا النَّعِيم هوَ الذي تُسئَلونَ

عَنهُ يَوم القِيَامَة)[38] ئەی چی بە ئێمە دەگوترێ؟!، ئەی ئێمە چۆن وەڵامــی خــوا بدەینەوە لەو هەموو نیعمەتانەی كە خوا بە ئێمەی داوە؟!، ئەگەر لەسەر ئــەوە ئەصحابی پێغەمبەر پرسیاریان لێ بكرێ لــە رۆژی قیامــەت ئــەی ئێمــە ئــەو هەموو ناز و نیعمەتەی هەمانە!.

پیاوێك بۆی گێڕامەوە كە ریش سپیەكانمان بە بیریان دێت كاتی خۆی بــرنج و ئەو هــەموو میوەجاتــە نــەبووە هــەتا جــۆری مێوەجــاتی ئێــستا هــاتووە بــۆ كوردستانی خۆمان، جاران نەبووە، بە ئەنواعی خواردن و گۆشت و میوەجــات، زستان، هاوین، بــەهار، پــاییز هــەر جــارەی بــە نــەوعێك!!، یــەكێك یــەكێك دەعوەت دەكات دوو سێ نەوعە گۆشتی بۆ حازر دەكا!، دوایــیش پێــی دەڵــێ: كاكە قسورم عەفووكە!.

ئێمەی موسڵمان بەڕاستی زۆر شتمان گۆڕاوە!، جا ئەگــەر میــوانێكم هــات و گۆشتم نەبوو پێم عەیبــە، لــە شــەرمی رووی دەچــم گۆشتیــشی بــۆ دەكــڕم وە لەدوای گۆشتەكەش دەبێ داوای لێبووردنی لێ بكەم نەوەك قسوورم هــەبووبێ!، مەعنای ئەوە نیــە تــۆ خزمــەتی میوانەكــەت مەكــە، بــەڵام ئێمــە بەڕاســتی هەموومان بەگــشتی قــەدری عافیــت نــازانین، نــازانین ئەوانــە هــەموو نــاز و نیعمەتی خوان!، تەماشای سەر گوفەكەكان -مەزبەڵــەكان- بكــە بزانــە چــەند برنج فڕێ ئەدرێ! چەند خواردنی باش فڕێ ئەدرێ! ئەوە هەمووی بەڕاستی ئــەو ناز و نیعمەتانەن كە ئێمە تێیدا مەسئولین رۆژی قیامەت لەمنەوە هەتا ئێوەی بەڕێز.. وەنەبێ كەسمان لەو شتە بەدەربین هەموومان گوناهبارین بــایی خۆمــان لەو مەزوعە، بەڵام دەبێ بەخۆماندا بچینەوە.

---

[38] صحيح مسلم ، كتاب الأشربة ، رقم الحديث ٢٠٣٨

خۆشەویستەکانم، یەکێکی تر لە نیعمەتەکان ئاو و هەوایە!، ئێمە ناتوانین لەسەر ئەوانە بەدرێژی برۆین، بەڵام ئەو ئاو و هەوایە!، سێ دەقیقە هەوات لێ ببڕێ دەمری، تەنها سێ دەقیقە! بۆیە هەر هەناسەیەك نیعمەتە، سێ ڕۆژ ئاو و خواردنت لێ مەنع بکەن دەمری!، ئەو ئاو و خواردنە کە مایەی ژیانی بوونەوەرە نەك هەر ئینسان!، پاشان ئەو مانگەی کە ئێمە بەسەرسەری خۆمانەوە دەیبینین شەوانە، ئەوەیە کە خوای گەورە کردویە بەسەبەبی نیزامی ئاو لە سەر ڕووی زەوی!، ئەو مانگە کە ئەگەر لەزەوی نزیکتر بێتەوە هەرچی ئاوی سەر ڕووی زەویە هەمووی دێتە دەرەوە!، وە ئەگەر لەزەوی دوورتر بکەوێتەوە هەرچی ئاوی سەر ڕووی زەوییە.. بە دەریاکانەوە، بە بەحرەکانەوە، بە کانیاوەکان و ڕوبارەکان، هەمووی دەچنەوە ناو زەوی!..، ئایا ئەو نیزامە کێ دایناوە؟! خوای گەورە بە نیعمەت بۆ ئێمەی ئینسانی داناوە، ئەو تیشکی خۆرە ئەگەر لە دانەوێڵە نەدات وشك دەبێ، شوێنێك کە سێبەر بێ شتی لێ ناڕوێ!، داری لێ ناروێ! ئایا ئەوانە هەمووی نیعمەت نین!، ئەو بوونەوەرە بەگشتی خوای گەورە رزقی هیچ شتێکی لە یاد نەکردووە تەنانەت منداڵێکی ساوا لەبەر مەمکی دایکییەتی خوای گەورە چ جۆرە شیرێکی بۆ ئامادە دەکات، بۆ ئینسان بیر نەکاتەوە؟! تەماشا ئەکەی ئەو بزنە ئەو مەڕە ئەو مانگایەی کە تازە گوێلکەکەی یان بەرخەکەی دەبێ، یان کاریلەکەی لێ بەر دەبێتەوە، خوای گەورە چی ئەداتێ؟!: ﴿لَّبَناً خَالِصاً سَآئِغاً لِلشَّارِبِينَ﴾ ٦٦- النحل، ئەو شیرە چۆن دروست دەبێ؟.. دەفەرموێ: ﴿مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ﴾ ئەو شیرە لە بەینی خوێن و پیسایی دروست دەبێ -سبحان الله- تەماشای گوانی هەر گیاندارێك بکە خوای گەورە لە کوێ دروستی کردوون؟! لەبن سکیەتی! لە بەینی سك و ورگی ئەو حەیوانە (کە پیسایی تێدایە) وە لەبەینی گۆشتەکە و خوێنەکە ئەو شیرە سپییە بەتام و بە لەزەت و ساف و سازگارە کە خوا ئەفەرموێ ﴿لِلشَّارِبِينَ﴾: بۆ ئەوەی کە بیخۆنەوە دروستمان کردووە، بۆ عیبرەت

وەرناگرن؟، تەماشای شیری مەمكی دایك بكە لە كاتێكدا كە تازە منداڵەكەی لە دایك بووە جۆرە شیرێكە شیرێكی ناسك!، ئەها زۆرجار بینیوتانە تازە ئەگەر گیاندار زاووزێ بكا ئەو شیرە تامی لێ نایە، بۆچی؟ چونكە ئەو گیاندارە بچووكە پێویستی بە شیرێكی ناسك هەیە و تەحەمولی هەموو شیرێك ناكات، هی منداڵیش بەهەمان شێوە لە بەرامبەر مەمكی دایكی شیرێكی ناسكی دەوێ شیری هەفتەی یەكەم روونترە و لەگەڵ هەفتەی دووەم فەرقی هەیە!، هەفتەی دووەم بەقوەت ترە ، هەفتەی سێیەم هەروا.. هەفتەی چوارەم.. مانگی یەكەم، مانگی دووەم.. چۆن ئینسان عیبرەتی وەرگرتووە شیری قوتووی داناوە ((تۆز)) ئەوە كە دەڵێن خەتی سەوزە و، ئەوە خەتی سورە و..، ئەوە لە بەر ئەوەیە كە نەوعیەتیان جیایە، ئەوە بەقوەتە، ئەوە بێ قوەتە، منداڵەكە تەحەمول ناكات، -سبحان الله- ئەو جۆرە شیرە!!، ئەو رێكوپێكی نیزامە!، ئینجا لە گەرمەی هاویندا شیری ناو مەمكی دایك فێنكە بۆ ئەو منداڵە!، بۆ ئەوەی تووشی نەخۆشی نەبێ! لە سەرمای زستاندا شیری دایك گەرمە!، بابچین هەموومان تەجرەبە بكەین هەتا ئێستاش دكتۆرەكان سەریان سوڕماوە ئەو شیرەی دایك چەندەها ماددەی تێدایە كە ئینسان ناتوانێ لە هیچ شتێكی تردا ئەو ماددانە بدۆزێتەوە!، بۆ پەروەردەكردنی ئەو منداڵە، كە خوای گەورە لەیادی نەكردووە!.

خۆشەویستەكانم: ئەوە رەحمەتی خوای پەروەردگارە بەسەر ئێمەوە، بەڕاستی ناتوانین نیعمەتەكانی خوا بژمێرین بەسەر خۆمان! لە چیمان كەمە؟! خوا چی پێ نەداوین؟!، جل و بەرگ، جاران -پیاوێك بۆی گێرامەوە- كە لە دێیەك یەك كورتە و شەڕواڵی باشی لێ بووە كە هەموویان بۆ سەفەر وەریان گرتووە! بەڵام ئێمە كێمان هەیە چەند قاتێ جل و كراسی تایبەتی نەبێت؟ وە ئەگەر بۆ چەند سەفەرێك لەبەرمان كرد، دەڵێین: كاكە ئەوە زۆرمان بۆ سەفەران لەبەر كردووە!، بەتایبەت خوشكانی بەڕێز (ئافرەتان)، هی وا هەیە بۆ دوو سێ سەفەر

جلێكی لەبەر كردووە: دەڵێ ئەوە بۆ سەفەرێكی تر نابێ! دەبێ مۆدیلێكی تر بكڕێت هەر مۆدیلێك كە لە ئەورووپاوە دەردەچی ئێمە لێرە لە كوردستانی خۆمان پیادەی دەكەین!، ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی كە خوای گەورە بەسەر ئێمەی داباراندووە! بەوە راناوەستین تەحەدای شتی تر دەكەین یا تەمەننای حەرام دەكەین و جلوبەرگی حەرامیش پەیدا دەكەین بۆ ئەوەی كە پێی تاوانبار بین، بەتایبەت خوشكانی بەڕێز: بەداخەوە كە كەمتر موڕاعاتی ئەوە دەكەن.

جا ئێمەی ئینسان بەڕاستی لە هیچمان كەم نییە وە زۆرجار گلەیی لە (زەمەن) دەكەین، دەڵێین: ئەو بارودۆخە بارودۆخێكی خراپە، بەڵام ئەوە گوناهە، چونكە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ ((لاتسبوا الدَهر فإنَ اللهَ هو الدَّهر))[39] فەرمووی جوێن بەزەمان مەدەن! چونكە خودا زەمەنە جل جلالە.. ئەوەی كە لە درێژایی زەمەن بووە و هەر دەبێ خوایە (جل جلاله)، رەحمەتی خوا لە ئیمامی (شافِعي) بێ كە فەرمووی (نَعِيب زَمَاننَا وَالعَيب فِينَا، وَمَا لِزَمَانِنَا عَيبٌ سوَانَا)، فەرمووی: عەیب لە زەمان دەگرین ئەو زەمەنەش هیچ عەیبی نییە تەنها ئێمە نەبێ! ئێمە زەمەنمان خەراپ كردووە، ئێمە بووینە مایەی ناشیرینكردنی بارودۆخ و زەمەن، كە زەمەن بۆخۆی پاكە و ناشیرین نیە ئێمەی ئینسانین ئەگەر خراپ بووین.. ئەهلی زەمان خەراپ دەبێ نەك زەمەن!، بۆیە بەڕاستی عەیب تەنها لە خۆمانە.

جا خوای پەروەردگار فێڵ لە كەس ناكات! ئەگەر ئەتەوێ نیعمەتەكانت بۆ زیاد بن خوا رێگەی بۆ داناوی، ئەگەر ئەتەوێ نیعمەتەكانت لێ ببڕێن خوا بۆی روون كردوویەوە چۆن ئەو نیعمەتانەت لێ قەتع دەبن.. خوا (جل جلاله)

---

[39] ((عَنْ هِشَامٍ عَنْ ابْنِ سِيرِينَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لا تَسُبُّوا الدَّهْرَ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الدَّهْر))، صحيح مسلم، كتاب الالفاظ من الادب وغيرها، باب: النهي عن سب الدهر، صفحة ٩٨٨، رقم الحديث (٢٢٤٦ — ٥).

فەرمووی: ﴿إِنَّ اللّهَ لا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ وَإِذَا أَرَادَ اللّهُ بِقَوْمٍ سُوءاً فَلا مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَالٍ﴾ ١١- الرعد: خوای گەورە بارودۆخی هیچ قەومێك ناگۆڕێ کە نیعمەتێکی بەسەردا باراندبن هەتا ئەو قەومە بۆ خۆیان بیر و باوەڕ و دەروونی خۆیان نەگۆڕن، هەتا خۆیان خۆیان نەگۆڕن بۆ خەراپە.. وەختێ کە میللەتێك لە چاکەوە بۆ خەراپە گۆڕا خواش نیعمەتەکانی بەسەردا دەگۆڕێ!، بۆیە لە ئایەتێکی تردا فەرمووی لە سورەتی (الانفال) ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّراً نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَى قَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ وَأَنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ٥٣- الانفال: خوا (جل جلاله) کە نیعمەتێکی لەگەڵ قەومێك کردبێ ناگۆڕێ هەتا ئەو قەومە بۆ خۆیان لە خۆیان نەگۆڕن، جا نیعمەتی خوا بەچی زیاد دەبێ بێگومان بە عیبادەتکردن و تەقوا زیاد دەبێ، بە رازیبوون و قەناعەت بە بەشی خوا ئەو نیعمەتانە زیاد دەبن بۆ ئینسان وە خوای گەورە دەیانپارێزێ..، خوای پەروەردگار فەرمووی ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُواْ وَاتَّقَواْ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ وَلَـكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ ٩٦- الاعراف، فەرمووی: ئەگەر ئەهلی ئاوەدانیەکان ئیمان بێنن و تەقوایان هەبێ لە خوا بترسن و روو لە خوا بکەن ئێمە دەرگای خێری ئاسمانەکان و زەوییان لێ دەکەینەوە، قسەی خوایە (جل جلاله)، خۆ (ربُ العالَمین) بێ وەعد نیە لەگەڵ عەبدی خۆی، ئەگەر عەبدەکان روو لە خوا بکەن خوای گەورە دەرگای خێری ئاسمانەکان و زەویان لێ دەکاتەوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ﴾ ٧- ابراهیم: ئەگەر ئێوە ئەهلی قەناعەت بن، شوکرانەی خوا بکەن و سوپاسی خوا بکەن.. مەمنونی خوا بن لەسەر نیعمەتەکان ﴿لأَزِيدَنَّكُمْ﴾: بە ئەتکید بۆتان زیاد دەکەین!.

وەعدی خوایە (جل جلاله) ئەو پارە و موڵکەی کە ئینسان هەیەتی ئەو سەروەت و سامان و مێوەجات و مەڕ و ماڵاتەی کە ئینسان هەیەتی! هی خوایە، ئەگەر

ئێمە شوکرانەی خوای لەسەر بکەین وەلێی ببەخشین و صەدەقەی لێ بکەین، خوا دەزانێ ئەوە ئێمە شاکرین ئێمە بە قەزا و قەدەری خوا بە نیعمەتەکانی خوا، ئەوکاتە خوا بۆمان زیاد دەکا.. بۆیە پێغەمبەریش فەرمووی (علیه الصلاة و السلام): ((ماڵ لە صەدەقەدا کەم نابێ، وەصەدەقەش لەماڵ کەم ناکاتەوە)) بۆیە ئێمە هەتا خاوەنی صەدەقەبین، خوای گەورە بەرەکەت زیاتر لەماڵ و سامانمان زیاد دەکات خوای گەورە دەفەموێ ﴿ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ﴾ ٧- ابراهیم، فەرمووی: ئەگەر ئێوە کوفرانەی نیعمەتی خوای بکەن، نیعمەتەکانی خواتان لەیاد نەبێ و نا سوپاس بن ئەوە بزانن عەزابی خوای گەورە زۆر بە ئێش و ئازارە!!.

خوای گەورە وەکو باسم کرد، منەتی بەعیبادەتی ئێمە نییە! بێ ئیحتیاجە لەو عیبادەتەی ئێمە، ئێمە مەمنونین، ئێمە موحتاجین بەو عیبادەتە چونکە ئەگەر ئێمەش عیبادەت و تەسبیحاتی (رب العالَمین) نەکەین ئەوا بوونەوەر هەمووی عیبادەت و تەسبیحاتی خوا دەکا!، خوای پەروەردگار دەفەرموێ ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالارْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلا يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيماً غَفُوراً﴾ ٤٤- الاسراء، هەر حەوت ئاسمانەکان و ئەرز و هەرچی تێیاندایە تەسبیحاتی خوا دەکا، بەڵام ئێوە لە تەسبیحاتی ئەوان ناگەن!.

جێگای تێفکرینە!!، ئەوانەی قورئان خوێنن دەزانن، ئەوانەی کە عەرەبی دەزانن، خوا (جل جلالە) فەرمووی: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ﴾، وشەی (مِن)ی بۆ داناوە!، واتە هەموو ورد و درشت دەگرێتەوە و هیچ شتێك لێی بەدەر نیە، هەموو لەو کەونە تەسبیحاتی (رب العالَمین) دەکا، تەسبیحاتی شتی (جماد) وشتی (قسە نەکەر)یش رازیبوونە بە قەزا و قەدەری خوا!، ئەو شاخە رازییە بەوەی کە خوا

کردوویەتی بە شاخ! ئەو ئاوە رازیە! ئەو بەڕ و بەحرە رازیە! ئەو ئاسمانە رازیـە! ئەو ئەستێرانەی لە ئاسمان دەخولێنەوە، شەو و رۆژ.. ئەوانە هەمووی رازیـن بـە قەزا و قەدەری خوا! شوکری خوا دەکەن!، بۆیە بەڕێزان: خوای گەورە پێویستی بە عیبادەی ئێمە نیە.. ئێمە پێویستیمان بە فەزڵی خوایە.. پێویستمان بەوەیە کـە خوای پەروەردگار (جل جلاله) بمانبات بۆ بەهەشت..

خوای پەروەردگار دەفەرموێ ﴿وَضَرَبَ اللّهُ مَثَلا قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَداً مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللّهِ فَأَذَاقَهَا اللّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ﴾ ١١٢- النحل، خـوای گـەورە باسـی قـەومێکمان بـۆ دەگێڕێتەوە (شارێك کە لە پێش ئیسلامدا هەبووە) ئەفـەرموێ: خـوای گـەورە هەموو ناز و نیعمەتێکی لەگەڵ کردن: ئەمن و ئاسایش کـە نیعمـەتی خوایـە، لەگەڵ رزق و رۆزی کە نیعمەتی دووەمـی خوایـە (جل جلاله)، چـونکە ئـەو دوو نیعمەتە زۆر گەوردن!، یەکەم: ئینسان لە خۆشیدا بژی و ترسـی لەسـەر نـەبێ، دووەم ئینسان فەقیر نەبێ، ئەوە دوو نیعمەتی گەوردن لە ژیانی ئینساندا، دوای ئیمان و ئیسلام!.. بۆیە خوای پەروەردگار فـەرمووی: رزق و رۆزیـان بەسـەردا باراندبوون، وە ئـەمن و ئاسایـشمان بـۆ ناربوون، بـەڵام ئـەوان پـشتیان لـە نیعمەتەکانی خوا کرد و وازیان لە شوکرانە بژێری نیعمەتەکانی خـوا (جل جلاله) هێنا، بۆیە: (فَأَذَاقَهَا اللّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ) خـوای گـەورە جلوبـەرگی برسێتی و ترسیەتی بۆ ناردن، ئەو دوو موصیبەتە:

- یەکەم: برسێتی.

- دووەم: تـرس (خـوف)ی بـۆ نـاردن، ئـەوەش بـەهۆی کەسـابەتەکەیان و کردەوەکانیانەوە جا ئێمە بە ئەندازەی ئەوەی کە شوکرانەی خوا دەکەین خوا:

- یەکەم: لە موصیبەتەکەمان کەم دەکاتەوە.

- دووەم: لە نیعمەتەکانیشمان زیاد دەکات، بەداخەوە زۆرجار کە برایەکمان نەخۆش دەبێ، خۆشکێکمان کە نەخۆش دەبێ (صبر)ی نییە و ئیمانی بایی ئەوەندە نیە، ناشوکری دەکا و ناشکور دەبێ کە چەند ساڵە نەخۆشە یان چەند رۆژێکە نەخۆشە و سەری دێشێ و وەزعی نارەحەتە، یا ئافرەتێك بەدەست منداڵەکانی ناشوکریەك دەکا، دەڵێ: بۆ من هەروام؟! یا خوایە بۆ وەزعم چاناکەی؟، یا خوایە تا کەنگێ؟، ئەوانە هەمووی ناشوکریە کە بەداخەوە زۆرجار خوشکانمان ئەوەیان بەسەر زماندا دێ، جا ئەو ئینسانە (ئەگەر پیاوە وە ئەگەر ژن) ئەگەر نەخۆش بێ یا خاوەنی موصیبەتێك بێ، زۆرجار تەحەمولی ناکا، قسەیەك دەکا خوای گەورە لە خۆی دەرەنجێنێ، ئەوەش بەڕاستی پێویستە خۆمانی لێ بپارێزین و پێویستە ئارامگربین لەسەر ناخۆشیەکان.

ئینجا لە کۆتاییدا دەڵێم، چی بکەین بۆ ئەوەی خوای گەورە لێمان رازی بێ؟.. رازی بێ لە بەرامبەر ئەو نیعمەتانەی کە بە ئێمەی بەخشیووە و لەژمار نایەن!، ئێمە لە وتاری ئەمڕۆی جومعەدا تەنها نیعمەتەکانمان جۆرێك سەرژمێر کردن ئەوەی کە لە بەرچاومانە و بەزەقی دەیبینین..ئەگەرنا نیعمەتی خوا سەرژمێری ناکرێن! خۆ ئەگەر بچینە سەر باسکردنی هەر نیعمەتێك لەو نیعمەتانە ئەوە هەر یەکێك لێیان وتارێکی جومعەی دەوێ!! بۆیە دەڵێین: لە بەرامبەر ناز و نیعمەتی خوای گەورەدا ئێمە دەبێ:

١) عەبدایەتیمان بۆ خوای گەورە چاك بێ، چونکە خوا فەرمووی ﴿فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ ★ الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ﴾ ٣،٤– القريش، بە ئەهلی مەککە دەفەرمووێ: دەبا ئەو خوایە بپەرستن، خوای ئەو کەعبەیە کە ئەوانی رزگار کرد لە برسیەتی وە رزگاریکردن لە ترس، ئەو دوو ناز و نیعمەتەی بۆ ناردن کە رزق و رۆزی و ئەمن و ئاسایشە، خوای گەورە ئەو ناز

و نیعمەتانەی بە ئێمە داوە لە موقابیلدا عیبادەتی چاکی دەوێ چونکە ئەوە واجبی سەرشانمانە: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالانسَ إِلا لِيَعْبُدُونِ﴾ ٥٦- **الذاريات**، واتە: جنۆکە و ئینسانم تەنیا بۆ پەرستنی خۆم دروستکردوون.

٢) پاشان، تەبلیغی ئەو دینە: ئەو دینە دینی خوایە، ئەو دینە رابگەیەنن، خوا فەرمووی ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾ ١١- الضحى: لە بەرامبەر ئەو نیعمەتانەی کە بۆ تۆم ناردووە ئەی موحەمەد ﷺ وە بۆ ئوممەتەکەی تۆم ناردووە ئێوە دینی خوا راگەیەنن، (فَحَدِّثْ): تەبلیغی دینی خوا بکەن!، دینی خوا بۆ خەڵك راگەیەنن، ئەو ناز و نیعمەتە بە شوکری کردەوە (عَمَل) وەڵام بدەنەوە..

٣) یارمەتیدانی دینی خوا، خزمەتی دینی خوا، خزمەتی موسڵمانان، خوا ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونوا أَنصَارَ اللَّهِ﴾ ١٤- الصف: ئەی ئیماندارینە دینی خوا سەرخەن، کە بەداخەوە ئێمەی موسڵمان، هەموو شتمان وەبیربێ ئێستا کەمتر بیر لەوە دەکەینەوە سەر خستنی دینی خوا چۆن دەکرێ؟! چۆن دینی خوا سەر بخرێ؟! خوای گەورە ئێمە تاقی دەکاتەوە ئەفەرموێ دینی خوا سەرخەن، یارمەتی دینی خوا بدەن خزمەتی دینی خوا بکەن بەڵام بەداخەوە کە ئەمڕۆ لە سەرتاپای دونیا ئەگەر کەسانێك بیانەوێ خزمەتی دینی خوا بکەن یان کۆببنەوە لە دەوروبەری یەك.. بە ناوی ئیرهاب و تیرۆریست تۆمەتبار دەکرێن، ئەوکاتە ئێمەش دەڵێین دەی با نەکەوینە ناو ئەو تاوانبارانە.. یان دەستمان بەکڵاوی خۆمان گرتووە (با) نەی با، بێدەنگی لێ دەکەین!! جا خۆ لەبەر خاتری کوفر و دوژمنانی ئەو دینە دەست لە دینی خوا هەڵناگرین! دینی خوا خزمەتی دەوێ و ئەمانەتە بەسەر شانی موسڵمانانەوە، دینی خوا هەموو قورئانە هەر ئایەتێك نییە!، هەموو قورئانی پیرۆزە، وە خوا دەزانێ ئێمە پێمان دەکرێ بۆیە فەرزی کردووە.

لەبەر ئەوە بەڕاستی سەرخستنی دین،، خزمەتی دین، خزمەتی موسڵمانان بەكشتی لە هەر وڵاتێك لە وڵاتاندا هەبن ئەوە واجبی سەر شانی ئێمەیە، پاشان:

٤) شوكری خوا بە((دڵ))، شوكری خوا بە((دەست))، شوكری خوا بە((زمان))، وەكو خوای پەروەردگار داوا لە حەزرەتی (داوود) دەكا و ئەفەرموێ: ﴿اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْراً وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ﴾ ١٣- سبأ، ئەی (ال داود) شوكری خوا بكەن بەعەمەل، بەعەمەل ئیسپاتی بكەن كە شوكری خوا دەكەن، كە لە موقابیل هەر ناز و نیعمەتێكدا شوكرێكتان لەسەرە، حەزرەتی داوود پرسیاری كرد (یارب العالَمین) گچكەترین نیعمەتی تۆ چیە بەسەر منەوە؟، خوا فەرمووی: (تنَفّس) ئەی داوود نەفەس بكێشە...، نەفەسێكی هەڵكێشا و خوای گەورە پێی فەرموو: (هَذا اَدنی نِعمَتِی عَلَیك) فەرمووی: ئەوە گچكەترین نیعمەتی منە لەسەرە تۆ!!، یەك نەفەس!!!.

تەماشاكە ئەمە دەرسی تێدایە: یەك نەفەس كە هەڵیكێشا ئەگەر خوای گەورە نەیداتەوە دەمرێت!، یەكجار ئینسان نەفەسی راكێشا ئەگەر خوای گەورە نەفەسەكەی نەداتەوە دەمرێ!، پێویستی بە یەك نەفەس هەیە!، ئەو نەفەسەی هەڵكێشا پێویستی بەنەفەسێكی تر هەیە، وە هەروەها...، جا تەماشا بكە ئەو نیعمەتانە لە شەو و رۆژێكدا چەند دووبارە دەبنەوە!!، فەرمووی ئەوە گچكەترین نیعمەتە كە تۆ هەستی پێ دەكەیت! ئەدی ئەو ناز و نیعمەتانەی كە هەستی پێ ناكەیت؟!، پێغەمبەر ﷺ بەصەحابەیەك (كە پرسیاری كرد نیعمەتەكانی خوا چی و چین؟) فەرموو: چاوت لەسەر یەك دابنێ، كە چاوی لەسەریەك دانا، فەرمووی بیر بكەرەوە... یەعنی چاو لەسەر یەك دابنێ یان بیر بكەوە بزانە نیعمەتەكانت لە ژیاندا چین؟ یان ئەگەر خوای گەورە ئەو چاودت هەڵنەهێنێتەوە چی دەكەی؟!!

ئینسان لە موقابیلی ئەوە كە چاوێكی هەبێ لە دونیا چ دەكات؟! نازانێ چۆن بیهێنێتەوە ئەگەر چاو كوێربوو؟! بۆیە خوای پەروەردگار وەبیرمان دێنێتەوە نیعمەتی شەو و ڕۆژ، دەفەرموێ ﴿أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَداً إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَاء أَفَلا تَسْمَعُونَ﴾ ٧١- القصص، واتە: ئەگەر خوای گەورە ئەو ڕۆژەتان لێ بستێنێتەوە تا ڕۆژی قیامەت (ڕۆژ نەیەتەوە و هەموو دونیا هەر شەو بێ) كێ هەیە ڕوناكیتان بۆ بهێنێتەوە و ڕۆژتان بۆ بكاتەوە؟ ئایا ئێوە نابیستن؟! وە فەرمووی: ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ النَّهَارَ سَرْمَداً إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلا تُبْصِرُونَ﴾ ٧٢- القصص، واتە: ئەگەر خوای گەورە شەوتان لێ بسێنێتەوە تا ڕۆژی قیامەت و دونیا هەمووی هەر ڕۆژ بێ كێ هەیە شەوتان بۆ بهێنێتەوە تێیدا ئیسراحەت بكەن؟ ئەی ئێوە نابینن!!؟ لەبەر ئەوە، ئەوە هەمووی نیعمەتی خوای پەروەردگارن بەسەر ئێمەوە بەڵام ئێمە هەستیان پێ ناكەین، جا ئێمەی موسڵمان بەڕاستی دەبێ بەزمان -بە لای كەمەوە- شوكری خوا بكەین، زیكری خوا زۆر بكە ئەوە شوكری خوایە! (الحمدالله) زۆر بڵێ لە ژیاندا. (سبحان الله وبحمده) زۆر بڵێ، (سبحان الله العظيم) زۆر بڵێ، (لا اله الا الله) زۆر بڵێ، (أستغفر الله) زۆر بڵێ بەو مانایەی كە ئینسان قەرزداری خوایە (جل جلاله).. (أستغفر الله) یانی خوایە من پەشیمانم و قەرزداری تۆم تۆ خاوەنی عەفوو و مەغفیرەتی و داوای لێخۆشبونت لێدەكەم، جا ئەگەر بمانەوێ خوا لەخۆ ڕازی بكەین، بەرامبەر ئەو نیعمەتانەی كە خوا پێی داوین دەبێ شاكیر بین: ﴿اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْراً وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ﴾ ١٣- سبأ، خواش (جل جلاله) فەرمووی كەمێك لە بەندەكانی من شوكرانە بژێرن!...

یاڕەببی خوایە لێت دەپاڕێینەوە، وە دەڵێین لەو كەسانەمان حیساب بكەیت كە شاكیرن، یاڕەببی خوایە لەوانەمان حیساب بكەیت كە شوكرانە بژێرن و

هەست بە ناز و نیعمەتەکانی تۆ دەکەن، یارەببی خوایە عیبادەتی ڕاستەقینەمان پێ ببەخشی، یارەببی خوایە فەهمێکی (صحیح) و تێگەیشتنێکی ڕاستەقینەمان لەو دینە پێ ببەخشیت.. یارەببی خوایە خۆشەویستی خۆت و پێغەمبەرەکەت و قورئانەکەت لە دڵمان بچەسپێنی، یارەببی خوایە خۆشەویستی هەموو مسوڵمانانی دونیا لە دڵماندا بچەسپێنی، یارەببی خوایە ڕزگارمان بکەی لە هەموو بەلاّ و موصیبەتێك کە لەو سەردەم و بارودۆخەدا گیرۆدەی ئێمە و هەموو موسڵمانانی دونیا دەبێ، یارەببی خوایە هەرچی موسڵمانە لەسەر ڕووی زەوی لە بەلاّ و موصیبەت ڕزگاری بکەی، خوایە لە ناخۆشی و ناڕەحەتیەکان بیپارێزی، یارەببی خوایە ئێمەش و هەموو موسڵمانانی دنیا لە دەستی تاغوتان و کافر و مولحیدان بپارێزی..

اقول قولي هذا واستغفر الله لی ولكم و لسائر المسلمين فاستغفروه انه كانَ غفاراً، أعوذ بالله من الشيطان الرجيم ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾.

آمين

# دڵی ئینسان

قال رسول الله ﷺ:

((الا انَ فِي الجَسَدِ مُضغَةً اذَا صَلَحَت صَلَحَ الجَسَدُ كَلهُ وَاِذا فَسَدَت فَسَدَ الجَسَدُ كُلهُ.. اَلا وَهِي القَلب)) رواه البخاري.

# بسم الله الرحمن الرحيم

انَ الحَمدَ لِله نَحمَدُهُ ونَشكُرُهُ وَنَستَغفِره وَنَستَهديه، ونعوذ بِالله مِن شرورِ أنفُسَنا وسيئات اَعمَالِنا، مَن يَهدِه اللهُ فَلا مُضِل لَه، وَمن يُضلل فَلا هادِي لَهُ..، نَشهَدُ أن لا الهَ الا اللهُ وَحدَهُ لاشَريك لَهُ، وَنشهَدُ اَن سيدَنا وَنبينَا محمداً عَبده ورسولهُ.. هَذا الرَسُولُ الذِي بَلَغَ الرِسَالةَ وَأدَى الامانَةَ وَنَصحَ الامَةَ وَجَاهَدَ في اللهِ حَقَ جِهَادِهِ وَتَركَنا عَلى المحجَةِ البَيضاء، لَيلُها كَنَهارِها، لايَزيغُ عَنها الا هَالك، اللَهُمَ صَلي وسَلم وَزِد وبارِك عَلَى هَذا الرَسول الكَرِيم وعَلَى آلِه وَأصحَابِه وَالتَابِعينَ وَعَلَى اُمَتِه الى يَومِ القِيامَة اَجمعِين... اَمَا بَعد أوصِيكُم عِبادَ الله وَنَفسِي أَوَلاً بِتَقوَى الله، فانَ اللهَ مَعَ الَذِينَ اتَّقُوا وَالذِينَ هُم محسنون، قَالَ اللهُ (سبحانه وتعالى) فِي كِتابِهِ الحَكيمِ بِسمِ الله الرَحمنِ الرحِيم ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ ١– النساء.

ئیماندارانی بەڕێز، شوێنكەوتوانی پێغەمبەری پێشەوا حەزرەتی موحەممەد ﷺ، ئیسلام كە خوای پەروەردگار وەك بەرنامە و پەیڕەوی ژیان بۆ ئادەمیزادەكانی ناردووە بریتییە لە سێ بەشی سەرەكی كە:

یەكەمیان: عەقیدە و بیروباوەڕ.

دووەمان: خوا پەرستییە..

سێیەمینیان: خوو ڕەوشتە، عەقیدە و بیروباوەڕیش بریتییە لەو ئیمان و قەناعەتە كە بە هەرسێك جۆری ئەندامەكان پیادە دەكرێ.. یەكەمیان دڵە، وە

پاشان زمانه و پاشانیش هەموو ئەندامەكانی ترن، وەكو زانایـان فەرموویانـه: (الایمانَ هو التَّصدِیق بِاالجَنان و الاقرَارُ بِاللِّسَان والعَمَلُ بِالارکَان): ئیمان بریتییـه لـەو قەناعـەت و بـیرو بـاوەڕەی كـه لەدڵـدا جێگیردەبـێ، ئیمـان بـەخوا، وە بەبەرنامـەی خـوا، ئیمـان بـه پێغەمبـەران (علیهم السلام)، وە ئیمـان بـه مەلائیكەتەكانی خوا، ئیمان به كیتابەكان، وە به ڕۆژی دوایی، وە بـه قـەزا و قەدەر، ئیمان به روكنەكانی ئیسلام وە ئیمان بەتەواوی، ئیسلامەتی شتێكه له دڵدا جێگیر دەبێ، بۆیـه دڵ مەركـەزێكی حەساسـه لـەناو ئەندامـەكانی تـری لەشی ئینساندا، لەبەر ئەوە دەمەوێ ئـەمڕۆ باسـی (دڵ) بكـەین لـه ڕوانگـەی قورئانەوە، وە له ڕوانگەی ئیسلامەوە....

جیاوازی دڵی ئیماندار لەگەڵ دڵی بێ بڕوایان، دڵـی ڕەق و دڵـی نـەرم، دڵـی ڕوون و دڵی ڕەش، ئەو دڵانەی كه نووری ئیسلامیان تێدایه وە ئەو دڵانـەی كـه نووری ئیسلامیان لێ دووره چ جیاوازیەكیان هەیه؟ وە دڵەكان چـۆن چارەسـەر دەبن؟، خۆشەویستەكانم: پێویسته بزانین ((دڵ گـەورەترین ئەندامـه لـه لاشـەی ئینساندا)) وە پیرۆزترین وەزیفەی هەیه! كه بریتییه له خوێن بەڕێكردن و خوێن هێنانەوە، زۆر حەسساسه!!، وە زۆریش ناسكه!، زۆرجار دەگوترێ فلانـه كـەس مرد و دڵی ڕاوەستا، دڵ ئەگەر ڕابوەستێت ئینسان دەمرێـت، دڵ بـەردەوام لـه لاشەی ئینساندا خوێن دەبا و خوێن دەهێنێتەوە، یەكجار بڕوات و نەگەڕێتـەوە ئینـسان مـردوە!، دڵ زۆر حەسـساسه لـەناو ئەندامـەكانی لەشـی ئینـساندا، ئینـسان زۆر زەعیفـه لـه ڕوی دروسـتبوونییەوە، خـوای پـەروەردگار زۆر بـه زەعیفی خولقاندووە: ﴿نَحْنُ خَلَقْنَاهُمْ وَشَدَدْنَا أَسْرَهُمْ وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَا أَمْثَالَهُمْ تَبْدِيلًا﴾ ٢٨- الانسان خوا فەرمووی: ئینسان به زەعیفـی خولقـاوە! ئینـسانێك كه خۆی پێ زۆره و (تَكَبُّر) بەسەر زەوی لێ دەدا و لاف و گەزاف دەكا و پێیوایـه نامرێ و به دونیا كەیف خۆشه و گوریسی لەبن دونیا ڕاخستووە.. ئـەو ئینـسانه

خۆی لە خۆیدا زۆر زەعیفە، بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ ﴿فَلْيَنظُرِ الانسَانُ مِمَّ خُلِقَ﴾ ٥- الطارق: با ئینسان سەیر بکات کە لە چ دروست کراوە؟!،

بەڵێ بەڕێزان: دڵ گەورەترین ئەندامە لە ئینسان وە پیرۆزترین وەزیفەشی هەیە، بەڵکو شوێنی خۆشویستن و ڕق لێبوونەوەیە، خۆشەویستی بە دڵ دەبێ و ڕق لێبوونەوەش هەر بەدڵ دەبێ؟! دوای ئەوە، مەرکەزی پەسەندکردنی بڕیارە! مێشك بیردەکاتەوە تەوجیە دەنێرێت پاشان دڵ تەصدیقی دەکات، مێشك بڕیار دەردەکا بەڵام بۆ پەسەند (تَصدِیق)کردنی پێویستی بەدڵ هەیە، دڵ دەبێت بڕیار بدات بکرێت یان نەکرێت، زۆرجار خەیاڵێکت بۆ دێ، بە مێشکت بیر لە شتێك دەکەیەوە ئەو مێشکە (تَوجِیە) دەدات و دەیداتە دڵ، ئەو دڵە ئەگەر قەناعەتی پێ هەبوو بڕیارەکەی جێبەجێ دەکا و ئەگەر قەناعەتی پێ نەبوو ڕەتی دەکاتەوە! ئەو خەیاڵە، ئەو بڕیار و وەهمە کە لە مێشکدا هەیە ڕەتی دەکاتەوە.. کەوا بوو دڵ مەرکەزی تەصدیقە بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((التَقوَى هَهُنَا)): تەقوا ئالێرەیە -ئیشارەتی بۆ ناو سینگی پیرۆزی خۆی کرد ﷺ- بەڵکو دڵ مایەی سەرکەوتن و تیاچوونی ئینسانە، تەماشاکەن پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ، ((الا انَ فِي الجَسَدِ مُضغَة اذا صَلَحَت صَلَحَ الجَسَد كَلهُ وَاذا فَسَدَت فَسَدَ الجَسَدُ كُلهُ.. اَلا وَهِي القَلب))[٤٠] واتە: ئاگاداربن پارچە گۆشتێك لەناو لاشەی ئینساندا هەیە، ئەگەر ئەو پارچە گۆشتە چاك (صالح)

[٤٠] ((حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ عَنْ عَامِرٍ قَالَ سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ يَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ الْحَلَالُ بَيِّنٌ وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ وَبَيْنَهُمَا مُشَبَّهَاتٌ لَا يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ فَمَنْ اتَّقَى الْمُشَبَّهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ كَرَاعٍ يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ أَلَا وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى أَلَا إِنَّ حِمَى اللَّهِ فِي أَرْضِهِ مَحَارِمُهُ أَلَا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ أَلَا وَهِيَ الْقَلْبُ))، صحيح بخاري، جزء ١، كتاب الايمان، باب: فضل من استبرأ لدينه، صفحة ٢٨، رقم الحديث ٥٢، وأطراف الحديث في البخاري ((١٩٤٦)). وأخرجه مسلم في المسقاة، باب: أخذ الحلال وترك الشبهات، رقم الحديث ١٥٩٩

بوو، باقی ئەندامەکانی تر چاك دەردەچن، ئەگەر ئەو پارچە گۆشتە خەراپ بوو و تێکچوو باقی ئەندامەکانی تر تێکدەچن و خەراپ دەردەچن..! ((أَلا وهِي القَلب)): ئاگاداربن ئەوەش دڵە!، جا ئەگەر دڵ چاك بێ، ئەو دڵە بە ئەندامەکانی ترەوە بەستراوەتەوە و چاکەیان پێ دەکات!! ئەگەر دڵیش تێکچوو و خەراپ بوو ئەوە باقی ئەندامەکانی تر تێکدەچن!، بەڵگەی بەقوودەت تریشمان بۆ ئەو قسەیە ئایات و فەرموودەکانی خوای پەروەردگارن لە قورئانی پیرۆزدا کە دڵ ئەساسە بۆ چاکبوونی ئینسان وە بۆ خەراپبوونی، دڵی ئینسان عاصیمەی مەملەکەتی ئینسانە، چۆن ئەگەر دەوڵەتێك، پایەختەکەی بگیرێ هەموو وڵاتەکە دەشێوێ و تێکدەچێ!، مەرکەزیەت نامێنێ! دڵیش ئەگەر شەیتان بەسەریدا زاڵ بوو ئەو کاتە ئەندامەکانی تر دەستەوەستان دەمێننەوە و هیچیان پێ ناکرێ! لەبەر ئەوە دڵ ئەندامێکی زۆر حەسساسە لە لاشەی ئینساندا.

## دڵی ئیماندار چ دڵێکە وە نیشانەکانی چین؟:

دڵی ئیماندار ئەو دڵەیە کە خوای پەروەردگار وەسفی دەکات (جل جلالە)، وەکو دەفەرموێ ﴿أَفَمَن شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلإِسْلامِ فَهوَ عَلَى نُورٍ مِّن رَّبِّهِ﴾ ٢٢- الزمر، ئینسانی موسڵمان کە خوا سینەی گوشاد دەکات بە ئیسلام ئەوە لەسەر ڕۆشنایی یە، ﴿فَهوَ عَلَى نُورٍ مِّن رَّبِّهِ﴾: ئەو کەسە لەسەر نورێکە.. ئەو نوورە لە کوێ هاتووە؟ (مِّن رَّبِّهِ): لەلایەن پەروەردگارەکەی، لەلایەن (مُرَبِّي)یەکەی، لەلایەن خالیق و رازیقەکەی، لەلایەن مرێنەر و ژیێنەرەکەی، لەلایەن قازانج گەیەنەر و زەرەر گەیەنەرەکەی، ئەو خوایەی کە ئاو و خواردن و هەناسەی ئەو ئینسانەی بەدەستە، خوا بۆ خۆی نوورە، روناککەرەوەی ئاسمانەکان و زەوییە: ﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالأرْضِ﴾ ٣٥- النور، بەڵێ ئەو

نوورەش کە دراوە بە ئینسان خوا پێـی داوە، ﴿يَهْـدِي اللَّـهُ لِنُـورِهِ مَـن يَـشَاء﴾ ٣٥- النــور: خوای پەروەردگار نووری خۆی ئەداتە کەسانێك، ئەو ئیمان و بیر و باوەڕ و قەناعەت و ئیسلامەتییە دەداتە کە سانێك کە خۆی دەیـەوێت، ئـەو ئینسانانەی کە بەرە و خوا دەڕۆن و نیەتیان بەرە و خوایە خوا بە پیریانـەوە دێ و خوا دەیانداتێ ئەو نــوورە، بـەڵێ ﴿فَمَـن يُـرِدِ اللَّـهُ أَن يَهْدِيَـهُ يَـشْرَحْ صَـدْرَهُ لِلاسْلامِ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقاً حَرَجاً كَأَنَّمَا يَـصَّعَّدُ فِـي الـسَّمَاء كَذَلِكَ يَجْعَلُ اللَّهُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ﴾ ١٢٥- الانعام، هەر کەسـێك نیازی وا بێ بگەڕێتەوە لای خوا، نیەتی بەرە و خـوا چـاك بـێ، خـوای گـەورە وردە وردە هاوکاری دەکـات بـۆ سـەر ڕێگـای راسـت، کەسـێك خـوا بیـەوێت هیدایەتی بدا و دڵی فراوان بکا: ﴿يشرح صدره للاسـلام﴾ دڵـی دەکاتـەوە بـۆ ئیسلام!! هەر دڵێك کراوەبێ بۆ ئیـسلام و، ئیـسلامی تێـدابێ ئـەو دڵـە دڵـی ئیمانــدارە. ﴿أَلَـمْ نَـشْرَحْ لَـكَ صَـدْرَكَ﴾ ١- الـشرح، خـوا فـەرمووی بـە پێغەمبەرمان ﷺ ئایا دڵمان شەرح نەکردیت؟! دڵمان نەرکردیەوە بۆ ئیسلام؟!،

بەڵێ بەڕێزان: **نیشانەکانی دڵی ئینسانی موسڵمان چین؟**

١) یەکەم نیشانەی سەلامەتی ئەو دڵە و ساغی ئـەو دڵەیـە، سـاغی لـەڕووی مەعنەویەوە نەك لەڕووی ماددیەوە، ئەو دڵە دڵێکی پاکە یان پیـسە، ئـەو دڵە خاوەنی فەهمی سەلیمە یان تێگەیشتنی هەڵەیە؟! تـەوجیهاتی سـەلیم دەردەکـا یـان تـەوجیاهاتی قـەبیح و غەڵـەت؟ ئـەها خـوای پـەروەردگار دەربارەی ئەو کەسانەی کە ڕۆژی قیامەت سەرکەوتوون دەفەرموێ ﴿إِلا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ ٨٩- الـشعراء، ڕۆژی قیامـەتێ مـاڵ و سـەروەت و سامان و عەشیرەت و کەسوکار دیفاع لە ئینسان ناکـا! بـەڵکو ئـەوەی کـە بەکەڵك بێ لەو ڕۆژەدا: ﴿قَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ دڵێکی سەلیمە!!، ئەو دڵە سەلیمەش

نموونەمان ئیبراهیمە (علیه الصلاة والسلام) کە خوای پەروەردگار لە حەقی ئەودا ئەفەرموێ ﴿إِذْ جَاءَ رَبَّهُ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ ٨٤- الصافات: هاتە خزمەت خوا بە دڵێکی سەلیمەوە، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) هەموو جار دەیفەرموو: ئەی صەحابیە بەڕێزەکانم، زەمی خەڵکیم لەلا مەکەن، ئەگەر خەڵکێکیش گلەییەکی بووبێ یان تێبینیەکی بووبێ، غەیبەتیشی کردم بۆم مەگێڕنەوە ((فَإِنِّي أُحِبُّ اَن اَخرجَ اَلَيكُم وَاَنَا سَلِيم الصَّدرِ))[41] ئەفەرموێ: لەبەر ئەوەی پێمخۆشە کە چوومە دەرەوە بۆ ناو خەڵك (سَلِيمُ الصَّدر) بم، واتە دڵم سەلامەت بێ و هیچی تێدا نەبێ بەرامبەر بە خەڵك.

٢) دڵی ئینسانی موسڵمان بێ غەشە، دڵی ئینسانی مسوڵمان حیقد و بوغز و قینی تێدا نیە لە بەرامبەر موسڵماناندا، لە بەرامبەر دایك و باوکیدا دڵێکی پاکی هەیە و حقدی لێیان هەڵناگری، لە بەرامبەر خێزان و ماڵ و منداڵیدا دڵێکی پاکی هەیە و دڵی بەگومان نیە، بەگومانەوە تەماشای چونە دەرەوە و هاتنە ژوورەوەکانی ناکات، بەگومانەوە تەماشای شەریکی دوکانەکەی و موعامەلەکەی ناکات.. ئەصڵ لە ئیسلامەتییدا (حسن الظَن)ە.. دەبێ ئینسان گومانی چاکی بە مسوڵمانان هەبێ، ئەصحابی پێغەمبەر (ڕەزای خوایان لێبێ) دەیان جار گومانی چاکیان بەکەسێك دەبرد کە هەڵەیەکیان لێ دەبینی ئینجا گومانێکی خەراپ!.. بەڵام بە بەداخەوە زۆرجاران بە جارێك کە شتێك دەبینین لە مسوڵمانێك و بەدڵمان نییە، یەکسەر خواحافیزی لێ دەکەین و زەربێکی بەسەردا دێنین و دەڵێین، ئەها

[41] ((عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لا يُبَلِّغُنِي أَحَدٌ مِنْ أَصْحَابِي عَنْ أَحَدٍ شَيْئًا فَإِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَخْرُجَ إِلَيْكُمْ وَأَنَا سَلِيمُ الصَّدْرِ)). سنن أبي داود، كتاب الادب، باب في رفع الحديث من المجلس، صفحة ٨٢٩، رقم الحديث ٤٨٦٠، قال الالباني ضعيف ((المشكاة ٤٨٥٢)).

ئەو گوناهەمان لێ بینی تـازە بەكـەڵك نایـێ!!، بـەڕێزان ئینـسان نـە بـە چاكەیەك دەبێتە پیاوی چاك وە نە بە خەراپەیەكیش دەبێتە پیاوی خەراپ!، ئینسانی چاك زۆرجار هەڵەیەكی لە دەستدێ، خەراپەیـەكی لەدەسـت دێ، بەڵام پەشیمان دەبێتەوە. ئەو ئینسانە كە پەشیمان بوویـەوە: ((التَّائِـبُ مِـنَ الذَّنبِ كَمَن لا ذَنبَ لَـهُ))[٤٢]، ئینسانێك كە موسـڵمانە و گوناهێـك دەكـات، بەتایبەت ئەوانەی كە دەچن بۆ حەج و سەفەری حەج دەكەن پێغەمبـەر ﷺ ئەفەرموێ: كە تەوبەیەكی نەصوحی كرد وەك ئەوە وایە كە تـازە لـە دایـك بوو بێ!!![٤٣]، واتە هیچ گوناهی نەبێ، لەبـەر ئـەوە ئینـسان بـە گوناهێـك نابێتە پیاوی خەراپ وە ئینسان بە چاكەیەك نابێتـە پیـاوی چـاك، زۆرجـار پیاوی خەراپیش چاكەیەكی لەدەست دێ! قـسەیەكی خێـری لەدەسـت دێ، شتێكی خێر دەكا موسڵمانانیش ئیستفادەی لی بكەن، پیاوی چـاكیش نیـە و ئەو چاكەیەشی لەدەست هاتووە!!،

بەڵێ بەڕێزان: بۆیێ یەكێك لە ئەصحاب (خوا لێی رازی بێت) لەگـەڵ صـەحابیەكی تر نیقاشێكیان بوو یەكێكیش ویستی كێشەیان زیاد بكـات هـات زەمـی ئـەمی لەلای ئەو كرد و زەمی ئەویشی لەلای ئەم كرد!!، ئەو صەحابیە فەرمووی (مـە لَم

---

[٤٢] ((حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ سَعِيدٍ الدَّارِمِيُّ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الرَّقَاشِيُّ حَدَّثَنَا وُهَيْبُ بْنُ خَالِدٍ حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ عَنْ عَبْدِ الْكَرِيمِ عَنْ أَبِي عُبَيدَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ التَّائِبُ مِنْ الذَّنْبِ كَمَنْ لا ذَنْبَ لَهُ))، سنن ابن ماجه، كتاب الزهد، باب: ذكر التوبة، صفحة ٧٠٤، رقم الحديث ٤٢٥٠، وقال الالباني حسن ((في سلسلة الضعيفة تحت الحديث ٦١٥ و ٦١٦)).

[٤٣] وَلِذَلِكَ لِمَا رُوِيَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ حَجَّ هَذَا الْبيتَ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ يُرِيدُ وَاَللَّهُ أَعْلَمُ أَنَّهُ لا ذَنْبَ لَهُ لانَّ مَا أَتَى بِهِ مِنْ الْعَمَلِ قَدْ كَفَّرَ سَائِرَ ذُنُوبِهِ فَصَارَ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ لا ذَنْبَ لَهُ وَاَللَّهُ أَعْلَمُ.

بڕوانە (موسوعة الشاملة)، كە ئاماژە بە ((المنتقي – شرح الموطأ، جزء ٣، باب حدثني عن مالك أنه بلغه أن...)) دەكات.

یَبلُغ الخِلاف قُلُوبنَا) فەرمووی: بێدەنگ بە ئەو خـیلاف و جیاوازیـە نەگەیـشتۆتە ناو دڵمان، خیلاف و جیاوازی جاری وا هەیە بەزۆرینیش دەبێ بەڵام كـە گەیـشتە دڵ ئەوكات خەتەرە بۆ ئینسان و هەڵە بە ئینسان دروست دەكات..

بەڵێ خۆشەویستەكانم: ئینسانی موسڵمان دەبێ دڵی سەلیم و سەلامەت بێ و حیقد و بوغزی تێدا نەبێ.

٣) نیشانەیەكی تـر لـە دڵـی ئیمانـدار ئەوەیـە كـە باسـی خـوا دەكـرێ دڵـی دەلەرزێ!، برایانی بەڕێز، مسوڵمانانی خۆشەویست: یەكێك لـە عـەلاماتی ئیمانی راستەقینەی ئینسانی موسڵمان -پیاو بێ یان ئافرەت- ئەوەیـە كـە باسی خوا كرا ترسی بە دڵدا بێ، وە دڵی بلەرزێ، خوای گەورە دەفـەرموێ: اعوذ بالله من الشیطان الـرجیم ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّـهُ وَجِلَـتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُـهُ زَادَتْهُـمْ إِيمَانـاً وَعَلَـى رَبِّهِـمْ يَتَوَكَّلُـونَ﴾ ٢- الانفال، ئیمانداری راسـتەقینە ئـەو كەسـانەن یەكـەم سیفەتیان ئەوەیـە، وەختێ كە باسی خوا كرا ﴿وجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ دڵیان دەترسێ!، دڵیان دەلەرزێ و تەزووی پێدا دێ، لە مەجلیسێكدا كە مامۆستا وتارێك دەخوێنێتەوە یان تەفسیری قورئانت بۆ دەكرێ و ئامۆژگاریت دەكرێ، كـە باسـی خـوا كـرا، تەزووت بە دڵی دابێ و بترسێی، ئەوە نیشانەی ئیمانە!!،

٤) وە یەكێكی تر لە نیشانەكانی دڵی ئیماندار ئەوەیە كە كاتێك ئایاتی خـوای بەسەردا دەخوێندرێتەوە ئیمانی پێ زیاد دەكا.. ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُـونَ الَّـذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ.... زَادَتْهُمْ إِيمَاناً﴾ ٢- الانفال، وەختێك كە ئایاتی خوای بەسەردا دەخوێندرێتەوە ئەو ئینسانە ئیمانی پـێ زیـاد دەكـا، هـەر ئینـسانێك بـە ئایاتی خوا ئیمانی زیاد بوو ئەوە موسڵمانێكی تەواوە، كاتێك كـە ئایـاتی خوای بەسەردا دەخوێندرێتەوە چ لە تەعزیەبێ، چ لـە موناسـەباتی گـشتی

بێ، چ لە کاتی جومعەبێ، چ لە کاتێکی تردابێ لە هەر مەجلیسێك و کۆڕێکدا وەختێك کە ئایاتی خوات بەسەردا خوێنراوە دڵت تەزووی پێدا هات و ترسای لە خوا و ئیمانت پێ زیاد بوو ئەوە نیشانەی ئیمانە دەبێ دڵت پێی خۆش بێ!.

٥) نیشانەیەکی تر لە نیشانەکانی دڵی ئیماندار ئەوەیە کە پشت بە خوا دەبەستێ. وەکو خوای پەروەردگار فەرمووی: ﴿وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ ٢- الانفال، واتە: پشت بەخوا دەبەستن، ئینسانی ئیماندار دڵی قەناعەتی هەیە بە ئیمان، قەناعەتی هەیە بەخوا، دڵی (قَوي)یە بەچی؟، بەخوا...، پێغەمبەر ﷺ وەختێك کە لە مەککە خۆی و ئەبوو بەکری صدیق ﷺ هیجرەتیان کرد موسڵمانانی هەموو لە پێش خۆیدا بەڕێ کردبوو، دوژمنانیان بەدوایاندا هەتا چونە ئەشکەوتی (ثور)، لەوێ تەنها خۆی و ئەبوو بەکر لە ژورێدا بوون، وەختێك کە کافرەکان هاتنە بەردەرگای ئەشکەوتەکە ئەبوو بەکر ﷺ ترسا.. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ﴿لاتَحزَنْ اِنَّ اللهَ مَعَنَا﴾: مەترسە خوا لەگەڵماندایە.. ((مَاظَنُكَ بِأثنَينِ اللهُ ثَالثُهُمَا)): ئەی ئەبوو بەکر رات چییە بەرامبەر بە دوو کەسان کە سێیەمینیان خوا بێ (جل جلاله)؟!.

دووکەس سێیەمینیان خوا بێ نابێ بترسن!، ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەمان ﷺ دڵی پڕ لە ئیمان بوو بۆیە نەئەترسا و پشتی بەخوا ئەبەست، ئەگەرنا چ لەشکری مسوڵمانانی لە نزیك نەبوون هەتا پشتی پێیان ببەستێ!! بەڵام دڵی بەنووری ئیمان و ئیسلامەتی زۆر قایم بوو، (تَوَکُل)ی لەسەر خوا زۆر قایم بوو، زۆر پشتی بەخوا ئەبەست و باوەڕی زۆر بەو ئایەتەی هەبوو کە خوای گەورە فەرمووی: ﴿أَلَيْس اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ﴾ ٣٦- الزمر، ئایا خوا بەس نییە بۆ عەبدی خۆی؟!، یان فەرمووی: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ

أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْراً﴾ ٣- الطلاق، هەر کەسێك خـوا بکـات بـە پشتیوانی خۆی، ﴿فَهوَ حَسْبُهُ﴾: خوا بەسیەتی، جا خۆشەویستەکانم، یەکێك لـە نیشانەکانی دڵی ئیماندار، ئەوەیە بە نووری ئیمان و ئیسلامەتی دڵی زۆر قـایم بێ وە تەنها خوای گەورە بە پشتیوانی خۆی بزانێ (جل جلالە).

٦) خـالێکی تـر ئەوەیـە تـەنها سـێبوری بـە ئیـسلام بـێ، دڵـی مـسوسڵمان نیشانەیەکی تری ئەوەیە وەختێ کە باسی ئیـسلامەتی بکـرێ دڵـی خـۆش دەبێ، بەڵام باسی غەیری ئیسلامەتی کرا دڵی ناڕەحەت دەبێ!، ئەها خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللّهِ﴾ ٢٨- الرعد، ئەوانەی ئیماندارن دڵیـان (مطمَئِن) دەبـێ بەچـی؟ ﴿بِذِكْرِ اللّهِ﴾: بـەیادی خـوا.. ئـەوەی ئیمانـدارە بـەیادی خـوا دڵـی (مطمَئِن) دەبـێ و دەحەسێتەوە و دەگەشێتەوە، ئەوەی کە غەم و خەفەتی هەیە یان دڵی تونـد و ناڕەحەتە با بێنێ بیر لە قورئان و ئیسلامەتی بکاتەوە، بیر لە ئایاتی خوا بکاتـەوە، هاتوچـۆی مزگـەوت بکـات دڵـی دەگەشـێتەوە و دەکرێتـەوە ﴿وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللهِ﴾: دڵی (مطمَئِن) دەبێ بەیاد (ذِکر)ی خوا ئەگـەر گوێ لە قسەی خێر بگرێ و فیکر لە شتی چاکە بکاتەوە.

جا ئەو کەسەی دڵـی (مُطمَـئِن)ە بـەزیکری خـوا ئـەوە ئیمانـدارە وە ئـەوەی ئمانداریشە دەبێ دڵی (مطمئن) ببێ بە زیکری خوا، کەوا بـوو خـوا (جل جلالـە) فەرمووی ﴿أَلا بِذِكْرِ اللّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾: ئاگادار بن بـە زیکـر و یـادی خـوا دلاّن ئارام دەگرن، ئەگەر دەتانەوێ دڵتان (مُطمَئِن) بێ، دڵتان گوشـاد و فـراوان بێ، زیکری خوا بکەن، چ یادکردنی خواو یادکردنی ئیـسلامەتی وە یـادکردنی مردن و قیامەت و بەهەشت و دۆزەخ وە چ زیکرکردن بە زمان، دڵت (مُطمَـئِن) دەکا، بێگومان خوای گەورە وەعدی داوە.

٧) دڵی ئیماندار ئاموٚژگاری وەردەگرێ لە قورئان، خوای پەروەردگار فەرمووی: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ ٣٧– ق، واتە: ئەو قورئانە ئاموٚژگارییە، بوٚ كێ ئاموٚژگاریە؟، بوٚ هەموو ئینسان، بەلاٚم كێ ئیستفادەی لێ دەكا؟، كێ گوێی بوٚ رادەگرێ و وەریدەگرێ (لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ) بوٚ ئەو كەسەی كە دڵی هەیە!! هەموو كەس دڵی هەیە!، بەلاٚم خوای پەروەردگار مەبەستی لێرەدا ئەو كەسانە نیە كە دڵی ((مادی))یان هەیە، مەبەستی دڵی ((مەعنەوی))یە، ئەو دڵەی كە روونە بە نووری ئیمان، گەش و رووناكە بە نووری ئیمان، ئەو دڵانەی كە روون و ساغن، ئەو دڵانەی كە چاویان هەیە حەق دەبینن و حەق وەردەگرن.

٨) یەكێكی تر لە عەلاماتی دڵی ئیماندار ئەوەیە كە ئارامە و قەناعەتی هەیە.. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿هو الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ٤– الفتح: ئەو خوایەی كە سەكینەت و ئارامی (طَمَأنينَة)ی خستە ناو دڵی ئیمادارانەوە لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ وە لە هەموو سەردەمێكدا، هەر خوا سەكینەت و ئارامی دەخاتە دڵی ئیمانداران بەهوٚی ئەوەی كە یادی خوا دەكەن و پشت بەخوا دەبەستن!!

دڵی ئینسانی موسڵمان قەناعەتی هەیە و زوٚر خوٚی بە دونیاوە مەشغول ناكا پێی وابێ دەبێ هەموو دونیا هی ئەو بێ!، چاوی لە ماڵی خەڵك بێ، چاوی لە سەروەت و سامانی دونیابێ و هەمووی لەسەریەك دانێ!!، نا، دڵی ئینسانی موسوڵمان قەناعەتی هەیە، وە كو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (القَناعَةُ كَنزٌ لايفنَى)[٤٤]: قەناعەت خەزێنە و ماڵێكە نابڕێتەوە! ئینسان ئەگەر قەناعەتی

[٤٤] ((القَناعَةُ مالٌ لا يَنفَد و كَنزُ لا يُفنى))، الطبراني في الاوسط والعسكري من حديث المنكدر بن محمد بن المنكدر عن أبيه عن جابر والقضاعي بدون: وكنز لايفنى عن أنس، وكذا ليست الجملة عند العسكري. انظر: (المقاصد الحسنة في بيان كثير من الاحاديث المشتهرة على الالسنة)، صفحة ٣١٥، رقم الحديث ٧٧٩.

هه‌بێ، وا ئه‌زانێ ماڵی دونیای هه‌موو هه‌یه!! به‌ڵام یه‌كێك نه‌كه‌ر ماڵیشی زۆر بێ و قه‌ناعه‌تی نه‌بێ پێیوایه هیچی نیه!! بۆیه به‌ڕاستی قه‌ناعه‌ت له دڵدا ئه‌ساسه بۆ ئه‌وه‌ی ئینسان له خۆشیدا بێ!، زۆر ئینسانی فه‌قیر و هه‌ژار هه‌یه زۆر راحه‌ت ده‌ژی!، كاتێك كه به‌یانیان ده‌چێ بۆ ئیش و ماندوو ده‌بێ به‌ڵام ئێواران دێته‌وه و ده‌حه‌سێته‌وه، وا ئه‌زانێ هه‌موو دونیا هی ئه‌وه!!، وه زۆر ئینسانی بێ دینیش هه‌یه حاڵ و وه‌زعیشی زۆر چاكه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر هه‌موو دونیاشی هه‌بێ دڵیشی هه‌ر تونده!، به‌ڵێ خوای په‌روه‌ردگار دڵی مسوڵمانی رۆشنا كردووه به نووری ئیمان له‌به‌رئه‌وه پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئه‌فه‌رموێ ((لَوْ كَانَ لابْنِ آدَمَ وَادِيَانِ مِنْ مَالٍ لابْتَغَى ثَالِثًا))[45]: ئه‌گه‌ر به‌نی ئاده‌م دوو شێوی پڕ له ماڵی هه‌بێ (((وادی) یه‌عنی نێوان دوو گردۆڵكه))، ئه‌گه‌ر پڕ زێڕی هه‌بێ ((لابْتَغَى ثَالِثًا)): پێی خۆشه سێی هه‌بن!! ((وَلا يَملأ جَوف اِبنُ آدَمَ الا التُّراب)): ئه‌و ئینسانه ئه‌وه‌نده چاوتێبڕ(طَماح)ه..! ته‌نها به خۆڵ ورگی پڕ ده‌بێ!!، له‌به‌ر ئه‌وه قه‌ناعه‌ت ماڵێكه و نابڕێته‌وه.

٩) یه‌كێكی تر له عه‌لاماتی دڵی ئیماندار، ئه‌وه‌یه زۆر له قیامه‌تێ ئه‌ترسێ..

خوای گه‌وره له وه‌صفی ئیمانداران ده‌فه‌رموێ: ﴿رِجَالٌ لا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلاةِ وَإِيتَاء الزَّكَاةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالأبْصَارُ﴾ ٣٧- النور: ئه‌و ئینسانه ئیماندارانه‌ی كه تیجاره‌ت و كڕین و فرۆشتن و مه‌شغوڵیان ناكا له نوێژ و زه‌كات و عیباده‌ت و طاعه‌ت بۆ خوا

---

[45] ((حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ عَنْ ابْنِ جُرَيْجٍ عَنْ عَطَاءٍ قَالَ سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ سَمِعْتُ النَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ لَوْ كَانَ لابْنِ آدَمَ وَادِيَانِ مِنْ مَالٍ لابْتَغَى ثَالِثًا وَلا يَمْلا جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلا التُّرَابُ وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ تَابَ))، صحيح بخاري، جزء ٤، كتاب الرقائق، باب: مايتقى من فتنة المال، صفحة ٢٢٣١، رقم الحديث ٦٠٧٢/ ٦٠٧٣ و أخرجه مسلم في الزكاة، باب: لوأن لابن أدم واديين لابتغى ثالثا. رقم ١٠٤٩

وە لە ڕۆژێـك دەترسـن كـە دڵـەكان دەلـەرزن و هەڵدەپـەڕن لـەو ڕۆژەدا.. ئینسانی مسوڵمان لـەو ڕۆژە ئەترسـێ كـە دڵـەكان هەڵدەپـەڕن! ئـەو دڵـە دەترسێ كە لەو ڕۆژەدا ئەو وەزعەی دێتە بەرچاو، ئـەو وەزعـەی قیامـەت دەبینێ و فیكری لێ دەكاتەوە.. ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْس عَنِ الْهَوَى فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوىَ﴾ ٤٠- النازعات: هەر كەسێك نەفـسی خـۆی بگێڕێتەوە لە خەراپە و لەو ڕۆژە بترسێ كە لە بەرامبەر خوا رادەگیرێ لـەو (مَحكَمة)یە ئەوە بەهەشت جێگایەتی!!.

## خۆشەویستەكانم ئەدی دڵی ڕەق چۆنە؟!

دڵی ڕەق: ئەو دڵەیە كـە كـوێرە!، حـەق نابینـێ، وەكـو خـوای پـەروەردگار فەرمووی: ﴿وَمَن كَانَ فِي هَـذِهِ أَعْمَى فَهوَ فِي الْآخِرَةِ أَعْمَى وَأَضَلُّ سبِيلا﴾ ٧٢- الاسراء: هەر كەسێك لە دونیادا كوێر بێ لە قیامـەتیش كـوێرە!!، عەبـدوڵای كوڕی ئوم مەكتوم صەحابیەكی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ كە (مؤذن)ی بوو.. هاتـە لای وەختێ ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە فـەرمووی (یارَسُول الله) جـا مـن كـوێرم یەعنی لە قیامەتیش هەر كوێر دەبم؟! پێغەمبەر ﷺ بەم ئایەتە وەڵامی دایەوە فەمووی: ﴿فَإِنَّهَا لا تَعْمَى الابْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾ ٤٦- الحج، خۆ مەبەستی كوێری چاو نیە. كوێری، كـوێری دڵـە!! ئـەوە موصـیبەتە ئینسان بە دڵ كوێر بێ نەك بە چاو!!، بە دڵ كوێربێ یەعنی حەق نەبینێ، دڵـی ڕەق ئەو دڵەیە كە بەنو ئیسرائیلییەكان هەیان بووە!!، وەكو خـوای پـەروەردگار بۆمان دەگێڕێتەوە، كە لەگەڵ حـەزرەتی موسـا ڕۆیـشتن بـە دەشـتێكدا داوای

سێبەریان كرد خوا هەوری بۆ ناردن، داوای نانیان كرد خوا (مەن) و (سەلوی)[٤٦]ی بۆ ناردن!، داوای ئاویان كرد حەزرەتی موسا بە گۆپاڵەكەی لە بەردیدا: ﴿وَإِذِ اسْتَسْقَى مُوسَى لِقَوْمِهِ فَقُلْنَا اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْناً قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ﴾ ٦٠- البقرة، دوانزە كانیاو لەو بەردە رەقە هاتە دەرەوە..!! هەر یەكێك لەو تیرانەی كە لەگەڵیدا بوو -دوانزە تیرە بوون- هەر یەكێكیان چونە سەر ئاوی ئەو جۆگەلەی كە لەو بەردە هاتەدەرەوە!، لەگەڵ ئەوەشدا بەو ناز و نیعمەتە شوكر نەبوون و رازی نەبوون وە داوای شتی زۆر زۆر بێ نرخیان كرد، ئەوجار خوای گەورە باسیان دەكا و زەمیان دەكا كە دڵیان رەق بووە!! فەرمووی: ﴿ثُمَّ قَستْ قُلُوبُكُم مِّن بَعْدِ ذَلِك فَهِي كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً وَإِنَّ مِن الْحِجَارَةِ لَمَا يَتفَجَّرُ مِنْهُ الانْهَارُ وَإِنَّ مِنهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاء وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللّهِ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ ٧٤- البقرة: دڵیان رەق بوو ئەوانە، وەكو چی؟، وەكو بەرد!! یان رەقتر لە بەرد!!! جا دڵێك رەقتربێ لە بەرد ئەوە چ دڵێكە؟!! ئەو دڵەی كە نووری ئیمان و ئیسلامەتی ناچێتە ناو و بیری لێ ناكاتەوە و وەریناگرێ ئەو دڵەیە رەقتر لە بەرد!، خوا ئەفەرموێ ﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاء﴾: بەڵێ، بەردی وا هەیە شەق دەبێ و ئاوی لێ دێتە دەرەوە!!! ﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللّهِ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ ٧٤- البقرة: بەردی وا هەیە لە شوێنی بەرز بەردەبێتەوە

---

[٤٦] ((وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ الْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَى كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَكِن كَانُواْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ)) ٥٧- البقرة. (مَن) جۆرە خواردنێك بووە كە هەندێك دەڵێن (گەزۆ)یە، وەكو بەفر دەهاتە خوارەوە بۆ بەنو ئیسرائیلییەكان لە بەرە بەیاندا، هەركەسێك پاش خواردنی لێی پەزمەندە و پاشەكەوت بكردایە ئەوە خواردنەكە خراپ دەبوو و كەڵكی نەدەما.
(السَلوى) جیاوازی لە لێكدانەوەی هەیە لەنێو راڤەوانانی قورئان، زۆربەیان لەسەر ئەوەن كە جۆرە باڵندەیەك بووە.. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ((الجامع لاحكام القرآن)) مجلد ١، صفحة ٤٠٦ و ٤٠٧ و ٤٠٨.

لە ترسی خوا!!، سەیرە دڵی ئینسانی مسوڵمان چۆن بە ئایاتی خوا نەرم نابێ؟!! ئەو دڵەی كە زۆر گچكۆكەیە و گۆشت و خوێنە، ئەی باشە چۆن بە ئایاتی خوا نەرم نابێ؟! خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾: وەكو بەرد وایە و بەڵكو رەقتریش لە بەرد!، دیارە ئەوە ئەو دڵەیە كە نووری ئیسلامەتی ناچێتە ناوی..

بەڵێ خۆشەویستەكانم: دڵی رەق ئەو دڵەیە كە خوای گەورە مۆری لەسەر داوە وەكو فەرمووی ﴿كَلاَّ بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ ١٤- المطففین، خوا ئەفەرموێ وەختێ كە ئینسان گوناهی زۆر كردن، دڵی پەردەی بەسەر دا ئەدرێ، ﴿أَفَلا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا﴾ ٢٤- محمد: ئەو دڵانەی كە ئەو هەموو ئایات و حەدیسەیان بۆ دەخرێتەڕوو و باسی ئیسلامیان بۆ دەكرێ بەڵام هیچی ناچێتە ناو، دەبێ بۆ ئەو دڵانە ئەوەندە رەق بووبن؟! ئەوە خوای پەروەردگار زەمی ئەو نەوعە دڵانە دەكات و بە قفڵدراویان حسێب دەكات، هەڕەشەیە بۆ ئینسان كە ئەگەر دڵی ئایەت و حەدیس و فەرموودەی خوای (جل جلاله) نەچێتە ناو و وەری نەگرێ سزای سەختی هەیە رۆژی قیامەت!، بەڵێ بەڕێزانم: نیشانەی دڵی رەقیش ئەوەیە كە دڵی دەگوشرێ وەختێ كە باسی دین دەكرێ، زۆرجار دیقەتتان داوە كە باسی دین دەكرێ زۆر كەس پێی قەڵسە، دڵی دەگوشرێ لە مەجلیسێكدا حەز دەكا بچێتە دەرەوە، حەزی لە ئامۆژگاری مامۆستا نییە، یان پێی ناخۆشە باسی دینی لەلا بكرێ، بەڵام كە باسی دونیای لەلا بكرێ پێی خۆشە، بەس باسی خوای لەلا نەكرێ!! ئەها خوا دەفەرموێ ﴿وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ ٤٥- الزمر: وەختێ كە بەتەنها باسی خوا كرا دڵی ئینسانی بێ دین تێك دەچێ!.

﴿اشْمَأَزَّتْ﴾: یەعنی دڵی دەگوشرێ، یەكێك لە عەلاماتی ئینسانی بێ دین ئەوەیە كە باسی خواو دین كرا دڵی بگوشرێ.. پێی ناخۆش بێ كە باسی دین بكرێ وەختێ كە باسی غەیری خوا كرا، باسی بت و سەنەمەكان كرا، باسی شتی تر كرا (یَسْتَبْشِرُونَ): وەكو موژدەیەكیان بدەیێ ئاوا دڵیان خۆش دەبێ، دڵی ئیماندار ئەوەیە كە بەئیمان و ئیسلامەتی دڵی بكرێتەوە و ئیمانی پێ زیاد بێ و تەزووی بە قەلبدا بێ، بەڵام دڵی بێ دین ئەوەیە كاتێك باسی خوا دەكرێ دڵی دەگوشرێ!.

یەكێكی تر لە عەلاماتی دڵی رەق ئەوەیە كە دوو دڵە!، وەكو خوا (جل جلالە) فەرمووی دەربارەی مونافیقەكان ﴿مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَلِكَ لاَ إِلَى هَـؤُلاء وَلاَ إِلَى هَـؤُلاء وَمَن يُضْلِلِ اللّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ سَبِيلاً﴾ ١٤٣- النساء: دوو دڵن، نە لەگەڵ كافرەكاندان و نە لەگەڵ موسڵمانانیش، وە لە هەمانكاتیشدا خوا ئەفەرموێ: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللّهُ مَرَضاً وَلَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾ ١٠- البقرة، نەخۆشی دوو دڵی و دووڕوویيان لەناودا هەیە، بەڵێ بەڕێزانم: ئێمەی موسڵمانیش دەبێ خۆمان بپارێزین لەو جۆرە دڵانە بۆ ئەوەی نووری ئیسلامەتی و ئیمانمان زیاتر لە دڵدا بچەسپێ و جێگیربێ، خوانە خواستە، پەردەیەك یان خەتمێكمان لە دڵ نەدرێ دوایی نەتوانین ئیمان و ئیسلامەتی لە دڵدا جێ بكەینەوە، ئەها یەكێك لەو دڵانەی كە نووری ئیسلام و ئیمان وەرناگرێ، ئامۆژگاری وەرناگرێ خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێ ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيراً مِّنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لاَّ يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَّ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَّ يَسْمَعُونَ بِهَا أُوْلَـئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ﴾ ١٧٩- الاعراف، ئەفەرموێ ئێمە بۆ جەهەننەمێمان دروست كردووە زۆر لە جنۆكە و ئینسان، دڵیان هەیە بەڵام پێی تێناگەن، چاویان هەیەو ڕێ ی

ڕاستی پێ نابینن، گوێیان هەیەو حەقی پـێ نابیـستن ...، مـسوڵمان ئـەو کەسەیە قسەی حەق وەردەگرێ لە هەر کەسێك کە بیکـات!، لەبەرئـەوە بـا ئێمەش وەکو کۆمـەڵێك مـسوڵمان، وەکـو شـوێنکەوتوانی پێغەمبـەر ﷺ دڵمان بە نووری ئیمان و ئیسلامەتی وە بە خۆشەویستی خـوا و پێغەمبـەر ﷺ و خۆشەویستی قورئان و دینی خوا زیاتر جۆش بدەین بـۆ ئـەوەی هـەم لەو دونیادا سەرکەوتوو بین وە هەم لە قیامەتیشدا سـەر فـراز بـین، ئەگـەر دەشمانەوێ دڵمان ئارام بێ بەتایبەت ئەوانەی نەخۆشی (دەروونی- نَفسي)یان هەیە، ئەوانەی نەخۆشی (دڵتوندی)یان هەیە، یان ئەوانـەی نەخۆشـی (مَـسُ الِجن) هەیە، ئەوانە دەبێ ئاگاداربن بە چەند شتێك دڵیان گوشاد دەبێتەوە:

یەکەم بەزیکری خوا، زیکری بەیانیان، زیکری ئێواران، زیکری پێش خـەوتن، بە کەمی مەزانە!، (آيةُ الكرسِي) بخوێنە پێش ئەوەی بخەوی، وەزیکرەکانی پێش خەوتن زۆرن بیانخوێنە ئەو دڵەت دەکرێتەوە و دەپـارێزرێی لـە دەستوەشـاندنی جن و شەیطـان، وە هاتوچۆی مزگەوت بکە، بە هاتوچـۆکردنی مزگـەوت دڵـت دەکرێتەوە ئیمانت پێ زیاد دەبێ، دڵت قایم دەبێ..

هاتوچۆی موسڵمانان.. ئینجا لە هەمانکاتدا قورئـان خوێنـدن، ئینـسان بـە قورئان خوێندن دڵی دەکرێتەوە و دڵی شاد دەبێ!! سـینگفراوانی و (طَمأنينـة)ی بۆ دێ.. قەناعـەتی بۆ دروست دەبێ!! بەڵام هەر کتابێکی تر بخوێنـەوە غـەیری قورئان عیبادەت نیە وە دڵت سێبوری و سەکینەت (طمأنينة)ی بۆ نایێ!!

جا بەڕێزان و خۆشەویستان، مسوڵمانانی ئازیز، بەڕاستی دەبێ ئێمەش بـزانین سەعـادەتی ئێمە لە دونیا و لە قیامەت چییە؟..

لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە.. یاڕەببی خوایـە دڵـەکانمان بـە نـووری ئیمـان و ئیسلام زیاتر جۆش بدەی.. یاڕەببی خوایە ئیمان و ئیـسلام لـە دڵمانـدا زیـاتر بچەسپێنی، خوایە دڵەکانمان بـە نـووری ئیمـان و ئیـسلام روونـاك بکەیتـەوە، خوایە خۆشەویستی خۆت و پێغەمبەرەکـەت و دینەکـەت لـە دڵمانـدا جـێگیر بکەی، خوایە هەرچی ئەتۆ پێت ناخۆشە لە دڵماندا دەریبهێنی، خوایە هەرچـی ئەتۆ پێتخۆشە لە دڵمان بیچەسپێنی.. خوایە خۆشەویـستی مـسوڵمانانمان لـە دڵدا جێگیر بکەی، یاڕەببی خوایە هەرچی سـیفەتی چـاکە هەیـە لـە دڵمانـدا بچەسپێنی، وە هەرچی سیفەتی خراپە، خوایە لێمـان دوور بکەیـەوە، یـاڕەببی خوایە تەوفیقمان بدەی بۆ ئەوەی بتوانین عەبدی راسـتەقینەی تـۆ بـین، خوایـە بوغز و قین و حەسەد و خەراپـەمان لـە دڵـدا هـەڵگری بەرامبـەر بـەخۆمان.. بەرامبەر بەماڵ و منداڵمان و دایك و باوکمان وە هەموو موسڵمانان...

اقول قولي هذا واستغفر الله لي ولكم و لسائر المسلمين فاستغفروه انه كانَ غفاراً، أعوذ باالله من الشيطان الرجيم ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾.

آمين

# مزگەوت و نوێژی جەماعەت

﴿وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا﴾ ١٨- الجن

# بسم الله الرحمن الرحيم

انَ الحَمدَ للهِ نَحمَدُهُ ونَستَعِينُهُ وَنَستَغفِرهُ، ونعوذ بِاللهِ مِن شُرورِ أنفُسَنا وَمِن سيئات اَعمَالِنا، مَن يَهدِه اللهُ فَلا مُضِل لَه، وَمن يُضلِل فَلا هادِي لَهُ..، نَشهَد أن لا الـهَ الا اللهُ وحدَهُ لاشَريكَ لَهُ، وَنشهَدُ اَن سَيدَنا وَنَبينَا مُحمداً عَبدُه ورسولهُ.. هَذا الرَسولُ الذِي بَلّغَ الرِّسَالةَ وَأَدى الامانَةَ وَنَصَحَ الامَةَ وَجَاهَدَ فِي اللهِ حَقَ جِهَادِهِ وَتَركَنا عَلى المَحجَةِ البَيضاءِ، لَيلُها كَنَهارِها، لايَزيغُ عَنها إلا هَالك، صَلّى اللهُ عَلَيهِ وعَلى آلِهِ وَأَصحابِهِ صَلاةً وسَلاماً إلى يَومِ الدّين، اَمَا بَعدُ ياعِبادَ اللهِ أُوصيكُم وَنَفسِي أَوَلاً بِتَقوَى اللهِ وطاعَتِه، ولُزُمِ أَوامِرِه وَكَثرَةِ مخافَتِه فإنَّ التَّقوى شِعارُ المُؤمِنين ودِثارُ المُتَّقِين، ووصيةُ اللهِ تَبارك وتعالَى فيَّ وفِي النَّاسِ أجمعين، قَالَ اللهُ (سُبحانَهُ وتَعالى) فِي كِتابِه الحَكيمِ أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطان الرَّجيم ﴿يَا أَيُّهَا النَّاس اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ ١- النساء.

ئیماندارانی بەڕێز، ئەی ئوممەتی پێغەمبەری خودا حەزرەتی موحەممەد ﷺ، لە ڕۆژێکی وا پیرۆز کە ڕۆژی جومعەیە داوای ڕەحمەت و میهرەبانی و بەزەیی بۆ خۆمان و هەموو مسوڵمانانی دونیا، لە خوای پەروەردگار دەکەین، دەپاڕێینەوە لە خوا و دەڵێین: یاڕەببی خودایە لە گوناهەکانمان خۆشبیت، یاڕەببی خودایە عاقیبەتی کردەوەکانمان خێر بکەی، یاڕەببی خوایە لەسەرە مەرگدا بە مسوڵمانێتی بمانمرێنی، یاڕەببی خودایە شیفای نەخۆشییەکانمان بدەی، یاڕەببی خودایە لە مردووەکانمان خۆشبیت بەتایبەت دایک و باوکمان.

خۆشەویستەكان: لە وڵاتی مسوڵمانانندا دوو دروشمی زەق و گەورە بەرچاو دەكەون، كە نیشانەی ئیسلامییەتی ئەو وڵاتانەن و ئەو هاوڵاتییانەن كە لەو وڵاتانەدا دەژین، یەكێك لەو دروشمانە بریتییە لە **مزگەوت** كە ماڵی خوایە، ئەویتریشیان بریتییە لە **جەماعەتكردن** لەو مزگەوتانەدا، ئەوانە دوو دروشمی گەورە و زەقن لەناو كۆمەڵگەی مسوڵمانانندا، لەڕاستیدا پێویستە ئێمەی مسوڵمان گەورەیی مزگەوت و نوێژی جەماعەت بزانین بۆیە لە وتاری ئەمڕۆی جومعەدا باس لەو دوو خاڵە دەكەم بەو ئومێدەی كە هەموو لایەكمان سوودی لێوەرگرین.

مزگەوت و نوێژی جەماعەت هەردووكیان تێكهەڵكێشن و بەیەكەوە جوانن، چ مزگەوت لە هەر شوێنێك بێ ئەگەر جەماعەتی تێدا نەكرێ غەریبە!، وە چ جەماعەتێك ئەگەر لە مزگەوت نەبێ ئەو تام و لەززەتەی نییە، بۆیە حەقیقەتی گەورەیی مزگەوت، وە حەقیقەتی گەورەیی و فەزڵی نوێژی جەماعەت حەزدەكەم بۆ بەڕێزتان روون بكەمەوە كە لەڕاستیدا ئەمڕۆ ئێمەی مسوڵمانانی دونیا زۆركەم گرنگییمان بەو دوو بابەتە داوە!، هەر شارێك یان هەر ئاوەدانییەك كە مزگەوتی تێدا نەبێ سەروسیمای مسوڵمانەتی پێوەدیار نییە، ئەگەر دێیەك مزگەوتی نەبێ چەند ناخۆشە!، زۆرجاران دەبینین بەهۆی مزگەوت و نوێژی جەماعەتەوە، یان بەهۆی بوونی جومعەوە رۆژی هەینی لە كاتی وتاری هەینی ئەو خەڵكە یەكتری دەبینێ تەعاروف و ئولفەت و رەحمەت و بەزەیی و خۆشەویستی لەگەڵ یەكتریدا نوێ دەكەنەوە، مزگەوت لیقائێكی مسوڵمانانە لە زۆر شوێندا بەتایبەت لە هەندێك شار یان دێی گەورەدا لەبەر كەسابەت و زراعەت و مەشغەڵەتی ئینسانەكان بەهۆی مزگەوتەوە یەكتری دەبینن!، یان لەبەرئەوەی كە مسوڵمانان وازیان لە نوێژی جەماعەت هێناوە بەهۆی جومعەوە یەكتری دەبینن، بۆیە بەڕاستی مزگەوت دروشمی شاری مسوڵمانانە، هەر ئاوەدانییەك مزگەوتی تێدابێ ئەگەر دێ بێ یان ناحیە یان

قەزا بێ یان پارێزگا بێ، بە ئەندازەی بوونی مزگەوتەکانی هەست بە مسوڵمانێتی ئەو شوێنە دەکرێ، **گەورەیی و گرنگی مزگەوت بە کورتی لەو خاڵانەدا دەبینین کە باسیان دەکەین:**

**یەکەم: دادگەریی ئیسلام لەناو مزگەوتدا بۆ مسوڵمانان و بۆ ئادەمیزادەکان بەگشتی دروستدەبێ،** مزگەوت قوتابخانەیەکە پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) یەکەمین بەڕێوەبەری بووە لە سەردەمی خۆیدا، خولەفای راشیدین (رضي الله عنهم) یەکەمین مامۆستای بوون دوای پێغەمبەر، صەحابە بەڕێزەکان یەکەمین قوتابی بوون کە لە مەدرەسەی پێغەمبەر (مزگەوت)دا تەخەڕوجیان کردووە، مزگەوت دادگەریی و عەدالەتمان بۆ دروست دەکات لە ریزەکانی نوێژکردندا، دەستەڵاتدارێك لە ریزی بێ دەستەڵاتێك و، هەژارێك لە تەنیشتی دەوڵەمەندێك، جوتیارێك و کرێکارێك و خوێندەوارێك و نەخوێندەوارێك و زانایەك و نەزانێك لە تەنیشت یەکتری ریز دەکات. بەبێ فەرق و جیاوازی دونیایی!، تەنها یەك سەنگی مەحەك و یەك تەرازوو هەیە بۆ ئەوەی کە ئەو خەڵکەی ناو مزگەوت هەڵسەنگێنێ ئەویشیان بریتییە لە فەرموودەی: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ ١٣- الحجرات، واتە: بەڕێزترتان لەلای خوا ئەو کەسەیە کە پارێزکارترتانە!، بۆیە بەڕێزان پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی (لا فَضلَ لاحَدٍ عَلى أَحَدٍ إلا بِالتَّقوى)[٤٧] واتە: کەس بەسەر کەسدا فەزڵی نییە تەنها بە تەقوا نەبێ!، یەکەمین هەنگاو عەدالەتمان فێر دەکات.

---

[٤٧] ((حدثنا أبو عبيدة عبد الوارث بن إبراهيم العسكري ثنا عبد الرحمن بن عمرو بن جبلة ثنا عبيد بن حنين الطائي قال سمعت محمد بن حبيب بن خراش العصري يحدث عن أبيه أنه سمع رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول المسلمون إخوة لا فضل لاحد على أحد إلا بالتقوى))، المعجم الكبير للطبراني، باب الحاء: حبيب بن خراش العصري، جزء ٤، صفحة ٣٥، رقم الحديث ٣٥٤٧.

**دووەم: سەرچاوە و مەڵبەندی زانست و زانیارییە**، عـیلم و مەعریفـەت لـە مزگەوتدا پەخش دەكریٚ و وەردەگیریٚ كە بریتییە لە قورئانی پیرۆز و سـوننەتی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ، بچین قورئان لـە كـویٚ بخـوێنین و؟ لـە كـویٚ سـوننەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) وەرگـرین و فێـربین؟ لـە كوچـە و كۆڵانـەكان؟ لـە شوێنە گشتییەكان؟ یان لە مزگەوت؟!، مزگەوت شـوێنی چارەسـەری كێـشەی مسوڵمانانە، مزگەوت نەخۆشخانەیە هەموو دەرمانەكانی كێشەكانی كۆمەڵگا (مُجتَمَع)ی ئینسان لە مزگەوتـدا دەسـتدەكەویٚ، ئـەو كێـشە كوشـندانەی كـە ئینـسان پێـی تـاقی دەكرێتـەوە بریتییـە لـە قـەتڵ و زینـا و ریبـا و ریـا و خەراپەكاری و بەرەڵایی بازاڕەكان و بەرەڵایی ئافرەت...، لە كـویٚ و لـەلای چ دكتۆرێك چارەسەر دەبیٚ؟ **بێگومان لە مزگـەوت لـە مـاڵی خـودا** (جل جلالـه)، لەلای دكتۆرە پسپۆڕەكان كە ماموٚستایانن، ئەو دەرمانانە لـەلای كـیٚ دەسـت دەكەون؟ ئەو صەیدەلییە بـەڕێزە كـە قورئـانی پـیرۆزە و هـەموو دەرمـانێكی دەردەكانی كۆمەڵگای ئینسانیەتی تێدایە لـە كوێیـە؟ لـەلای ماموٚسـتایانە!، بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ: **﴿اتَّبِعُوا مَن لا يَسْأَلُكُمْ أَجْراً وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾ ٢١– یـس**، واتە: شوێنی ئەوكەسانە بكەون كـە داوای كرێتـان لـیٚ ناكـەن و خۆشیان هیدایەت دراون ، پێغەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام) بـە ئوممەتـەكانیان فەرمووە: **﴿فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلا عَلَى اللّهِ﴾ ٧٢– یـونس**، واتـە: داوای پارە و كرێم لیٚ نەكردوون و، بەپارە فێرتان ناكەین بەڵكو پاداشـتم تـەنیا لەسەر خوایە!، جا بۆیە مزگەوت مەڵبەندی فێربـوونی زانـست و زانیـاری یـە كەئەمرۆ وازی لێهێنـراوە!، ئـەمرۆ خـەڵك بەلایـدا تێدەپـەریٚ وانازانـیٚ ئـەوە مزگەوتە بەڵكو وەكو ژوورێكی ئاسایی تەماشای دەكریٚ!، پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) رۆژێكیـان دێتـەژوور بۆنـاو مزگـەوت تەماشـادەكات لـە گۆشـەیەكی مزگەوت حەلقەی زیكرە وە لە گۆشەیەكی مزگەوت حەلقەی فێربوونی عیلمـە،

پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) دەچێ لەناو حەلقەی عیلم دادەنیشێ!، لەبەر گەورەیی عیلم وە ناچێ لە حەلقەی زیکر دابنیشێ کە ئەویشیان هەر پیرۆزە!، بەڵام ئەوە ڕێنمایی یە بۆ مسوڵمانان کە خەڵکینە مزگەوت شوێنی وەرگرتنی عیلمە، مسوڵمانینە حەلقەی عیلم و چۆك دادان لە بەرامبەر وەرگرتنی عیلم، لە بەرامبەر مامۆستایەکی بەڕێزی ئایینی کە عیلم و مەعریفەتی قورئان و سوننەت فێردەکات ئەوە گەورەترین عیبادەتە.

بەڵێ خۆشەویستەکانم، مزگەوت مەدرەسە و قوتابخانەیە تێیدا مسوڵمان تەخەڕوج دەکات، تەربیەو تەعلیم و تەزکیەی نەفس لە مزگەوتدا ئینسان فێری دەبێ!، مزگەوت شوێنێکە ئینسان دەستپاکی و داوێنپاکی و خووڕەوشتی چاکی لێ فێردەبێ، وەتێیدا ڕێزو حورمەت دانان بۆ دایك و باوکی و دەرودراوسێ ومسوڵمانان فێردەبێ، ئەمانەت و هاوکاری و برایەتی و خۆبەکەمگری...، هەموو ئەوانە ئینسان لە کانیاوی ئیسلام و سەرچاوەی مسوڵمانان کە بریتییە لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کە ئەویش لە مزگەوتە و لەبەردەستی مامۆستادایەوەردەگرێ.

**سێیەم: یەکێکی تر لە گەورەییەکانی مزگەوت ئەوەیە کە یەکڕیزی مسوڵمانان دەپارێزێ**، مسوڵمانان ڕیز دەکات، ئولفەت و هاوکارییان بۆ دروست دەکات، تۆ دەچیتەماڵی کێ؟ دەچیتە ماڵی خوا (جل جلالە)، کێ خاوەنیەتی؟ خودا (جل جلالە)، ئامۆژگاری کێ وەردەگری؟ هی خودا (جل جلالە)، کڕنۆش و سەجدە بۆ کێ دەبەی؟ بۆ خودا (جل جلالە)، ئەو برایەتی و یەکڕیزییەی نێوان مسوڵمانان چۆن و بەچی دروست دەبێ؟ بە فەرموودە و تەوجیهاتی ئەو کە ئەفەرموێ: **﴿وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الارْضِ جَمِيعاً مَّا أَلَّفَتْ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَكِنَّ اللّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ ٦٣- الانفال**، ئەفەرموێ: ئەی

موحەممەد (عليه الصلاة والسلام) ئەگەر هەرچی لە زەوییە سەرفی بكەی ناتوانی برایەتی دروستبكەی و دڵی ئیماندان بەیەكەوە جۆش بدەی بەڵام خوا تەئلیفی لە نێوان دڵی ئەواندا كردووە، دڵی بەیەكەوە بەستوون و بەیەكەوەی جۆشداون بەهۆی ئیمان، ﴿فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخوانًا﴾ ١٠٣- آل عمران، واتە: ئێوە بەهۆی نیعمەتی خوا بوونە برای یەك، دەزانن نیعمەتی خوا چییە؟ نیعمەتی خوا ئیمانە!، گەورەترین نیعمەتی خوا ئیمانە!، ئەگەر لێتان بپرسم ئێستا ئامادەبووانی مزگەوت ئێوە خەڵكی كوێن؟ ئەرێ كاكە ئێوە خەڵكی چ عەشیرەت و قەومێكن؟ خەڵكی چ بنەماڵەیەكن؟ لە چ دێیەكەوە هاتوون بۆ ئەم مزگەوتە؟ ناتوانی ئەوە حیساب بكەین سەرژمێرێكی قورسە چونكە ئەو پاڵنەرەی كە خەڵك دەهێنێ بۆ مزگەوت تەنها ئیمانە!، پاڵنەری دەمارگیری حیزبایەتی و قەومایەتی و عەشیرەتایەتی نییە، دەمارگیری بنەماڵایەتی دێهاتیی نییە، بەڵكو تەنها ئیمانە پاڵمان پێوەدەنێ، بۆیە ئەتوانین بڵێین هەر مزگەوتێ لە دەیان عەشیرەت و بنەماڵە و لە دەیان خەڵكی جۆراوجۆری تێدایە بەبێ ئەوەی بپرسی كێیە لە تەنیشتم راوەستاوە نوێژ دەكات و رووی لە خوا كردووە، مسوڵمانان ئاوا مزگەوت یەكریزییان بۆ دروست دەكات، مزگەوت ئاوا خزمەت بە ئینسانییەت دەكات و برایەتی بۆ ئینسانەكان دروست دەكات بەبێ ئەوەی لە كۆمەڵێك بەرژەوەندی دونیاییدا یەكتری بناسن، وە بەبێ ئەوەی هەر شەریكی بازاڕ و دوكان بن برایەتی ئیمانییان لە مزگەوتەوە بۆ دروست دەكات چونكە ئەگەر ئینسان برایەتی لە ئیمانەوە نەبێ برایەتی هەر سەرزارەكی و رووكەشییە و هەرگیز سەرناگرێ، هەر برایەتییەك لەسەر ئەساسی ئیمان نەبێ تەنها زمانە و نابێتە واقیع!، زۆر كەسمان بینی برایەتی دروستكرد بەڵام لەبەرئەوەی لەسەر ئەساسی ئیمان نەبوو هەڵدەوەشێتەوە، بۆیە دەڵێین ئەو ئیمانەیە برایەتی راستەقینە دروست دەكات، ئەو ئیمانەیە وام لێدەكات ئەمانەتم هەبێ لە

بەرامبەر برای مسوڵمان و خیانەت و غەشی لێ ئەكەم و بەبرای خۆمی بزانم، چاكەی ئەو بە چاكەی خۆم و ناخۆشی ئەو بەناخۆشی خۆم بزانم.

**چوارەم: مایەی نزیكبوونەوەمانە لە خوا** (جل جلالە) بەهۆی نوێژی جەماعەت، بەهۆی بەشداریكردن لە وتاری هەینی، بەهۆی نوێژە سوننەتەكان، بەهۆی ئەوەوە كە ئینسان ئەتوانێ لەو شوێنە پیرۆزەدا گەورەترین عیبادەت بكات، ئینجا مایەی سڕینەوەی گوناهەكانە، گوێبگرن لە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) كە ئیمامی بوخاری ریوایەتی دەكات دەفەرمویٚ: (أعظَمُ النَّاس أجراً في الصَّلاةِ أبعَدُهُم فَأبعَدهم ممشاً)[٤٨] واتە: گەورەترین پاداشت بۆ نوێژكاران كە دێن بۆ مزگەوت بۆ ئەو كەسانەیە كە رێگایان لە مزگەوت دوور بێت، ئەفەرموێ ﷺ: كە دێن بۆ مزگەوت بە هەر هەنگاوێك كە هەڵیدەنێ پلەیەكی پێ بەرزدەبێتەوە و گوناهێكی لێ رەش دەبێتەوە!، مزگەوت و نوێژی ئاوا گوناهان لە ئینسانی دادەماڵێ: گەورەترین پاداشت بۆ ئینسانە نوێژكارەكان بە جەماعەت ئەوەیە كە دووربێ لە مزگەوت بەڵام بەداخەوە ئەمرۆ مزگەوتەكانمان زیاتر بۆ موناسەبەتی تەعزیە و هەندێ موناسەبەتی گشتی دونیایی و ئەو جۆرە بابەتانەی ژن گواستنەوە و ئا ئەوانە دەویٚ!، مزگەوتێك كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا﴾ ١٨- الجن، واتە: مزگەوتەكان ماڵی خوان، كەواتە لەگەڵ خوادا هاواری كەسی تر مەكەن، باسی دونیا مەكەن، عومەری كوڕی

---

[٤٨] ((حدثنا محمد بن العلاء قال حدثنا أبو أسامة عن بريد بن عبد الله عن أبي بردة عن أبي موسى قال قال النبي صلى الله عليه وسلم أعظم الناس أجرا في الصلاة أبعدهم فأبعدهم ممشى والذي ينتظر الصلاة حتى يصليها مع الامام أعظم أجرا من الذي يصلي ثم ينام))، صحيح البخاري، جزء ١، كتاب الجماعة والامامة، باب: فضل صلاة الفجر في جماعة، رقم الحديث ٦٢٣

خەتتاب (خوا لێی رازی بێ) رۆژێك هاتە مزگـەوتی پێغەمبـەر (علیـه الـصلاة والـسلام) بینی دوو كەس قسە دەكـەن واتـە نوێژەكـەیان تـەواوكردبوو وە قسەكانیـشیان قسەی حەرام نەبوو بەڵام باسی وەزع و مەعیشەت و گوزەرانی دونیا بوو، زۆری پێناخۆشبوو چویە پێش لێیان فەرمووی: ئێوە كێن لە مزگەوتی پێغەمبەر قسە دەكەن؟، گوتیان ئێمە میوانین و لە دەرەوەی شار هاتووینـە ئێـرە، فـەرمووی: وەڵاهی ئەگەر میوان نەبوونایە موحاسەبەیەكی توندم دەكردن لەبەرئـەوەی لـە مزگەوتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) قسەی دونیایی دەكەن!، مزگەوت شوێنی تاعەت و عیبادەتە، شوێنی كڕنۆش و سـەجدە و تـەوجیهات وەرگرتنـە، نـەك تەنها شوێنی ئەوەیە بـۆ موناسـەبەتی تەعزیـەبێ جـا ئەگـەر كەسـێ دەمـرێ مسوڵمانە یان كافر، ئیمانـدارە یـاخود مـوجریم دەبـێ تەعزیەكەشـی بـۆ لـە مزگەوت دابنێین جا ئەوجار كێ دێتە تەعزیە موشكلیە نییە!، كابرا بە لەشـی پیسەوە دێتـە مزگـەوت، نوێژنەكـەرە دێتـە مزگـەوت، هاوبەشـدانەرە یـاخود بتپەرست و كافرە دێت كەس بەكەس نییە!!، بەڕاستی ئەوە بێڕێزییە بەرامبـەر مزگەوت، بێڕێزیش بەرامبەر مزگەوت بریتییە لە بێڕێزیكردن بەرامبەر بە خـوا (جل جلالـه) چونكە مزگەوت مـاڵی خوایـە، دەبـێ ئینـسان بـە ئەدەبـەوە بێتـە مزگەوت، كە دێی لە دەرگای مزگـەوت دەدەی پێغەمبـەر (علیـه الـصلاة والـسلام) ئەفەرموێ: بەپێی راستت وەرە ژوورەوە چونكە نیشانەی پاكیەتی مزگەوتە كـە دەبێ بـەپێی راسـتت بێیـە ژوورەوە، كـە دەڕۆیـە دەرەوە بـەپێی چـەپت وەرە دەرەوە، كاتێك دێیە ژوورەوە بڵێ: خوایە هاتمـە مزگـەوت داوای رەحمـەتی تـۆ دەكەم، وە ئەفەرموێ: كاتێ چویە دەرەوە بڵێ: خوایە داوای فەزڵی تـۆ دەكـەم، مزگەوت شوێنێكی پاكە بەڵام بەداخەوە هەروەكو لە نیشانەكانی هـاتنی رۆژی قیامەتـە مزگەوتـەكانمان زیـاتر دەڕازێنینـەوە و مزگـەوت زۆر دەبـن بـەڵام

عیبادەتی تێداناکرێ!، ئەها پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (مِن أشراطِ السَّاعَةِ أنْ يَتباهى النَّاسُ فِي المَساجِدِ)[49] واتە: لە نیشانەکانی هاتنی رۆژی قیامەتە کە خەڵك خۆی بە مزگەوتان هەڵدەکێشێ!، مزگەوتی زۆر دروست دەکرێن و مزگەوت زۆر دەڕازێندرێنەوە دەڵێن: فلانە کەسە ئەو مزگەوتەی دروست کردووە!، یان کەسێ دەڵێ: ئەو مزگەوتە هەردەبێ دروست بکەم و ناوی خۆیشی لەسەر دەنوسێ!، بەڕاستی مزگەوت شوێنی عیبادەتکردن و لە خواترسان و لە خوا پاڕانەوەیە نەك شوێنێکی وابێ کە بڕازێندرێتەوە و تەنها بۆ موناسەباتیش بەکاربێ!، مزگەوتێکی قوڕینە (لە قوڕ دروستکرابێ) بەڵام بە عیبادەت رازاندرابێتەوە تەنانەت عیبادەتەکەشی زۆر بەتام و لەززەت ترە لە مزگەوتێکی تر کە رازانراوەتەوە دەر و دیوارەکانیشی هەمووی بە لەوحە و رەسم و ئایەت و حەدیس زەخرەفە رازانراوەتەوە کە ئەو ئینسانەی نوێژ دەکات نازانێ چۆن نوێژ بکات بیری دەڕوات!، خۆ مەعلومە کە نابێ تەنانەت ئەو قوماش و فەرشەی کە نوێژی لەسەر دەکەی نابێ ئاوا نەقش و نیگار و رەسمی تێدا بن بۆ ئەوەی بیرت لەسەر نوێژەکە نەڕوات!، بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: کاتێ نوێژ دەکەی تەماشای شوێنی سەجدەت بکە!، بەڵام ئێمە لەبەرئەوەی تەقوامان کەم بووە نەك هەر تەماشای شوێنی سەجدە ناکەین بەڵکو سەرمان دەسوڕێنین و بەرز دەکەینەوە، بیرمان لەلای مزگەوت نییە و خۆمان مەشغوڵ دەکەین چونکە ئیمانەکەمان زۆر لاواز و زەعیف بووە، بەڵێ پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (مِن أشراطِ

---

[49] ((أخبرنا سويد بن نصر قال أنبأنا عبد الله بن المبارك عن حماد بن سلمة عن أيوب عن أبي قلابة عن أنس أن النبي صلى الله عليه وسلم قال من أشراط الساعة أن يتباهى الناس في المساجد))، سنن النسائي، كتاب المساجد، باب: المباهاة في المساجد، رقم الحديث ٦٨٩.

السَّاعَةِ أَنْ يمرَّ الرَّجُلُ في المَسجِدِ لا يصَلي فِيهِ ركعتَينِ)[50] واته: لـه نيـشانەکانی هاتنی ڕۆژی قیامەتە خەڵك بەناو مزگەوتێ تێدەپەڕێ و نوێژی تێـدا ناکـات!، ئەمڕۆ وای لێهاتووە!، مەگەر کەسێ لە سەفەرێدا بەتەنیشت مزگەوتێدا بـڕوات بۆ ئەوەی بچێ دەست بەئاو بگەیەنێ لە ئاودەستەکان یان بچێ دەستی بـشوات ئەگەرنا بۆ عیبـادەت ڕووناکاتـە مزگـەوت!، لەبەرئـەوە بەڕاسـتی ئێمـە ئـەو ڕێزەمان وەك پێویست لە مزگەوت نەناوە، لە وەختێـکدا کـە خۆشەویـستترین شوێنە مزگەوت لەلای خودا (جل جلاله)، لەسەر ڕووی زەویـدا پیرۆزتـرین شـوێنە چـونکە پێغەمبـەر (علیـه الـصلاة والـسلام) ئەفــەرموێ: (أَحَـبُّ الـبِلادِ الی الله مساجِدها)[51] واتـە: خۆشەویـستترین جێگـا لـەلای خـوا لـە سـەر ڕووی زەوی مزگەوتـەکانن، (وَأَبغَـض الـبِلادِ الی الله أَسـواقُها) واتـە: وە بـوغزێنراوترین شوێنیش لای خوا بریتییە لە بازاڕەکان، چـونکە بـازاڕ شـوێنی سـوێند بـەدرۆ خواردنە، شوێنی درۆکردن و ڕیبا و تەرازوو بازییە بۆ ئەو کەسانەی کە سیفاتی خەراپیان هەیە، چونکە ناتوانین بڵێین: لە بازاڕدا کەس نییە درۆ بکات و تـەنها

---

[50] ((أخبرنا أبو طاهر نا أبو بكر نا يوسف بن موسى وأحمد بن عثمان بن حكيم الاودي قال حدثنا الحسن بن بشر قال يوسف بن المسيب قال ثنا الحكم بن عبد الملك عن قتادة عن سالم بن أبي الجعد عن أبيه قال ثم لقى عبد الله رجل فقال السلام عليك يا بن مسعود فقال عبدالله صدق الله ورسوله سمعت رسول الله عليه السلام وهو يقول إن من أشراط الساعة أن يمر الرجل في المسجد لا يصلي فيه ركعتين وأن لا يسلم الرجل إلا على من يعرف وأن يبرد الصبي الشيخ))، صحيح إبن خزيمة، كتاب الصلاة، باب: كراهة المرور في المساجد من غير أن تصلي فيها والبيان أنه من أشراط، رقم الحديث ١٣٢٦

[51] (( وحدثنا هارون بن معروف وإسحاق بن موسى الانصاري قال حدثنا أنس بن عياض حدثني بن أبي ذباب في رواية هارون وفي حديث الانصاري حدثني الحارث عن عبد الرحمن بن مهران مولى أبي هريرة عن أبي هريرة أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال أحب البلاد إلى الله مساجدها وأبغض البلاد إلى الله أسواقها))، صحيح مسلم، كتاب المساجد و مواضع الصلاة، باب: فضل الجلوس في مصلاه بعد الصبح و فضل المساجد، رقم الحديث ٦٧١

راستگۆیەکان ئامادە دەبن، تەنها ئەوانەی کە دادپەروەرن ئامادە دەبن، بەڵکو هەموو کەسێکی تێدایە بازاڕ بۆیە شەیتانیش شوێنی خۆی دەکاتەوە لە بازاڕ بەڵام شەیتان نایێ بۆ مزگەوت!، هەر بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (إذا رَأيتُمُ الرَّجُلَ يَتعَاهَدُ المَسجِدَ فَاشْهَدُوا لَهُ بِالايمان) واتە: ئەگەر پیاوێکتان بینی بەردەوام هاتوچۆی مزگەوتی دەکرد ئەوە شاهێدی بۆ بدەن ئیمانی هەیە، دیارە لە پیرۆزی ئەو مزگەوتەیە!.

یەکێك لەوانەی کە لەژێر سێبەری خودا لە ڕۆژی قیامەتدا رائەوەستێ کە (يَوم لاظِلَّ إلا ظِلُّهُ)[52] ئەوەیە (رَجُلٌ قَلْبُهُ مُتَعَلِّقٌ -أو مُعَلَّقٌ- بِالمَساجِد)[53] واتە: پیاوێك کە دڵەکەی بەسترابێتەوە و پەیوەستبێ بە مزگەوتەوە، ئەو کەسە لەژێر سێبەری خوا رادەوەستێ رۆژی قیامەت کە تەنها سێبەری ئەو هەیە لەو رۆژە.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: هەر لەبەر پیرۆزی و گەورەیی ئەو مزگەوتەیە کە ماڵی خودایە خوای گەورە رێگرتنی مسوڵمانان لە مزگەوت و مەنعکردنی مسوڵمانان لە عیبادەتی مزگەوت و رووخاندنی مزگەوتەکانی بە گەورەترین زوڵم داناوە لە قورئانی پیرۆزدا! ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَاجِدَ اللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ وَسَعَى فِي خَرَابِهَا﴾ ١١٤- البقرة، واتە: کێ لەو کەسە زاڵم ترە کە رێدەگرێ لەوەی مسوڵمانان لە مزگەوتدا عیبادەت بکەن و هەوڵ ئەدات مزگەوتەکان بڕوخێنێ و دایانبخات؟!، کێ لەو کەسە زاڵم ترە؟! ئەگەر خوا بفەرموێ: ((کێ لەوکەسە زاڵم ترە)) مانای وایە کەس لەو کەسە زاڵم تر نییە!!، مەگەر ئەوکەسە هەر کافربێ ئەگەرنا زوڵمێکی گەورەیە ئینسان لە

---

[52] واتە: هیچ سێبەرێك لەو رۆژە نییە تەنها سێبەری ئەو نەبێ!.

[53] صحيح البخاري، كتاب الجماعة والامامة، باب: من جلس في المسجد ينتظر الصلاة وفضل المساجد، رقم الحديث ٦٢٩.

خۆی بوەشێنێتەوە ڕێگا لە مسوڵمانان بگرێ عیبادەت لە مزگەوتدا بکەن یان کاتیان بۆ دابنێ لە سەعات ئەوەندەوە بۆ سەعات ئەوەندە!، مزگەوت ماڵی خوایە بۆ هەموو مسوڵمانێك وەكو یەکە، شوێنی عیبادەت تێداکردنە، جا بابتوانین لەو نیعمەتە گەورەیە کە نیعمەتی مزگەوتە سوود وەربگرین، ڕێز لەو نیعمەتە بگرین کە مزگەوتە ماڵی خوایە بۆ ئەوەی خوای پەروەردگار خۆشی بوێین چونکە ئەگەر بە ویقار و ڕێز و حورمەتەوە لە مزگەوت کە ماڵی خوایە هەڵسوکەوتمان کرد خوداش خۆشی دەوێین.

خاڵی دووەم بەکورتی ((**گەورەیی نوێژی جەماعەت**)): ئەوەش بەڕاستی یەکێکە لەوانەی کە مسوڵمانان ئەمڕۆ زۆر بەسادەیی تەماشای دەکەن، خەڵك پێیوایە نوێژی جەماعەت سوننەتێکی زۆر ئاساییە و ئەگەر ڕۆژێك لە عومردا یان لە مانگێکدا ڕۆژێك یان لە ڕۆژێکدا فەرزێك بەجەماعەت نوێژەکەی بکات ئیتر ئەوە سوننەتە و ئەگەر بیکات خێرێکی زۆری دەگاتێ و ئەگەر نەشیکات گوناهی ناگاتێ!، یان ئەگەر بیکات و نەیکات هەر یەکە خۆ نوێژکردن واجبە جەماعەت واجب نییە!، خەڵکێکی زۆر ئەمڕۆ وا دەڵێ و وا حاڵیی بووە بەڵام ئەتوانین بڵێین وانییە، ئیسلامەتی نوێژی جەماعەتی هەروا بە سادەیی دا نەناوە بۆ مسوڵمانان، زۆر لە زانایان دەفەرموون: نوێژی جەماعەت واجبە!، ئینجا نوێژی جەماعەت ئەگەر سوننەتیش بێ سوننەتێکی موئەککەدەیە، ئینجا با بزانین قازانجەکانی نوێژی جەماعەت لە چی دایە؟ خۆ ئینسان بەدوای قازانجدا دەگەڕێ! ئەگەر دوکانی هەیە، ئەگەر تیجارەتی هەیە...، با بزانین قازانجی نوێژ لەچی دایە؟ هەر بە کورتی قازانجی قیامەتیی دەڵێین هی دونیایی زۆرن حیساب ناکرێن!، ئەوەی کە باسمکرد لە ((مزگەوت))دا بابەتی ئولفەت و یەکترناسین و هاوکاری و تەعاڕف و برایەتی و یەکڕیزی و لیقائو ئەوانەی هەموو تێدانە مزگەوت، هەمووی لە نوێژی جەماعەتیشدا تەحقیق دەبێ بەڵام

وێڕای ئەوانە با بزانین لە فەرموودەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کە بوخاری ریوایەتی کردووە (خوا لێی رازی بێ) لە گەورەیی نوێژی جەماعەت دەفەرموێ: (صَلاةُ الجَماعَةِ تُفضَلُ صَلاةَ الفَذِّ بِسبعٍ وَعِشرينَ دَرَجة)[٥٤] یەکێك لە قازانجەکانی ئەوەیە کە یەك نوێژ بە جەماعەت بەرامبەر بە بیست و حەوت نوێژ هەیە کە بە تەنها بکرێ!!، بۆیە دەڵێین مزگەوت خەزێنەیە کە ئینسان تێیدا بەهرەمەند دەبێ، خەزێنەیەکە بە پلەی سێیەمین لە خەزێنەکانی سەر رووی زەوی، لە یەکێك لە خوتبەکانی رابردوودا ئەو فەرموودەیەم خوێندەوە کە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی[٥٥]: یەك نوێژ لە مزگەوتی مەدینەدا بە هەزار نوێژ هەیە لە مزگەوتەکانی تردا بێجگە لە مزگەوتی حەڕام و قودس!، یەك رکات لە مزگەوتی -مەدینە- پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بە هەزار رکات هەیە لە مزگەوتەکانی تری دونیا!، وە یەك نوێژ لە مزگەوتی حەڕام بە سەد نوێژ هەیە لە مزگەوتی مەدینە، واتە یەك نوێژ لە مزگەوتی حەرام بە سەد هەزار نوێژ هەیە لە مزگەوتەکانی تری دونیا!، بۆیە دەڵێین موژدەتان لێبێ حاجیە بەڕێزەکان ئەوانەی کە ماڵی خواتان بینیوە و حەجتان کردووە ئەوانەی کە دەیانەوێ بچن موژدەتان لێبێ و خوا بە قیسمەتتان بکات و بە قیسمەت ئەوانەش بکات کە نەیانبینیوە و نەیانکردووە!، بەڕاستی نیعمەتێکی گەورەیە

---

[٥٤] ((حدثنا عبد الله بن يوسف قال أخبرنا مالك عن نافع عن عبد الله بن عمر أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال صلاة الجماعة تفضل صلاة الفذ بسبع وعشرين درجة))، صحيح البخاري، كتاب الجماعة والامامة، باب: وجوب صلاة الجماعة، رقم الحديث ٦١٩

[٥٥] ((حدثنا عبد الله بن يوسف قال أخبرنا مالك عن زيد بن رباح وعبيد الله بن أبي عبد الله الاغر عن أبي عبد الله الاغر عن أبي هريرة رضي الله عنه أن النبي صلى الله عليه وسلم قال صلاة في مسجدي هذا خير من ألف صلاة فيما سواه إلا المسجد الحرام))، صحيح البخاري، أبواب التطوع، باب: فضل الصلاة في مسجد مكة ومدينة، رقم الحديث ١١٣٣ ومسند أحمد بن حنبل، جزء ١، صفحة ١٨٤.

یەك ركات نوێژ بە سەد هەزار ركاتی مزگەوتەكانی تری دونیا چونكە بۆیە خوای پەروەردگار ئاوای داناوە خوا حەكیمە و غەیبزانە دەزانێ خەڵك بە زەحمەت دەگاتە ئەو شوێنە بۆیە بەهرەمەندیان دەكات، بۆیان تەعویز دەكاتەوە هی هەموو ساڵەكانی تری عومریان، دەزانێ ودزعێك دادێ ئاوا بەزەحمەت خەڵك حەجی بۆ دەكرێ، ئەگەر لەوێ بەجەماعەت نوێژێ بكا زیاتریش دەكا.

جا خەزێنەی سێیەمینیش مزگەوتەكانن، هەر نوێژێكیش لە مزگەوتدا بە بیست و حەوت نوێژی تر هەیە، سەد هەزار ئینجا ئەویتر هەزار و ئەویتریشیان بیست و حەوت..، سێ خەزێنە هەیە!، جا ئەگەر نەشگەینە مزگەوتی حەرام و مزگەوتی مەدینە، سەدهەزارەكەشمان نەبێ، هەزارەكەشمان نەبێ، با بیست و حەوتەكەمان هەبێ!، ئەگەر تۆ سندوقێ تەماتەت هەبێت لەو بازاڕە بیست و پێنج دینارت بۆ بكات بەڵام لە بازاڕی ئەوبەر سی دینارت بۆ بكات، وە ئەگەر بیبەیتە شارێكی تر پەنجا دینارت بۆ بكات، ئایا نایكەی و بەدوایدا ناچی؟ بێگومان با، بەڵام ئەوە بیست و حەوت نوێژت بۆ دەنوسێ لە بەرامبەر یەك نوێژ!، بەڕاستی نەزانین و نەفامییە كە ئینسان ئەو تیجارەتە نەكات، نەزانی و نەفامییە بۆ خۆی وە زەرەرێكی گەورەیە بۆ قیامەتی خۆی، ئەگەر دەیەوێ خوا لێی رازی بێ با هاموشۆی مزگەوت بكات ئەو نیعمەتە لە دەست خۆی نەدات، پێنج فەرزە لە ماڵەوە بكەی دەكاتە پێنج نوێژ لە شەو و رۆژێك، بەڵام ئەگەر بێی بۆ مزگەوت پێنج بیست و حەوتی بزانە دەكاتە چەند؟ ١٣٥ نوێژ!، سەد و سی و پێنج نوێژ لە كوێ و پێنج لە كوێ؟!!، بۆیە خۆشەویستەكانم ئەوە یەكەمین فەزڵ و چاكە و گەورەیی نوێژی جەماعەتە لە مزگەوتدا.

پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە گەورەیی نوێژی جەماعەتدا بەتایبەت ئەوانەی كە ریزی یەكەمین دەگرن، یان ئەوانەی زوو دێنە مزگەوت، یان ئەوانەی رێگایان دوورە دێن، یان ئەوانەی كە بۆ نوێژی عیشا و بەیانی دێن ئەفەرموێ:

(لَو يَعلَمُ النَّاس مافِي النِّداء وَالصَّفِّ الأوَّل ثُمَّ لَم يَجِدوا إلا أن يَستَهِمُوا عَليه لأستَهَمُوا)[56] واتە: ئەگەر خەڵك بزانێ خێر و پاداشتی بانگدان لەچی دایە و چەندە زۆرە، وە ئەگەر بزانێ خێری نوێژی جەماعەت و ریزی یەکەم چەندە زۆرە وە هیچ شتێك نەدۆزنەوە تەنها پیشك هاویشتن نەبێ لە نێوان خۆیان (قورعە) ئەوا قورعەی لە نێوان خۆیان دەکەن بزانن بۆ کێ بێ ئەو بانگدانە وە ریزی یەکەم بۆ کێ بێ!!، بەڵام ئێمە نایزانین، بۆیە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) ئەفەرموێ: ((ئەگەر بزانن)) بەڵام دیارە نایزانین بۆیە ئاوا لێی بێ ئاگاو غافڵین!، لە فەرموودەیەکی تر کە ئەویشیان ئیمامی بوخاری ریوایەتی کردووە دەفەرموێ: (إنّ أثقَلُ الصَّلوات على المنافقين صَلاة العِشاء والفَجرِ ولو يَعلَمونَ ما فِيهِما أتَوهُما وَلَو حَبواً)[57] واتە: قورسترین نوێژ لەسەر مونافیقەکان نوێژی عیشا و بەیانییە چونکە ئەوان نوێژیان بۆ خوا نییە بۆ ریا و بەرچاوی خەڵکە، لەبەرئەوە بۆ نوێژی عیشا و بەیانی نایێن، یان ئەگەر بشهێن بە قورسی دەیکەن، جا یەکێك لە عەلاماتی نیفاقیش تەمبەڵیکردنە لە نوێژ، تاخیرکردنی نوێژ کە بەداخەوە تاخیرکردنی نوێژیش بۆتە شتێکی عادەتی، نوێژی عەسر

---

[56] ((حدثنا عبد الله بن يوسف قال أخبرنا مالك عن سمي مولى أبي بكر عن أبي صالح عن أبي هريرة أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال لو يعلم الناس ما في النداء والصف الاول ثم لم يجدوا إلا أن يستهموا عليه لاستهموا ولو يعلمون ما في التهجير لاستبقوا إليه ولو يعلمون ما في العتمة والصبح لاتوهما ولو حبوا))، صحيح البخاري، كتاب الاذان، باب: الاستهام في الاذان، رقم الحديث ٥٩٠.

[57] ((عبد الرزاق قال أخبرنا الثوري عن أبي إسحاق عن عبد الله بن أبي البصير عن أبي بن كعب قال صلى بنا رسول الله صلى الله عليه وسلم الفجر فلما سلم قال أشاهد فلان قالوا نعم ولم يحضر الها ثلاثا فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم إن أثقل الصلوات على المنافقين صلاة العشاء والفجر ولو يعلمون ما فيهما أتوهما ولو حبوا وإن الصف الاول على مثل صف الملائكة ولو علمتم ما فضيلته ابتدرتموه وصلاتك مع الرجل أزكى من صلاتك وحدك وصلاتك مع الرجلين أزكى من صلاتك مع الرجل وما أكثر فهو أحب إلى الله))، مصند عبدالرزاق، كتاب الصلاة، باب: فضل الصلاة في جماعة، رقم الحديث ٢٠٠٤

دەکات بەرەبەرەی مەغریبە!، نوێژی مەغریب دەکات بەرە بەرەی عیشایە!، نوێژی نیوەڕۆ دەکات نزیکی عەسر بۆتەوە!، نوێژی بەیانی دەکات نزیکی هەتاو هەڵاتنە!، ئەوانەش خێرەکە زۆر کەمدەکەنەوە! چۆن دەبێ نوێژ تاخیر بکرێ؟! پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: گەورەترین عیبادەت دوای ئیمانهێنان وەکو عیبادەتی تاك (فرد) نوێژە لە کاتی خۆیدا (الصلاةُ عَلَى وَقتِها) وەکو عیبادەتی کۆمەڵ (جماعي) جیهادکردنە لە پێناوی خوا (الجِهادُ في سبيلِ الله)، جا لەڕاستیدا نوێژکردن وەکو عیبادەتێکی فەردی لە وەختی خۆیدا گەورەترین عیبادەتە بۆیە ئینسانی مسوڵمان دەبێ لێی بە ئاگا بێت وە لێی دوانەکەوێ، وە دەشفەرموێ: ئەگەر بزانن چ خێرێك لەو دوو نوێژەدا هەیە (نوێژی بەیانی و عیشا) لەسەر سك و ئانیشکەکان بۆی دەڕۆیشتن بۆ ئەوەی بگەنە مزگەوت!!.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: بەلام ئەگەر تەماشای زیان و زەرەرەکانی ئامادەنەبوون لە مزگەوت و نوێژی جەماعەت بکەین دیارە ئەوانەش زۆرن تەنها ئیکتیفا دەکەین بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کە ئەفەرموێ: (وَالّذي نَفس مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَقَد هَمَمتُ أنْ آمُرَ بِحَطَبٍ فَيُحطَبَ ثُمَّ آمُر بِالصَّلاةِ فَاليُؤَذّن لَها ثُمَّ آمُر رَجُلا فَيَؤُمَّ النَّاس ثُمَّ أُخالِفَ الى رجالٍ فَأُحَرِّقَ عَلَيهِم بُيُوتَهُم)[58] واتە: بەڕاستی نزیکبوو شتێکی وا بکەم بلێم داری سوتاندم زۆر بۆ کۆ بکەنەوە، دوایی بلێم: با بانگدەر بانگبدات، دوایی هەندێ خەڵك ئامادە بکەم بلێم: وەرن با بچین ئەو ماڵانەی کە پیاوەکانیان لە ماڵەوەن

[58] ((حدثنا عبد الله بن يوسف قال أخبرنا مالك عن أبي الزناد عن الاعرج عن أبي هريرة أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال والذي نفسي بيده لقد هممت أن آمر بحطب فيحطب ثم آمر بالصلاة فيؤذن لها ثم آمر رجلا فيؤم الناس ثم أخالف إلى رجال فأحرق عليهم بيوتهم والذي نفسي بيده لو يعلم أحدهم أنه يجد عرقا سمينا أو مرماتين حسنتين لشهد العشاء))، صحيح البخاري، كتاب الجماعة والامامة، باب: وجوب صلاة الجماعة، رقم الحديث ٦١٨

نەهاتوون بۆ نوێژی جەماعەت ماڵەکەیان لەسەر بسوتێنین!!، ماڵ سوتاندن لەسەر ئەو کەسانەی نوێژی جەماعەت ناکەن!، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نەهاتن بۆ نوێژی جەماعەت گوناهە!، وەهاتن بۆ نوێژی جەماعەت فەزیلەیەك و گەورەییەکی زۆرە و گرنگی پێدراوە لە ئیسلامی پیرۆزدا، بەداخەوە کە ئێمە نەك هەر نوێژە جەماعەتەکانمان فەوتاندووە بەڵکو نوێژە تاکەکانیشمان وە نوێژی مسوڵمانە پێشینەکانمان ناچن کە صحابە بەڕێزەکان و سەلەفی صاڵحە، ئەوانە لە نوێژێکدا لەیەك رکاتدا نیوسەعات قورئانیان دەخوێند بەڵام ئێمە نەك هەر نیوسەعات یان دە یان پێنج دەقیقە قورئان ناخوێنین، نەك هەر سورەتی (الإخلاص) لە دوای فاتیحەدا ناخوێنین بەڵکو جاری وا هەیە سورەتی فاتیحەش بە پەلە دەخوێنین نازانین چۆن نوێژەکە تەواو دەکەین!، لەبەرئەوەی بیرمان هەر لە بارودۆخی دونیا و کەسابەت و مەشغەڵەتە بەماڵ و منداڵ و خۆشگوزەرانی دونیا!، یان بە کێشەکانی دونیا، نازانین ئەوەی بەکەڵکماندێ هەر ئەوەیە، یەکەمین شت کە رۆژی قیامەت لە ئینسانی دەپرسرێتەوە نوێژە!، ناشڵێین با نوێژ زۆر درێژبێ بەڵام با نوێژەکە گونجاوبێ، چونکە دەفەرموون: رۆژێك لە رۆژان مەعازی کوڕی جەبەل (خوالێی رازی بێ) نوێژی دەکرد سورەتی (البقرە)ی لە نوێژەکەدا خوێند، کە لەوانەیە هەمووڵاتان بزانن کە ئەم سورەتە چەندە درێژە درێژترین سورەتە لە قورئاندا، لە نوێژێکدا سورەتی (البقرە) بخوێنی زۆرە، سەعات و نیوێك تا دووسەعاتی بەلای کەمەوە دەوێ، دەفەرموێ: یەکێك هات ناوی حازمی کوڕی ئوبەی بوو ئیشی بە پەلەی هەبوو کاروانچی بوو نوێژەکەی دابەست ئەویش تەماشای کرد مەعاز هەر نوێژەکەی درێژکردەوە و ویستی سورەتەکە تەواو بکات، سەلامی دایەوە و چوو لەولاوە نوێژی کرد و بەدوای ئیشی خۆیدا رۆیشت، پاشان چویە لای پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) شکایەتی لە مەعاز کرد، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) مەعازی

بانگکرد و پێی فەرموو: (فَتّانٌ.. فَتّانٌ.. فَتّانٌ) سێ جار فەرمووی: تۆ فیتنەت دەوێ؟ چۆن دەبێ نوێژ ئەوەندە درێژ بکرێتەوە لە کاتێکدا کە خەڵك هەیە ئیشی هەیە؟!، ئەوجار پێی فەرموو: برۆ سورەتەکانی مام ناوەندی بخوێنە کە ئەو سورەتانەن کە لەدوای سورەتی (الحُجُرات) دێن، یانی سورەت هەیە سێ لاپەرەیە و چوار لاپەرەیە و سورەت هەیە دوو لاپەرەیە و بەلانی کەمەوە دوو لاپەرەیە، هەرچۆنێك بێ نوێژ بە چارەگێك هەتا نیوسەعات یان بیست دەقیقە تەواو دەبێ، بەڵام ئێمە بە دوو دەقیقە نوێژەکانمان تەواو دەکەین! نازانین چۆن نوێژەکانمان تەواو دەکەین؟! بۆیە نوێژی جەماعەت بەرەکەتەکەی لەوەدایە کە ئینسان لەگەڵ ئیمامدا نوێژ دەکات وە حەرەکات و سەکەناتی تەواوە، گوێدەگرێ لەهەر حەرفێکی قورئان خێرێکێ دەگاتێ لە نوێژەکەدا وە غەڵەتیش ناکات!، ئەو هەڵسان و دانیشتن و حەرەکاتەی بەخێرا لە ماڵەوە زۆرتر فێری بووە، تەنانەت لە نوێژی جەماعەتدا پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئامۆژگارییەکمان دەکات دەفەرموێ: سەرتان پێش ئیمام لە سوژدە و رکوعدا بەرز مەکەنەوە، یان پێشتر مەڕۆنە سوژدە، وە پێشی ئیمام مەکەونەوە لە حەرەکاتدا، ئەفەرموێ[٥٩]: ئایا ناترسن ئێوە کە سەرتان بەرزدەکەنەوە پێش ئیمام سەرتان ببێتە سەری گوێدرێژ؟!، دیارە ئەوە خەتەرێکە بەڕاستی!، ئینسان نابێ وەپێش ئیمامی بکەوێتەوە، ئینسان لە نوێژی جەماعەتدا فێری ئیدارە و نیزام دەبێ، جا با ئێمەش وریابین ئەو عیبادەتە لەدەست خۆمان نەدەین فریای نوێژی جەماعەت بکەوین، تەماشا بکەین ینەکێکی وەکو عومەری کوڕی خەتتاب (خوالێی رازی بێ) رۆژێکیان عەسر بوو گەڕایەوە گوێی لە بانگی عەسر نەبوو لەناو باخچەکەی خۆی بوو هەتا گەڕایەوە نوێژی جەماعەتی عەسر کرابوو بە نوێژی جەماعەت رانەگەیشت، فەرمووی:

---

[٥٩] المنتقى لابن الجارود، كتاب الصلاة، باب: القراءة وراء الامام، رقم الحديث ٣٢٥.

لەبەرئەوەی ئەو باخچەیەم ئەو نوێژە جەماعەتەی لە دەستدام دەبێ ئەو باخچەیە بکەمە خێر، یەك نوێژی جەماعەتی لە دەستچووە یەك باخچەی کردۆتە خێر!، وتوویەتی: ئەو باخچەیە بوو بویە هۆی ئەوەی کە ئەو نوێژە جەماعەتەی لە دەستدام!، ئینجا گلەیی لە صەحابەکان دەکرد دەیوت: بۆ نایێن تەعزیەم لێ بکەن بڵێن: (أعظَمَ اللهُ أجرَك) خوا پاداشتت بداتەوە و بۆت قەرەبوو بکاتەوە، خۆ ئەگەر کورێکم مردبایە هەموو خەڵك دەهات و وای دەگووت، ئەی بۆچی ئێستا نوێژێکم بە جەماعەت فەوتاوە کەس ناڵێ خوا بۆت پڕبکاتەوە!، خۆ ئەوە گەورەترە عیبادەتی قیامەتی لە دەستداوم!، کوڕ هەردەبێ بمرێ ئەمڕۆنا سبەی، لەڕاستیدا ئەوانە بەرلەوەی پیاوی دونیا بن پیاوی قیامەت بوون، مەردی دونیا و قیامەت بوون!، با ئێمەش ئەگەر نەشتوانین وەکو ئەوان بین بابتوانین وردە وردە شوێنپێیان هەڵگرین و هەندێ شتمان وە ئەوان بچێ، بەلای کەمەوە ئەگەر نوێژمان نیوسەعاتیش نەبێ با بتوانین نوێژەکانمان سێ دەقیقە و چوار و پێنج دەقیقەی پێبچێ!، با بتوانین لە نوێژی جەماعەتدا ئامادەبین و نوێژی جومعە نەفەوتێنین کە هەر کەسێ سێ نوێژی جومعە (سێ خوتبە) نەیەتە مزگەوت بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) یەکێك لە نیشانەکانی مونافیقەکانی تێدایە!!.

جا لە خوای پەروەردگار داواکارین، دەپاڕێینەوە و دەڵێین: یارەببی خوایە بمانکەی بە ئەهلی مزگەوت، یارەببی خوایە نوێژی جەماعەتمان لەلا خۆشەویست بکەی، خوایە مزگەوتمان لەلا خۆشەویست بکەی، خوایە مزگەوتەکانمان بۆ عیززەتمەند بکەی، خوایە مزگەوتەکانمان زیاتر ئاوەدان بکەیتەوە، یارەببی خوایە مزگەوتەکانمان بۆ بکەی بە مایەی سەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی ئیسلامەتی، خوایە لە مزگەوت فێری دین و تاعەتمان بکەی، لە قورئان و سوننەت شارەزاترمان بکەی، یارەببی خوایە تەوفیقمان بدەی بۆ

ئەوەی بتوانین لە مزگەوتەکانمان لە ماڵەکانی تۆدا لە مانگی رەمەزانی پیرۆز عیبادەتی تۆ بکەین یا رب العالمین، خوایە تەوفیقمان بدەی بۆ ئەوەی بە مسوڵمانێتی بژین و بە مسوڵمانێتی بمرین، یارەببی خوایە تەوفیقمان بدەی بۆ ئەوەی بتوانین عیبادەتی راستەقینەی تۆ ئەنجام بدەین، یارەببی خوایە شیفای نەخۆشییەکانمان بهێنی، خوایە لە مردووەکانمان خۆشبی، خوایە مسوڵمانان سەربخەی لە هەموو دونیا، خوایە تەوفیقیان بدەی بەسەر دوژمنانیاندا، خوایە دوژمنانیان سووك و ریسوا بکەی.

ئامین

أقولُ قَولِي هَذا وَأستَغفرُاللهَ لي و لَكُم وَلِسائِرِالمُسلِمينَ فَاستَغفروهُ إِنَّهُ كانَ غَفَّاراً، أعُوذُ بِاالله مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم

(رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)

آمين

# مافەکانی منداڵ لەسەر باوك و دایکی ( ١ )

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاس وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ ٦- التحريم

# بسم الله الرحمن الرحيم

إنَ الحَمدَ لِلهِ نَحمـدُهُ و نَـستَعينُهُ ونَـشكُرُهُ وَنَـستَهديه، ونَعُـوذُ بِـالله مِـن شُرورِ أنفُسَنا وَمِن سَيِّئات اَعمَالِنا، من يَهدِه اللهُ فَلا مُضِل لَه، وَمن يُضلِل فَلا هادِي لَهُ..، ونَشهَدُ أن لا الهَ الا اللهُ وحدَهُ لاشَريك لَهُ، وَتشهَدُ أن سيدَنا وَنَبينَا محمَداً عَبده وَرَسُولهُ.. هَذا الرَّسُولُ الذِي بَلَغَ الرِّسَالةَ وَأدَّى الامانَةَ و نَصحَ الامَّةَ وَجَاهَدَ فِي اللهِ حَقَ جِهَادِهِ وَتَرَكَنا عَلى الحجَة البَيضاء، لَيلُها كَنَهارِها، لايَزيغُ عَنها إلا هَالِك، صلَواتُ اللهِ وسلامُهُ عَليه وعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ وَمَن دَعى بِدَعوتهِ إلى يـومِ الدِّين... اَمَا بَعدُ عِبادَ اللهِ أُوصِيكُم وَنَفسِي أَوَلاً بِتَقـوَى اللهِ وَطاعَتِـهِ، فـإنَ اللهَ مَعَ الَذِينَ اتَّقُوا وَالذِينَ هم مُحسُنون، قَالَ اللهُ (سبحانه وتعالى) فـي كتابـه الحَكـيمِ القُرآن، بِسمِ اللهِ الرَحمنِ الرَحِيم ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَـالاً كَثِيراً وَنِـسَاءً وَاتَّقُـواْ اللّـهَ الَّـذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ ١- النساء.

سـوپاس و سـتایش بـۆ خـوای گـەورە، درووود و سـەلام بـۆ سـەر گیـانی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ، ئیمانداراني بـەرێز: رەحمـەتی خـوای پـەروەردگار لەسەر ئێوەو هەمووو مسوڵمانانی دونیا لەوڕۆژە پیرۆزەدا، لە خوای پەروەردگار دەپاڕێینەوە کە لەدەردو بەڵاو ناخۆشی یەکانی زەمانـە بمانپـارێزێ وە ئـاخیری عومرمان خێربکا، وە بە مسوڵمانی بمانژێێنێ و بەمسوڵمانیش بمانمرێنێ.

بەرێزان: زۆرن ئەو باوك و دایکانەی کە ئەمڕۆ لەبەردەستی کوڕەکانیـان یـان منداڵەکانیان دەناڵێنن..!، زۆرن ئەو باوك و دایکانەی ئەمڕۆ لەبەرنارەحەتییان

لەبەردەستی كوڕ و كچەكانیان ڕۆژانە دەیان دوعا دەكەن بۆ ئەوەی لەدەستیان بچن و بمرن!، لە كۆڵیان ببنەوە، زۆرن ئەو باوك و دایكانەی كە ئەمڕۆ كوڕەكانیان ڕۆیشتوون بۆ هەندەران (خاریج) پرسیشیان پێنەكردوون و ئێستا بە داخی ئەو منداڵانەوە لە ماڵەكانیان ناڕەحەتن!، وە لەناو خەڵكدا خۆیان پێ شەرمەزار و عەیبدارە بەهۆی خراپەی منداڵەكانیانەوە، ئەگەر بپرسین بۆچی؟! بۆ دەبێ وابێ باوك خۆی پێ لە بەرامبەر خەڵكیدا شەرمەزاربێ؟، بۆ باوك و دایك دوعا لە منداڵەكانیان بكەن؟! بۆ باوك و دایك ئەوەندە ناڕەحەت و پڕ دەردەسەری بن لە بەرامبەر منداڵەكانیان؟!... بێگومان دەڵێین لەبەرئەوەی ئەمڕۆ باوكان و دایكان گەورەترین وەزیفەی خۆیان لە بەرامبەر منداڵەكانیاندا پشتگوێ خستووە!، ئەمیش بریتییە لە وەزیفەی پەروەردەكردن و پێگەیاندن بەپێی شەریعەتی ئیسلام، دوێنێ باوكان و دایكان مافی منداڵەكانیان پێشێل كردووە ئەمڕۆش منداڵەكان مافی باوكان و دایكان پێشێل دەكەن!، زۆركەس وادەزانێ مافی منداڵ هەر ئەوەیە پارەی بداتێ و ئارەزووەكانی تێر بكات و جلوبەرگی بۆ بكڕێت و هەرچی ویستی بۆی جێبەجێ بكات!!، بەڵام نازانێ كە منداڵەكانی بەهۆی پشتتێكردنی لەڕووی پەروەردەوە دوایی لێی دەبنە دڕك و بەڵا و موصیبەت، پاشان پێی چارەسەر ناكرێن!، خوای پەروەردگار كە ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاس وَالْحِجَارَةُ﴾ ٦- التحريم، واتە: ئەی ئیماندارینە خۆتان و ماڵ و منداڵتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن، پاراستنی منداڵەكان لە ئاگری دۆزەخ مەسئولییەتێكە لەسەر شانی باوكان و دایكان، خوای پەروەردگار ڕوو لە ئەوان دەكات، ئینسان چەندە بەغەمی خۆیەوەیە خۆی لە ئاگری دۆزەخ بپارێزێت و بچێتە بەهەشت دەبێ بە غەمی منداڵەكانیشییەوە بێ كە ئەوانیش بچنە بەهەشت و نەچنە دۆزەخ، بەڵام بەهۆی چی؟، نەك لەبەرئەوەی كە جلوبەرگیان بۆ ناكات یان پارەیان پێنادات یان ئارەزووەكانیان تێر ناكات، بەڵكو لەبەرئەوەی لە قۆناغی

منداڵێتیدا مافی منداڵەكانیان نەداوە!، جا بێگومان باوكان و دایكان مافیان هەیە لەسەر منداڵەكان و منداڵەكانیش مافیان هەن لەسەر باوكان و دایكان، هەربۆیە لە وتاری ئەمڕۆدا بەكورتی گرنگترین ئەو مافانەی منداڵەكان باس دەكەین بەسەر باوكەكان و دایكانیشەوە بەڵام زیاتر بەسەر باوكانەوە.

پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (مامِن مَولودٍ إلا یولَد عَلَى الفِطرَة)[٦٠] واتە: هەموو منداڵێك لە دایك دەبێ بە فیترەتێكی خواپەرستی لە دایك دەبێ، لەسەرەتادا ئەو منداڵە خواپەرستە، فیترەتەكەی سەلیم و پاكە!، (فَأَبَواهُ یُهَوِّدانِه أَو یُمَجِّسانِه أَو یُنَصِّرانِه) فەرمووی: دوای ئەوەی لە دایك دەبێ باوك و دایكن دەبنە هۆكار جا یان دەیكەن بە جوولەكە یان دەیكەن بە مەجوسی (ئاگر پەرست)، یان دەیكەن بە گاور و نەصرانی، كەوابوو مەسئولییەتی باوك و دایك مەسئولییەتێكی گەورەیە!، باوك و دایك جاری وا هەیە دەبنە رێخۆشكەر و رێپیشاندەر بەرەو بەهەشت، بەرەو سەعادەتی دونیا و قیامەتی منداڵەكان، جاری واش هەیە بەرەو دۆزەخ و نەگبەتی و بەڵا و موصیبەتی دونیا و قیامەتی منداڵەكەیە، جارێ لە منداڵییدا هەستی پێناكات بەڵام كە گەورەبوو لەدەستی دەرچوو ئەوجار ئاخ و ئۆف دەكێشێ پەشیمانیش داد نادات، منداڵ نیعمەتێكی گەورەیە ئەگەر صالح بێت چونكە بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ منداڵی صالح ئەگەر كوڕبێ یان كچ یەكێكە لەو سێ شتانەی كە مردوو لێی سوودمەند دەبێ!، وەكو فەرمووی: (وَلَدٌ صالِحٌ یَدعو لَهُ) پاش صەدەقەی جاریە، پاش عیلمێك كە بەجێی هێشتووە و خێری بۆ دەچێ، منداڵێكی صالح

[٦٠] ((حدثنا عبدان أخبرنا عبد الله أخبرنا یونس عن الزهري قال أخبرني أبو سلمة بن عبد الرحمن أن أبا هریرة رضي الله عنه قال قال رسول الله صلى الله علیه وسلم ما من مولود إلا یولد على الفطرة فأبواه یهودانه أو ینصرانه أو یمجسانه كما تنتج البهیمة بهیمة جمعاء هل تحسون فیها من جدعاء ثم یقول فطرة الله التي فطر الناس علیها لا تبدیل لخلق الله ذلك الدین القیم سورة لقمان))، صحیح البخاري، كتاب الجنائز، باب: إذا أسلم الصبي فمات، رقم الحدیث ١٢٩٢

كە دوعا بۆ دایك و باوكی دەكات لە دوای مردنیان ئەوا دایكان و باوكان لێی بەهرەمەند دەبن، منداڵی صالح نەك هەر نیعمەتە بۆ دونیا، باوكان و دایكان پێی سەربەرزن و فەخر و شانازی پێوە دەكەن، وە پێی سەربڵندن لەناو خەڵكدا، بە ئەمانەتی و وەفاو راستگۆیی و دەستپاكیی و خوورەوشتی چاك و بە هەڵسوكەوتی جوان لەناو خەڵكدا، لەناو هاورێكانیدا، لەگەڵ مامۆستاكانیدا، لەگەڵ دراوسێكانی، لەگەڵ ئەهلی گەرەك، بەڵكو لە قیامەتیشدا پێی سەربەرزن و مایەی بەهرەمەندبوون و پلە بەرزبوونەوەی باوكان و دایكانن!!، بۆیە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەرە ﷺ فەرمووی: (تُرفَعُ للمَيِّتِ بَعدَ موتِهِ دَرَجَتُهُ فَيَقُولُ يارَبّي أَيُّ شَيءٍ هذا؟، فَيَقولُ وَلَدُك إستَغفَرَلَك)[٦١] دەفەرموێ: باوكان و دایكان دوای مردنیان پلەیان بەرزدەبێتەوە وردە وردە، رۆژی قیامەت پلەیان وا بەرز دەبێتەوە باوك دەڵێ خوایە ئەوە چییە، چی روویداوە پلە و دەرەجاتی ئێمە بەرزدەبێتەوە؟!!، فەرمووی: ئەوە منداڵەكەتە لە دوای مردنی تۆ دوعات بۆ دەكات بۆیە پلەكانی تۆ بەرز دەبنەوە، بۆیە منداڵی چاك نیعمەتێكی گەورەیە، كێ ئەو نیعمەتە كەسب دەكا؟، بەهۆی كێوە خوای پەروەردگار ئەو نیعمەتە دێنێتە بەرهەم؟، بەهۆی باوكان و دایكانەوە!.

**با بزانین گرنگترین ئەو مافانە چین كە منداڵەكان هەیانە بەسەر باوكان و دایكانەوە؟:**

**یەكەم: پەیداكردنی دایكێكی مسوڵمان**، هەر لەكاتی داخوازی ئافرەتدا پیاوی مسوڵمان دەبێ بیر لەوە بكاتەوە كە ئەو ئافرەتە دەبێتە دایكی منداڵەكانی!، ئەو دایكە ئەگەر چاك بێ منداڵەكانی چاك دەردەچن، وە ئەگەر خەراپ بێ منداڵەكانیشی خەراپ دەردەچن!، بۆیە دەبێ ئەوكاتەی كە داخوازی ئافرەتێك دەكا رەچاوی ئەوە بكات بەیانی ئەو ئافرەتە دەبێتە بەرپرس و

[٦١] الادب المفرد لامام البخاري، صفحة ٢٨، رقم الحديث ٣٦.

سەرپەرشتیار و خاوەنی منداڵەکانی، ئافرەت قوتابخانە و مەدرەسەیە، ئافرەت مامۆستایە لە ماڵەوە، ئەگەر مامۆستا خەراپ بوو قوتابییەکانیش خەراپ دەبن!، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (تُنكَحُ المَرأَةُ لاربَعٍ: لِمالِها وَلِحَسبِها وَجَمالِها وَلِدينِها) واتە: ئافرەت لەبەر چوار شتان داخوازی دەکرێ: یان لەبەرئەوەی جوانە، یان لەبەرئەوەی دەوڵەمەندە، یان لەبەرئەوەی خاوەنی شۆرەتە و کچی ئینسانێکی خانەدان و بەناوبانگە، یانیش خاوەنی دین و ئەخلاقە، بۆیە فەرمووی: (فَاظْفَر بِذاتِ الدِّينِ تَرِبَت يَداك) واتە: ئەو ئافرەتەی دینی هەیە داخوازی بکەو مەبەستت بێ، ئەوە خووڕەوشتی ئیسلامەتی هەیە چونکە تۆ دەکەویتە ناو ئیسراحەت!، زۆرن ئەوانەی کە ئەمڕۆ بەدەستی خێزانەکانیشیانەوە دەناڵێنن کە نازانن منداڵەکانیان پەروەردە بکەن لەبەرئەوەی کاتی خۆی کە داخوازیانکردووە بیریان لە خووڕەوشت و دینی خێزانەکانیان نەکردۆتەوە بەڵکو زیاتر فکریان لە جوانی و دەوڵەمەندی ئافرەتەکە کردۆتەوە، فکریان لە سومعە و پلەوپایەی ئەهل و بەیتی ئافرەتەکە کردۆتەوە!، گەورەترینی خۆشیەکانی دونیا بریتییە لە ئافرەتی چاك!، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الدُّنيا مَتاعٌ وَخير مَتاع الدنيا المَرأَةُ الصَّالِحة)[٦٢] واتە: دنیا خۆشییەکی کاتییە، چاکترین نیعمەت و خۆشی دونیا بریتییە لە ئافرەتی چاك، ئینسانی مسوڵمان ئافرەتێکی باشی هەبێ، خێزانێکی چاکی هەبێ لە گەورەترین نیعمەتدا دەژی!، چەند خۆشە ئینسان لە ماڵەوە کێشە و موشکیلەی نەبێ، سەربلند بێ بە خێزانەکەی، پەروەردەی منداڵەکانی بەشێوەیەکی ئیسلامەتی پیادە بکات، وە لە هەموو رووەکانەوە پێی سەربلندبێ چەند

[٦٢] ((حدثني محمد بن عبد الله بن نمير الهمداني حدثنا عبد الله بن يزيد حدثنا حيوة أخبرني شرحبيل بن شريك أنه سمع أبا عبد الرحمن الحبلي يحدث عن عبد الله بن عمرو أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال الدنيا متاع وخير متاع الدنيا المرأة الصالحة))، صحيح مسلم، كتاب الرضاع، خير متاع الدنيا المرأة الصالحة، رقم الحديث ١٤٦٧

خۆشــە!!، بۆیــە خۆشەویــستەکانم ئەگــەر دەمانــەوێ منداڵــەکانمان صــالّح بــن، کچەکانمان صالّیحە بــن، دەبــێ خۆمــان و براکانمــان و کورەکانمــان لــە ســەرەتای داخوازیکردنی ئافرەتەوە حیساب بۆ ئەوە بکەن ئەو ئافرەتانــە دەبــن بــە دایکــی منداڵەکانیان و دەبێ حیساب بۆ ئەو رۆژە بکەن کە چۆن پەروەردەیان بکەن؟.

**دووەم: هەڵبـژاردنی نـاوێکی شـەرعیی خـۆش بۆ منداڵـەکان**، نـاو هەیە حەلاڵە و ناویش هەیە حەرامە!، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فـەرمووی: (إِنَّكُم تُدعَونَ يَوم القِيامةِ بِأسماءكُمْ وَأسماء آبائِكُمْ فَأحسِنُوا أسماءَكُم)[63] واتــە: ئێوە بە ناوی خۆتان و باوکتانەوە لە قیامەتێ بانگ دەکرێن جا ناوی چـاك لـە خۆتان بنێن!، وە فەرمووشی: (أَحَبُّ الاسماءِ الَى اللهِ عَبدُالله وَعَبدُالرَّحمن)[64] واتە: خۆشترین ناو لەلای خوا (جل جلالە) نـاوی (عَبدُالله) و (عَبدُالرَّحمن)ە، کـە ئەفەرموێ: ئـەو دوو نـاوە خۆشـترینیانن، وە ناوەکـانی پێغەمبـەر ﷺ وەکـو: موحەممەد و ئەحمەد و مەحمود....هتد، بەلاّم بەداخەوە ئـەمرۆ کەســی واهەیـە پێی عەیبە ناوی لە کورەکەی بنێ (عبدُالله)!، کەسی وا هەیە پێی عەیبە ناوی لە کورەکەی بنێ (موحەممەد) ﷺ!، لێـرەو لـەوێش جارجـار دەبیـستینەوە کـە تەنانەت لە دائیرەکاندا (کاتب نفوس)ی وا هەیـە موناقەشـە لەگـەڵ باوکـان و دایکان دەکات لە وەختی قەیدکردنی منداڵەکانی و پێیان دەڵێ: بۆ ناوتان نـاوە موحەممەد ؟!، یان دەڵێ بۆ ناوتان ناوە (عَبدُالله)؟!، لەبەرئەوەی عەبدی خوایـە!، پێــی دەڵــێ بــۆ نــاوت نــاوە موحەممــەد؟، دەڵــێ: لەبەرئــەوەی موحەممــەد ﷺ

---

[63] ((حدثنا عمرو بن عون قال أخبرنا ح حدثنا مسدد قال ثنا هشيم عن داود بن عمرو عن عبد الله بن أبي زكريا عن أبي الدرداء قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم إنكم تدعون يوم القيامة بأسمائكم وأسماء آبائكم فأحسنوا أسماءكم قال أبو داود بن أبي زكريا لم يدرك أبا الدرداء)) سنن أبي داود، كتاب الادب، باب: في تغير الاسماء، رقم الحديث ٤٩٤٨.

[64] صحيح مسلم، كتاب الاداب، باب: النهي عن التكني بأبي القاسم وبيان ما يستحب من الاسماء.

پێغەمبەرمە، بۆ ناوت ناوە (أَلياس)؟، لەبەرئەوەی یەکێکە لە پێغەمبەرەکان، بۆ ناوت ناوە (موصعەب) یان (ئەنەس)؟، لەبەرئەوەی یەکێکە لە ئەصحابەکانی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام)، موناقەشەیەکی دووروودرێژی لەگەڵ دەکات لەبەرئەوەی ناوێکی بێگانەی لە ئەورووپاوە نەهێناوە لە کوڕ و کچەکەی بنێ!، لە کاتێکدا ئەگەر لێی بپێچیەوە لەوانەیە بۆخۆی ناوی ئەحمەد یان موحەممەد یان مەحموود بێ، ئەی ئەگەر لێی بپرسی بۆچی ناوت ئەحمەدە؟، دەڵێ: باوك و دایکم نەیانزانیوە ناوم لێبنێن!!، ئەو کەسەی موناقەشە لەگەڵ باوکان و دایکان دەکا لەسەر ئەو ناوانە کە ناوی پیرۆزن ئەوە لە چەند حاڵەتێك بەدەر نییە: یان رقی لە ئیسلامە!، لەبەرئەوەی هەر ناوێك بۆنی یادکردنی خودای لێبێ (جل جلاله) وشەی عەبدی بەسەرەوەبێ پێی ناخۆشە، دڵی پێ تێکدەچێ، وە هەرناوێك بۆنی پێغەمبەری لێبێ ﷺ پێی نارەحەت دەبێ!، وە هەرناوێك بچێتەوە سەر صحابیەکان پێی نارەحەت دەبێ، یانیش باوکان و باپیرانی خۆی پێ نەفام و بێ عەقڵ بووە کە ناویان لەو ناوە ئەحمەد!!، ئەگەر خۆیشی ناوی ئەحمەد و موحەممەد و طە و یاسین نەبێ باوکی یەکێکە لەو ناوانە!، دەبێ باوکان و باپیرانی نەفام و بێ عەقڵ بووبن کە ناویان لە ئێمە ناوە ئەحمەد و موحەممەد و عَبدُالرَّحمَن و عَبدُاللە و...هتد، وەك بڵێی شەرمان بەو ناوانە بێ!!!، یان ئیحتیمالی هەیە پێی وا بێ کە دەبێ ناوی منداڵەکانیش لە ئەورووپا بێنین لەبەرئەوەی نیشانەی پێشکەوتنە!!، پێیوایە ئەگەر ناوی منداڵەکانی هەروا تەقلیدی ئەورووپا بێ ئەوا میللەتەکەمان پێشدەکەوێ!، هیچ نەماوە خۆمان تەقلیدی ئەورووپا نەکەین تەنها ناوەکانمان ماوە!، (کاسترۆ) و (گیڤارا) و (سلیڤانا)و هەموو ئەو ناوانەی کە ئەمرۆ لە ئەورووپاوە دێنە کوردستانی ئێمە!، دەبێ ئێمە ناوەکانمان نەمابن؟!!، ناوی چاکمان نەماوە؟!!!، چ بەرد و شاخی کوردستان نییە ناومانی لە کوڕ و کچەکانمانی بنێین تەنها

دەبێ كەسێك كە نازانین چۆن مردووە؟ چ كافرێكە و لە كوێ مردووە؟ ئەمڕۆ بێنین ناوی لە كوڕ و كچەكەمانی بنێین!!، ئەوە چەندی بەچەندی و بەوە چ هەڵدەگرێ؟، بۆیە دەڵێین باوكان و دایكان خۆیان سەرپشكن ناوی چاك بۆ منداڵەكانیان هەڵبژێرن، وە ئەگەر ناوەكان خۆش نەبن و شەرعیی نەبن لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو كوڕ و كچانە شكایەت لە باوكان و دایكانی خۆیان دەكەن!، وە كاتێك كە گەورەش دەبن پێیان شەرمە لەناو خەڵكدا بەو ناوە ناو بهێنرێن!، هی وا هەیە ناوی كافرێكی لێنراوە كە گەورە دەبێ مسوڵمانێكی مولتەزیمە!، چی بكا ئەو كەسە؟ دەبێ ناوی خۆی بگۆڕێ!، لەبەرئەوە مافێكە لە مافەكانی منداڵ كە ناوێكی شەرعیی جوان و خۆشی لێبنرێ.

**سێیەم: سوننەتەكانی دوای لە دایكبوون بۆ منداڵ پیادە بكرێ**، بەكورتی دەڵێین: شیرینكردنی دەمی منداڵ بە خورما یان بە شتێكی تر كە (تَحليك)ی پێدەڵێن، وە بانگ لە گوێی ڕاستە دانی و قامەت لە گوێی چەپەدا كردنی، وە سوننەتكردنی و لە هەمانكاتیشدا سەرتاشینی (حَلق) كە بەگرانایی ئەو مووانەی زیو بكاتە خێر، وە (هۆزەبانە) كە بۆ كوڕان دوو مەڕە (لە فەرمودەیەكدا هاتووە یەكێكیشیان هەر دەبێ)، وە بۆكچانیش یەكێكە، وە پاشان دایك بۆی هەیە دوو ساڵی تەواو شیر بداتە منداڵەكەی: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ﴾ ٢٣٣- البقرة، كە زۆرجار دایك زوڵم لە كوڕەكەی یان كچەكەی دەكات بەوەی پێش ئەوەی بگاتە دوو ساڵی شیری لێ دەبڕێتەوە ئەوەش لە كاتێكدا كە منداڵەكە پێویستی پێیەتی گوناهێكە.

**چوارەم: مافێ هەرە گرنگ بەسەر دایكان و باوكان پەروەردەكردنی منداڵەكەیە!**، لە سەرەتادا دەبێ ئیمان و عەقیدە لە دڵ و دەروونی ئەو منداڵەدا جێگیر بكرێ!، هەر لە تەمەنی چوار ساڵیدا وشەی (لاالە الا اللە) لە مێشك و دڵ و دەروونی ئەو منداڵەدا دەبێ بچەسپێنرێت!، مافی ئەو

منداڵەیە بەسەر دایك و باوكییەوە، خۆشەویستی خودای لە دڵدا بڕوێنرێ، ئینجا وردە وردە خۆشەویستی پێغەمبەری ﷺ لە دڵدا بڕوێنرێ و بۆی باسبکرێ، چونکە وەختێك كە گەورە بوو لە قسەی پێغەمبەر ﷺ دەرناچێ لەبەرئەوەی بە منداڵی ئەو خۆشەویستییەی وەرگرتووە، پیاوێك دێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کەس ئامادە نییە ژنی بداتێ لەبەرئەوەی رەشئەسمەرە!، ئەویش بۆی داخوازی دەكات لە پیاوێك كە كچەكەی بداتێ پیاوەكەش بە پێغەمبەر دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خوا با بچمەوە ماڵەوە پرسێك بە كچەكەم و خێزانەكەم بكەم، پێغەمبەریش رێگای پێدەدات، (دیارە ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە كچان دەبێ پرسیان پێ بكرێ كە بەشوو ئەدرێن)، كە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بە خێزانەكەی گوت پێغەمبەرمان ﷺ داوای كچەكەمانی كردووە بۆ فلأنە كەسە، دایكیشی سەرەتا موافق بوو بەڵام كە زانی بۆ فلأنە كەسەی رەشئەسمەرە و رەنگ و روخساری رەشە گوتی: رازی نیم كچەكەی خۆم بدەمە ئەو ئینسانە!، كاتێ كە كچەكەی گوێی لێبوو لەو قسانە و ئەو گفتوگۆیەی باوك و دایكی زۆر تورە بوو هاتەبەرامبەریان و گوتی: ئێوە چۆن ناترسن لە خوا كە قسەی پێغەمبەر ﷺ دەشكێنن؟!!، مادام پێغەمبەر فەرموویەتی بۆ ئەو ئینسانە پێغەمبەر من بەزایەع نادات!، لەبەر ئەوە من رازیم و قبوڵم نییە قسەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بشكێنن!، منداڵ ئەگەر بە پەروەردەیەكی ئیسلامەتی پەروەردە بكرێ لە داهاتووشدا كە گەورە بوو ئاوا دەبێ!، خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ وای لێكردووە كە قسەی پێغەمبەر ناشكێنێ!.

یەكێكی دیكە لە مافەكانی منداڵ بەسەر باوك و دایكیەوە ئەوەیە: لە تەمەنی حەوت ساڵیدا دەبێ فەرمانیان پێ بكرێ نوێژ بكەن كوڕان و كچان، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (مُرُوا أَولادَكُم بِالصَّلاةِ وهُم أَبناءُ سبع

سنین)[٦٥] واتە: ئەمر بە منداڵەكانتان بكەن لە حەوتساڵیدا نوێژ بكەن، نوێژیان فێربكەن، (وَاضرِبُوهُنَّ عَلَيها وَهُم أبناءُ عَشر) واتە: لە دە ساڵیدا ئەگەر نوێژیان نەكرد لێیان بدەن، (وفَرِّقُوا بَينَهُم في المَضاجِع) فەرمووی: لە دە ساڵی جێگایان لێكتر جودا بكەنەوە، نابێ كچ و كوڕ پێكەوە بخەون لە ماڵەوە!، وە باشتروایە لە یەك ژووردا نەخەون، بەڵام ئێمە بەپێی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) هەڵسوكەوت ناكەین، كە كردوویەتی بە دوو قۆناغ: قۆناغێك هەتا دە ساڵیی، قۆناغێكیش لە دە ساڵیی بەسەرەوە، ئەوانەی كە ئەمڕۆ لە دەست كوڕ و كچەكانیان دەناڵێنن و بێزارن ئەنجامی ئەوەیە لە قۆناغی یەكەمدا منداڵەكانی خۆیانیان ئیهمال كردووە!، هەتا دە ساڵ دەچێ بە كوڕەكانیان ناڵێن: چاكە بكەن و خەراپە مەكەن!، بابێن پەروەردەیەكی ئیسلامەتییان فێر بكەن، ئەوەیان نەكردووە!، خۆشەویستی خوا پاشان پێغەمبەرەكەی، وە خۆشەویستی مزگەوت و مسوڵمانان لە دڵیاندا نەڕوێنراوە هەتا دەگاتە دە ساڵ، كە دە ساڵیش بەسەرەوە تێپەڕی منداڵ زۆر شت دەبینێ و برادەرەكانی كاریگەری (تأسیر)ی خەراپی لەسەردادەنێن ئەوكاتە لەدەست باوك ودایكی دەردەچێ!، بۆیە لە قۆناغی حەوت ساڵی تا دەساڵی دەبێ ئەو منداڵە قورئانی فێر بكرێ بەپێی توانا، وە فێری خوێندەواری بكرێ، ئەو باوك و دایكانە دەبێ مامۆستا بۆ منداڵەكەیان بگرن، بینێرن بۆ مزگەوت، بیكەن بە قوتابی قورئان، چونكە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (مَن قَرَأَ القُرآنَ وَعَمِلَ بِه ألبَس اللهُ والِدَيهِ تاجاً يَوم القِيامة، ضَوءهُ أحسَنُ مِن ضَوءِ

[٦٥] ((حدثنا مؤمل بن هشام يعني اليشكري ثنا إسماعيل عن سوار أبي حمزة قال أبو داود وهو سوار بن داود أبو حمزة المزني الصيرفي عن عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم مروا أولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع سنين واضربوهم عليها وهم أبناء عشر وفرقوا بينهم في المضاجع))، سنن أبي داود، كتاب الصلاة، باب: متى يؤمر الغلام بالصلاة، رقم الحديث ٤٩٥.

الشَّمسِ) ئیمامی موسلیم ریوایەتی كردووە، دەفەرموێ: هەر كەسێ قورئان بخوێنێ و كاری پێ بكا رۆژی قیامەت خوای پەروەردگار تاجێكی پڕ لە گەوهەر لەسەر سەری باوك و دایكی ئەو منداڵە (ئەوكەسە) دادەنێ كە رووناكی ئەو تاجە جوانترە لە رووناكی خۆر!، بەهۆی چی؟ بەهۆی ئەوەی كوڕەكەیان یا كچەكەیان قورئانی خوێندوە و یەكێكە لە هەڵگرانی شیعاری قورئان، كاری پێدەكات و بڵە تەقوایە، باوك و دایكی فەقیرحاڵی ناحاڵیی واشمان هەیە پێی ناخۆشە كوڕەكەی بچیتە مزگەوت و قورئان بخوێنێ!، پێی ناخۆشە كچەكەی بچێتە لای فلانە ئافرەتە و قورئانی پێبڵێ!، وا ئەزانێ ئەگەر چویە مزگەوت لە دەستی دەچێ!، نازانێ ئەوە نیعمەتێكە بۆ قیامەت!!، نازانێ ئەگەر كوڕەكەی قورئانخوێن بێت ئەو قورئانخوێندنەی كوڕەكەی هەر خێرێكی پێبكات خێرێك دەگاتەوە باوكی و دایكی!، لەبەرئەوە ئەوان هۆكارن وە پاڵپشتی ئەو كوڕە یاخود ئەو كچەیان كردووە، چونكە: (مَن دَلَّ عَلى خَيرٍ فَلَه مِثلُ أجرِ فاعِلِه)[66] ئەگەر باوكان و دایكان رێگای چاك بە كوڕ و كچەكانیان نیشان بدەن هەر كاتێك كە خێرێك دەكەن بۆ دایك و باوكانیشیان دەگەڕێتەوە بەڵام بە پێچەوانەشەوە ئەگەر رێگایان بۆخەراپە نیشان بدەن هەر گوناهێك دەیكەن گوناهێكیش بۆ باوكان و دایكان دەگەڕێتەوە!.

بۆیە هەر لە قۆناغی یەكەمدا پێویستە باوك كوڕەكەی لەگەڵ خۆی بهێنێ بۆ مزگەوت و نوێژی جەماعەت، لەگەڵ خۆی بیگێرێ بۆ مەجلیسی پیاوان، لە سەفەردا جارجار لەگەڵ خۆی بیگێرێ، لەگەڵ زانایانی ئایینی دایبنیشێنێ، مامۆستای چاكی بۆ بگرێ، دایك دەبێ كچەكەی بنێرێتە لای ئافرەتی چاك، هاوڕێی چاك بۆ كچەكەی دیاری بكا و پێی بڵێ لەگەڵ كێ هاتوچۆ دەكەیت؟

---

[66] صحيح مسلم، كتاب القسامة والمحاربين والقصاص والديات، باب: بيان إثم من سن القتل، رقم الحديث ١٦٧٧

کێ سەلام و کەلامی لەگەڵت هەیە؟، ئینجا فێری راستگۆیی و دەستپاکی و تەنانەت فێری ئادابی خواردنی بکات!..، وەکو پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بە منداڵێکی فەرمووی: (سَمِّ اللهَ وَكُل بِيَمِينِك وَكُل مِمّا يَلِيك)[٦٧] واتە: ئەی غولام (ئەی منداڵە) بسم الله بکە لە کاتی خواردندا وە بەدەستی راستیشت بخۆ وە لەلای خۆشت را بخۆ!، بەدەستی راستت نان بخۆ و ئاو بخۆرەوە چونکە شەیتان بە دەستی چەپ ئاو دەخواتەوە و خواردن دەخوات!، بۆیە ئینسانی مسوڵمان دەبێ دروشمەکانی ئیسلامەتی پێوە دیاربن و هەر لە منداڵییەوە منداڵەکەی رابهێنێ، ئینجا لە کاتێکدا کە چاکەیەکی لە دەستدێ بەخششی بداتێ و سوپاسی بکات بۆ ئەوەی ئەو منداڵە هەست بکات باوکی یان دایکی سوپاسی دەکات لەو کاتەی کە چاکەیەکی ئەنجامداوە، وە ئەگەر هەڵەیەکیشی لە دەستهات موحاسەبەی بکات، نەك هەر لێی نەپێچێتەوە هەر غەڵەتێك بکا و لەگەڵ کێ دەگەرێ شەو نیوەشە و بێتەوە ماڵێ باوك نەڵێ: کورەکەم لە کوێ بویت؟ دایك نەڵێ: کچەکەم لەگەڵ کێدا بویت؟، بۆیە دەبێ بەراستی باوکان و دایکان (قُدوة حَسَنة) بن، مامۆستا بن، تەنانەت درۆی بەگاڵتەش لەلای منداڵەکان نەکرێ کە بەداخەوە دایکان فێربوون رۆژی وا هەیە دەیان درۆ لەگەڵ کورەکانیان یان کچەکانیان دەکەن وا ئەزانن بەدرۆ حیساب نییە!، لە هەمانکاتدا پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئەفەرموێ: (مَن قالَ لِصبِيٍّ تَعالَ هاكَ

[٦٧] ((حدثنا علي بن عبد الله أخبرنا سفيان قال الوليد بن كثير أخبرني أنه سمع وهب بن كيسان أنه سمع عمر بن أبي سلمة يقول ثم كنت غلاما في حجر رسول الله صلى الله عليه وسلم وكانت يدي تطيش في الصحفة فقال لي رسول الله صلى الله عليه وسلم يا غلام سم الله وكل بيمينك وكل مما يليك فما زالت تلك طعمتي بعد))، صحيح البخاري، كتاب الاطعمة، باب: التسمية على الطعام ولأكل باليمين، رقم الحديث ٥٠٦١.

ثُمَّ لَم يُعطيهِ فَهِي كَذِبَةٌ»[68] واتــە: هــەر كەســێ بــە منــداڵێك بڵــێ: هــا وەرە ئەوشتەت بدەمێ، دوایی نەیدایێ ئەوە بەدرۆ لەسەری حیسابە!، یان دایــك بــە كورەكەی دەڵێ: وەرە مەگری دەتبەمە ماڵی خاڵت، دواییش نایبات كــە ئــەوە بە درۆ لەسەری حیسابە!، ئایا دایكــان رۆژێ چــەند درۆ لەگــەڵ منداڵــەكانیان دەكەن بەو شێوەیە دوایی منداڵەكانیش فێری درۆ دەبن!!، یاخود باوكان!، بۆیە دەبێ منداڵەكان رابێن لەسەر خوورەوشتی چاك، منداڵ لــە ماڵــەوە تەماشــای باوك و دایكی خۆی دەكات ئەوان چی بكەن تەماشایان دەكــرێ وە تەحــەمولی مەسئولییەتی دونیا و قیامەتیش دەكەن!.

بۆیە خۆشەویستەكانم، پێویستە ئەوەش بڵێین كە عیلم و ئــەدەب بەیەكــەوەن، كەسێك عیلمی هەبێ بــەڵام ئــەدەبی نــەبێت بەكــەڵك نایــێ!، وە كەســێكیش ئەدەبی هەبێ بەڵام عیلمی نەبێ ئەویش وەكو دارێكی بێبەر وایە!، بۆیــە ئــەبو زەكــەریای عەنبــەری دەفــەرموێ: «علـم بـلا أدَب كَنـارٍ بِـلا حَطَـب» واتــە: زانستێك ئەگەر خوورەوشتی چاكی لەگەڵــدا نــەبێ وەكــو ئاگرێــك وایــە بــەبێ سووتەمەنی!، «وأدَبٌ بِلا عِلمْ كَرُوحٍ بِلا جِسمْ» واتە: وە خوورەوشتێك زانــستی لەگەڵدا نەبێ وەكو روحێكی بێ لەش وایە!، بەیەكەوە هاوتەریب بەكەڵك دێــن، زۆر كوڕی وا هەیە عیلمیشی پێیە بەڵام ئەدەبی نییە بەڵام نازانێ هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكی بكات و ئەخلاقی باشی نییە، وە زۆر كەسی وا هەیــە ئــەدەب و ئەخلاقیشی هەیە بەڵام عیلمی نییە، دەبێ بەیەكەوە بڕۆن بۆ ئەوەی كــە بزانــێ چۆن خواپەرستی دەكات.

---

[68] «حدثنا عبد الله حدثني أبي ثنا حجاج قال ثنا ليث قال حدثني عقيل عن بن شهاب عن أبـي هريرة عن رسول الله صلى الله عليه وسلم انه قال من قال لصبي تعال هاك ثم لم يعطيه فهي كذبة»، مسند إمام أحمد، جزء٢، صفحة ٤٥٢، رقم الحديث ٩٨٣٥.

جا خۆشەویستەکانم: نامانەوێ وتارەکە زۆر درێژ بکەینەوە بەڵام ئەوەندە دەڵێین کە بەڕاستی ئەگەر منداڵ لەسەر پەروەردەی ئیسلامەتی پەروەردە بکرێ و رابهێنرێ باوك و دایکان لە گەورەییدا تام و لەزەتەکەی لێودردەگرن! پێی سەربڵند دەبن و شانازی پێوە دەکەن!، وەکو ئەو منداڵانەی کە لە پێش ئێمەدا تەئریخی ئیسلامەتی بە نموونە دەیانهێنێتەوە:

عبداللە ی کوڕی عومەر بەلای شوانێکدا تێدەپەرێ کە منداڵێکە، سەلامی لێدەکات و بە منداڵەکە دەڵێ: ئەی کاکی شوان مەڕێکمان لەو مەڕانە پێنافرۆشی؟، ئەویش دەڵێ: هی من نییە، دەڵێ: قەیدی ناکا.. ئەگەر خاوەنەکەی هاتەوە بڵێ گورگ خواردوویەتی!، شوانە منداڵەکەش دەڵێ: فَأينَ الله: ئەدی خودا نابینێ، خودا لە کوێیە؟!! خۆ خودا دەمانبینێ! چۆن من ئەو درۆیە بکەم؟!، ئەو منداڵە ئەو قسە مەنتیقی و بەهێزەی لە بەرامبەر عبد الله ی کوڕی ئیمامی عومەر فەرموو بۆیە عبداللە کە گەڕایەوە لە رێگا هەر ئەو قسەیەی دووبارە دەکردەوە و دەیفەرموو: فَأينَ الله؟..، قسەی ئەو کوڕە گەنجەی دووبارە دەکردەوە، منداڵێك کە لەسەر ئەساسی دین و عەقیدە و ئیمان پەروەردەکرابێ ئاوا دەبێ!.

ئەبوحەنیفە بەلای منداڵێکدا تێدەپەرێ گەمەویاری بە قوڕێ دەکات، بە منداڵەکەی دەڵێ: ئاگات لەخۆ بێ لە قوڕێ نەچەقی!، منداڵەکەش دەڵێ: من ئاگام لەخۆیە بەڵام تۆ ئاگات لەخۆت بێ! من ئەگەر لە قوڕێشدا بچەقم هیچ زیانم بۆ خەڵك نییە بەڵام ئەگەر تۆ لە قوڕێ بچەقی عالەمێك لە قوڕێ ئەچەقێت!! تۆ ئاگات لەخۆ بێ!، ئەو منداڵە ئاوا عاقڵ و بیرتیژ تێگەیشتووە کە ئەگەر زانایەك هەڵە بکات میللەتێك هەڵە دەکات و سەرەنجامی خەراپ دەبێ، بۆیە ئەبوحەنیفە (خوا لێی رازیبێ) ئەفەرموێ: دوای ئەوە هەموو جارێ یەك

# مافەکانی منداڵ لەسەر باوک و دایکی ( ٢ )

﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ وَإِن جَاهَدَاكَ عَلى أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ * يَا بُنَيَّ إِنَّهَا إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي السَّمَاوَاتِ أَوْ فِي الْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ * يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ * وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ * وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ﴾ ١٣-١٩ لقمان.

# بسم الله الرحمن الرحيم

إنَ الحَمدَ لِله نَحمَدُهُ و نَستَعينُهُ ونَستَغفِرُهُ وَنَستَهديه، ونَعُوذُ بِالله مِن شُرُورِ أنفُسَنا وَمِن سَيِّئات أعمَالِنا، مَن يَهدِه اللهُ فَلا مُضِل لَه، وَمن يُضلِل فَلا هادِي لَهُ..، ونَشهَدُ أن لا الهَ الا اللهُ وَحدَهُ لاشَريكَ لَهُ، وَنشهَدُ أن سيدَنا وَنَبينَا محمَداً عَبده ورسُولُه، هَذا الرَّسُولُ الذِي بَلَّغَ الرِّسَالةَ وَأدَّى الامانَةَ، ونصَحَ الامَّةَ وَجَاهَدَ فِي الله حَقَ جِهَادِهِ حَتى أتاهُ اليَقِين، صلَوات الله وسلامُهُ عَليه وعَلى ألِه صلاةً وسَلاماً إلى يَومِ الدّين... أمَّا بَعدُ ياعِبادَ الله أُوصِيكُم وَنَفسِي أوَلاً بِتَقوَى الله وَطاعَتِه، ولُزُمِ أوامِرِهِ وكَثرَةِ مخافَتِهِ، فإنَ التَّقوى شِعارُ المُؤمِنينَ ودِثارُ المُتَّقين ووصِيَّةُ الله سُبحانَهُ وتعالَى فيَّ وفي النَّاسِ أجمعين، أعوذُ بِالله مِن الشَّيطانِ الرَّجيم ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ ١- النساء، ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ ١٨- الحشر.

ئیماندارانی بەڕێز، ئەی خۆشەویستانی خودا و پێغەمبەری خودا ﷺ، سەلام و میهرەبانی خوای پەروەردگار بڕژێتە سەر ئێمە و هەموو مسوڵمانانی دونیا لەم رۆژە پیرۆزەدا، لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە و دەڵێین: یاڕەببی خوایە رووی رەحمەتی خۆتمان تێبکەی، یاڕەببی خوایە بەگوناهی ئێمە لەگەڵمان نەکەی، یاڕەببی خوایە دەرگای رەحمەتی خۆتمان لەسەر دانەخەی، خوایە خۆمان و ماڵ و منداڵ و ئەهلی وڵات و نیشتیمانمان لە بەڵاو ئافاتی زەمانە بپارێزی.

بەرێزان: ئەگەر بە وردی چاوێك بگێڕین بە واقیعی ئەمڕۆی مسوڵمانان لە دونیا، یان چاوێك بگێڕین بە ئوممەتی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی لە کۆمەڵگای مسوڵمانان، وە پاشانیش چاوێك بگێڕینەوە بە رابردووی زێڕینی خۆمان لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و ئەصحاب (رضي الله عنهم)دا، ئەو سەردەمەی کە خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ ١١٠- آل عمران، واتە: ئێوە باشترین ئوممەتن ئەی ئوممەتی موحەممەد ﷺ کە بۆ سەر رووی زەوی هاتوون چونکە ﴿تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾ ١١٠- آل عمران، واتە: فەرمان بە چاکە ئەکەن و ریٚ لە خەراپە دەگرن، وە باوەڕتان بە خوای پەروەردگار هەیە و بە مسوڵمانی دەژین، چ کاتێك ئوممەت (خَيْر أُمَّةٍ)ە؟ چ کاتێك ئێمەی مسوڵمان باشترین کەسین لەسەر رووی زەوی؟، وەختێك کە فەرمان بە چاکە بکەین و رێگا لە خراپە بگرین، وە هەروەها بە مسوڵمانی بژین..، تەماشا دەکەین لە نێوان ئوممەتی ئیسلامی رابردوو و ئوممەتی ئیسلامی ئەمڕۆ جیاوازییەکی زۆر زۆر دەبینین!، جیاوازی لەڕووی پەروەردە، لەڕووی بانگەواز، لەڕووی بەخۆوە خەریکبوون و بە دونیاوە خەریکبوون!، جیاوازی لە بابەتە شەخسی و نەفسییەکان و خۆپەرستیی (أنانية) کە هەرکەس بۆخۆی مەشغوڵی دونیا بێت و ئاگای لە برای خۆی نییە!!، بابەتی حوکم و یاسای ئیسلامەتی کە فەرامۆشکراوە!، بابەتی حوکمڕانیی دەوڵەت و، پاراستنی کیانی مسوڵمانان و، موقەددەساتی ئیسلام و، بەدەم کێشەی یەکتریەوە هاتن زۆر جیاوازە!!، لە کاتێکدا لە سەردەمی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) لەسەر ئیهانەکردن بە ئافرەتێك پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) جەنگێك بەرپا دەکات بەلاٚم ئەمڕۆ لە ولاٚتان لەهەر کویٚ هەن مسوڵمانان ئیهانە دەکرێن و دەربەدەر دەکرێن و لێیان دەدریٚ و مەزلومن، هەموو هەواڵەکانیش خۆمان دەیبیستین کەچی دوعاشیان

بۆ ناکرێ، تەزوومان بە لەشدا نایێ، بەڕاستی ئەوە نیشانەیەکە لە بێ هێزی باوەڕ و ئیمانی خۆمان!.

یەکێك لەو بابەتانەی کە ئێمەی مسوڵمان فەرامۆشمان کردووە بابەتی (پەروەردە)یە!، پەروەردەی نەفسی خۆمان پاشان پەروەردەی نزیکترین کەسی خۆمان کە ماڵ و منداڵمانن، جاران کۆمەڵگا (مُجتمَع)ی مسوڵمانان لە سەردەمی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئەم ئەرکە جێبەجێ کراوە پاشانیش خولەفای راشیدین و دوای ئەوانیش هەتا گەیشتووە بە ئێمە وردە وردە کاڵ بۆتەوە لەسەر ئەساسی پەروەردەی رۆژانەی مسوڵمانان هاتووە، لەسەر ئەساسی ئیسلام و ئیمان و تەقوا و مزگەوت..، بەڵام ئەمڕۆ لەبەرئەوەی ئەو پەروەردەیەمان وازلێهێناوە ئێستا ئەوە دەبینین کۆمەڵگای مسوڵمانان چۆنە!!، دونیا چۆن پڕ لە فەساد و بەڕەڵایی و بەدڕەوشتیی بووە!، ئەوەی دەمەوێ لە وتاری ئەمڕۆدا بە تایبەتی ئاماژە پێ بکەم پەروەردەکردنی منداڵەکانە، یان مافەکانی منداڵەکان بەسەر دایك و باوکەوە، لە هەندێك لە وتارەکاندا بە کورتی ئاماژەمان بە هەندێ بابەت کردووە بەڵام ئەمڕۆ بە تایبەتی قسە لەسەر (مافەکانی منداڵ بەسەر دایك و باوکەوە) دەکەین، ئومێدەوارم کە هەندێ رێنومایی هەیە باوکان و دایکان پیادەی بکەن یان گەنجەکانمان لە کوڕان و کچان تێبینی بکەن بۆ ئەوەی لە پاشەڕۆژدا کاتێك ماڵێك بەیەکەود دەنێن و ژیان بەسەر دەبەن ئەو خاڵانە رەچاو بکەن.

بەڕێزانم: مەسئولییەتی باوك و دایك لە قیامەتدا زۆر قورسە!، ئەگەر ئەرکی خۆیان جێبەجێ نەکەن جگە لە گونهباری لە دونیاشدا دەکەوێتە بەر هەڕەشە و گلەیی و گازاندە و سەرکۆنەی تەئریخ، ئەگەر باوکێك دایکێك کوڕەکەی یان کچەکەی چاك دەرچێ هەم لە دونیادا پێی سەربەرزە، لەناو خەڵك پێی

سەربەرزە، لە سەفەردا یان لەگەڵ جیرانەکانی یان لەگەڵ میوانەکانی یان لە قوتابخانە یان لە موعامەلەی بازاڕدا پێی سەربەرزە!!، بەپێچەوانەشەوە ئەگەر منداڵەکەی خەراپ دەرچێ کچ بێ یان کوڕ پێی سەرشۆڕە خەجاڵەتمەند و پەشیمانە لەناو خەڵك!، پێی شەرمە بڵێ فلانە منداڵە یان فلانە کەسە کوڕی منە یاخود کچی منە!، یان هەر خزمی منە!، حاشای لێدەکات لەبەرئەوەی خەراپ دەرچووە!، ئەمە ئەنجامی چییە؟، ئەوە هەمووی ئەنجامی بێ غەمی باوکان و دایکانە کە لە منداڵییەوە گرنگیان بە منداڵەکەیان نەداوە!، جا لەوانەیە جانیبێکی گرینگی پێدابێ بەڵام جانیبەکانی تری واز لێهێناوە، منداڵ هەر لەخۆیەوە نابێتە کەسێکی چاك ئەگەر کوڕبێ یان کچ!، مەسئولییەتی لەسەر شانی باوك و دایکە.

منداڵ نەك هەر لە دونیادا ئەگەر چاك بێ نیعمەتێکی گەورەیە بەڵکو لە دوارۆژیشدا نیعمەتە ئەگەر ئینسان بە ئیمانەوە بمرێ و منداڵی چاکی لە دوا جێبمێنێ چەندە خۆشە ئینسان وەکو زەخیرەیەك وردە وردە لە دونیادا چاکەی بۆ دێ بۆ ئەوەی لە قیامەتدا دەوڵەمەندبێ!!، چاکەکانی بەرەکەتدار بن و پێی دەوڵەمەند ببێ!!، فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) ئەفەرموێ: (إذا ماتَ الانسان انقَطَعَ عَمَلُهُ إلا مِن ثَلاثة، إلا مِن صَدَقَة جارية، أو عِلمٌ يُنتَفَعُ بِهِ، أو وَلَدٌ صَالِحٌ يَدعُو لَهُ)[69] واتە: ئەگەر بەنی ئادەم مرد هەموو کردەوەکانی لێ دەپچڕێن تەنها سێ شت نەبێ: صەدەقەی جاریە، خۆتان زۆرجار بیستوتانە کە خێرێکی نەبڕاوە بەجێبهێڵی، شتێك بەجێبهێڵی لەناو

[69] ((حدثنا يحيى بن أيوب وقتيبة يعني بن سعيد وابن حجر قالوا حدثنا إسماعيل هو بن جعفر عن العلاء عن أبيه عن أبي هريرة أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال إذا مات الانسان انقطع عنه عمله إلا من ثلاثة إلا من صدقة جارية أو علم ينتفع به أو ولد صالح يدعو له))، مسند إمام أحمد، جزء ٢، صفحة ٣٧٢، رقم الحديث ٨٨٣١.

مسوڵمانان بەردەوام مسوڵمانان ئیستیفادەی لێ بکەن و سوودی لێ ببینن، پاشان زانست و زانیارییەك یاخود ئامۆژگاری بە نووسین بە وتار بە هەرشێوەیەك لەناو میللەتەکەت و خەڵکی دەوروبەرتدا بەجێبهێڵی و ئیستیفادەی لێ بکرێ بۆ دوارۆژی خۆت بەردەوام ئەو خێرەت پێدەگات، وە سێیەمینیشیان منداڵی چاك کچ بێ یان کوڕ دوعای بۆ بکات!، جا منداڵ نەك هەر کوڕ و کچ بەڵکو نەوە و نەوەی نەوەش دەگرێتەوە بەرەو خوار، واتە باپیرە گەورەیەك چەندە منداڵی لەدوا بەجێبمێنن هەتا دونیا خەراپ دەبێ ئەو چاکانەی وردە وردە بۆ دەچن چونکە گرنگی پێداون!، زانایان دەفەرموون تەنانەت پێغەمبەر نوح (علیه الصلاة والسلام) کە دوای ئادەم باپیرە گەورەی ئێمەیە چەندە چاکە بکرێت لە چاکەکانی ئوممەت چاکەیەك بۆ ئەوە لەبەرئەوەی خۆی هەوڵی داوە ئەو ئوممەتە ببێتە خواپەرست و ئەولادەکانی خواپەرست بن!!، جا ئێمەی مسوڵمانیش دەبێ وا چاوەڕێ بکەین و وا تەماشا بکەین کە ئەو مەسئولییەتە بەڕاستی مەسئولییەتێکی قورسە کە یان دەبێتە نیعمەتێکی گەورە وە یان خوا نەخواستە دەبێتە خەجاڵەتییەك هەم لە دونیا و هەم لە دوارۆژیش!، چەندە ناخۆشە بڵێن: ئەوە فلانە کەس کە کوڕێکی خەراپە کوڕی فلانە کەسە!، یان فلانە کچە فلانە ئافرەتە کچی فلانە کەسە لە فلانە گەڕەکدا، ئینسان شەرمی پێی هەبێ!، بەڕاستی زۆر ناخۆشە بۆیە بەر لەوەی ئەو مەسئەلەیە بێتەپێش و ئەو پێناخۆشبوونەی بێتەسەر لە سەرەتادا گرنگی پێبدە!.

منداڵی چاك نیعمەتێکی گەورەیە لە قیامەت -وەکو باسکرد- بەردەوام ئەو خەیراتە بۆ ئینسان دێت تەنانەت لە رۆژی قیامەتدا وەکو پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (تُرفَعُ لِلمَيِّتِ دَرَجَتُهُ يَومَ القِيامَةَ فَيَقُولُ يارَبّي أَيُّ شَيءٍ هذا؟، فَيَقولُ وَلَدُكَ إستَغفَرَلَكَ) واتە: بەردەوام پلە و پایەی مردوو لە رۆژی قیامەتدا بەرز دەبێتەوە، پرسیار دەکات ئەی خوای خۆم ئەوە چییە پلە و پایەم بەردەوام

بەرز دەبێتەوە؟، خوداش دەفەرموێ: ئەوە منداڵەکەی خۆتە لە دونیا خێر و چاکەت بۆ دەنێرێ داوای لێخۆشبوون و دوعات بۆ دەکات!، هەتا منداڵ دوعا بۆ باوك و دایكی یان باپیر و داپیرەی خۆی بکات بەردەوام لە رۆژی قیامەتدا سزای سووك دەبێ و دەرەجاتی بەرز دەبێ!!، جا چەندە بەخۆتەوە خەریکی ئەوەندەش بە منداڵەکانتەوە خەریك بە چونکە منداڵەکانیشت ئەگەر چاك بن هەر زەخیرەی تۆن، وە ئەگەر خەراپیش بن هەر زەخیرەی تۆن!، زۆرن ئەوانەس ئەمڕۆ لەبەردەستی کوڕەکانیان دەناڵێنن!، زۆرن ئەو باوکانەی ئەمڕۆ شەرمیان بە کوڕەکانی خۆیانیانە!، زۆرن ئەو باوکانەی ئەمڕۆ لەبەردەستی کوڕەکانیان خۆ دەشارنەوە نازانن چی بکەن؟، کوڕەکانیان بە قسەیان ناکەن!، لە قسەیان دەردەچن و رێز و حورمەتیان ناگرن، ئیهانەیان دەکەن، زۆرن ئەو دایکانەی بەهەمان شێوە لەبەردەستی کوڕەکان و کچەکانیان دەناڵێنن!، بێ ئەدەبییە بۆ کوڕان و کچان لە بەرامبەر باوك و دایکیاندا دەنگ بەرزبکەنەوە چ جای بێ ئەدەبی تر!!، تەنها دەنگ بەرزکردنەوەیان لە بەرامبەر باوك و دایکیاندا بێ ئەدەبییە!، بەڵام تۆ بڵێی ئەو ئەنجامەی ئێستا کوڕەکان و کچەکان وەدەستیان هێناوە بەرهەمی باوکان و دایکان نییە؟!!، ئەتوانین بڵێین زۆرێك لەو بەرهەمە هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە سەر باوکان و دایکان!، چونکە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (مامِن مَولودٍ إلاَّ يُولَدُ عَلَى الفِطرَة)[70] واتە: هەموو منداڵێك کە لە دایك دەبێ بە مسوڵمانی لە دایك دەبێ، (فَأَبَواهُ يُهَوِّدانِه أَو يُمَجِّسانِهِ أَو يُنَصِّرانِهِ) باوك و دایك دوای ئەوە یان دەیکەن بە مەسیحی (گاور) یان دەیکەن بە جولەکە یان دەیکەن بە ئاگرپەرست (مَجوسي)، ئەو منداڵە کە لە دایك دەبێ بێ گوناهە، منداڵێکی پاکە، بەڵام ئەگەر باوك و دایك لە ماڵێکدا ئەهلی دین و تەقوا بن منداڵەکەش تەماشایان دەکات، وە ئەگەریش لە سیاحە

---

[70] صحيح البخاري، كتاب الجنائز، باب: إذا أسلم الصبـي فمات، رقم الحديث ١٢٩٢

و سەفەری گوناهو نادی و مـەلها و گەشـت و گـوزارو بـێ دیـنی و خەراپـە و خەراپەكاریدا ژیانیان بەسەر بەرن خـۆ دیـارە منداڵـەكانیش تەماشـای ئـەوان دەكەن، زۆرجار دیقەتمانداوە كاتێك كە سەردانی ماڵێكمان كردووە وەختێك كـە گوتراوە با نوێژی جەماعەت بكەین لەگەڵ چـەند برایـەك یـان خـاوەن ماڵەكـە كوڕەكان زۆر بەسەر سوڕمانەوە تەماشای نوێژی جەماعـەت و چـۆنییەتی ئـەو نوێژە و حەرەكات و سەكەناتی نوێژەكەیان كردووە!، ئەوە هۆیەكەی دەگەڕێتەوە سەر ئەوە كە نوێژكردن و نوێـژی جەماعـەت لـەلای ئـەو منداڵانـە غەریبـە!، رۆژێك لە رۆژان باوكی دەستی منداڵەكـەی نـەگرتووە بـۆ مزگـەوت!، دەسـتی نەگرتووە بۆ لای كۆڕی مسـوڵمانان بۆ ئەوەی گوێی لە ئامۆژگاری مامۆستایەك بگرێ، بۆ ئەوەی بێتە مزگەوت و لە نوێژی جەماعەتـدا بـەژداری بكـات، بـۆ ئەوەی كە فێربێ ببێتـە ئـەهلی مزگـەوت و خۆشەویـستی مزگـەوت لـە دڵ و دەروونیـدا جـێگیر بـێ، لەبەرئـەوە وەكـو گـوتراوە: ((چـی بـچێنی ئـەوە دەدووریەوە!))، لە ماڵێدا باوك و دایك چ حەرەكاتێك بكەن منداڵەكانیش ئـاوا فێر دەبن!، بۆیە مەسئولییەتێكی قورسە برا بەڕێزەكانم!!.

## لە مافەكانی منداڵ بەسەر باوك و دایكەوە:

**یەكەم: كە لەگـەڵ گەنجەكانمـە پێویستە بیر لـەوە بكەنەوە** ئەگـەر دەیانەوێ منداڵەكانیان صـاڵح بـن، كوڕەكانیـان صـاڵح دەرچـن و كـچەكانیان صاڵیحە دەرچن با هەوڵبدەن دایكێكی مسوڵمانیان بۆ پەیدا بكـەن!، وەختێـك كە بیر لە ژنهێنان و داخوازی ئافرەتێك دەكەیتەوە تەنها بیر لە ئارەزووی خـۆت مەكەوە، بیر لە پاشەڕۆژی منداڵێكیش بكەوە كە دوایی خوای گەورە دەتداتێ، ئەگەر دایكەكە مسوڵمان نەبێ، ئەهلی دیـن و تـەقوا نـەبێ ئـەو كـوڕەی كـە تەمەننات وایە ببێتە پیاوێكی چاك وەكو خۆت یاخود لەبەردەستی ئیـسراحەت

بكەی كاتێك كە گەورە دەبێ و لە دوای مردنت دوعات بۆ بنێرێ ئەوە نابینی و بە پێچەوانەوە دێتەبەر!، بۆیە سەرەتا یەكەم مافی منداڵ ئەوەیە دایكێكی مسوڵمانی بۆ پەیدا بكەی، باوكانیش ئەگەر دەیانەوێ نەوەكانیان صاڵح و صاڵیحە بن با كچی چاك و ئافرەتی چاك بۆ كورەكانیان بدۆزنەوە!، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (تُنكَحُ المَرأةُ لاربَعٍ: لِمالِها ولِحَسبِها وَجَمالِها وَلدينِها)[71]، واتە: ئینسان لەبەر چوار شتان ئافرەتێك داخوازی دەكات: یان لەبەرئەوەی ئافرەتێكی دەوڵەمەندە، یان لەبەرئەوەیە كە ئافرەتێكی جوانە، یان لەبەرئەوەیە كە ئافرەتێكی خانەدانە و نەسەبێكی بەرزی هەیە، یان لەبەرئەوەی كە ئافرەتێكی مسوڵمانەو بە دین و ئەخلاقە، (فَاظْفَر بِذاتِ الدِّينِ تَرِبَت يداك) ئەو ئافرەتە بخوازە كە دین و ئەخلاقی هەیە ئەوكاتە دەكەویتە نێو خۆشی راحەت و گوزەرانی چاك لە دونیا و هەم لە قیامەتدا پێی سەربەرز و سەرفراز دەبی!، لەبەرئەوە دەبێ ئینسانی مسوڵمان كاتێك كە نیازی داخوازیكردنی ئافرەتێكی هەیە بیر لە ئەدەب و ئەخلاقی رەسەنی ئیسلامەتی بكاتەوە، وە لە هەمانكات دەبێ خوشكی مسوڵمانیش ئەگەر دەیەوێ منداڵەكانی صاڵح و صاڵیحە بن، ئەگەر دەیەوێ ماڵێكی بەختەوەر لە دونیا پێكەوەبنێ با بیر لەوە بكاتەوە شو بە پیاوێكی مسوڵمان بكات، نەك تەنها بەدوای پارە و سەیارە و خۆشی دونیادا بگەرێ كە دوایی ئەوانە هەمووی دەبنە ناخۆشی!، جوانی تەنها ماوەیەكە دوای ئەوەی كە ئەگەر دین و ئەخلاقی تێدا نەبوو لەبەر چاوی ئینسان دەبێزرێ!، دەوڵەمەندی تەنها ماوەیەكە ئەگەر كەسێك دەوڵەمەند بوو

[71] ((حدثنا مسدد حدثنا يحيى عن عبيد الله قال حدثني سعيد بن أبي سعيد عن أبيه عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال تنكح المرأة لاربع لمالها ولحسبها وجمالها ولدينها فاظفر بذات الدين تربت يداك))، صحيح البخاري، كتاب النكاح، باب: الإكفاء في الدين، رقم الحديث ٤٨٠٢.

ئەوکاتە منەتی بە دەوڵەمەندایەتی ئافرەتەکە نامێنێ!، وە بەهەمانشێوە خانەدانی و پلە و پایە و مەنصەبی خەزورانیش داد نادەن بە ئینسان وەختێك کە ئافرەتەکە لەگەڵ پیاوەکەیدا رێکوپێك نەبوو!، بۆیە خۆشەویستەکانم: یەکەم مافی منداڵ ئەوەیە دایکێکی مسوڵمانی بۆ پەیدابکرێ، پاشان دوعا بکەی لەکاتی داخوازیدا وە لە کاتی گواستنەوەیدا وە لە کاتی سەرجێییشدا!، لەوکاتەدا کە ئەو پیاوە لەگەڵ خێزانەکەیدا جووت دەبێ پێویستە بڵێ: (اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيَاطِينَ وَجَنِّبِ الشَّيطانَ ما رَزَقْتَنا)[72] خودایە شەیتان لە ئێمە دوور بخەرەوە، وە شەیتان لەو منداڵەشمان دوور بخەرەوە کە دەماندەیتێ، ئەوکاتە شەیتان زەرەری لێنادات، بۆیە سوننەت وایە حەدیسی صەحیحی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) شەوێ لەسەر جێدا ئەو دوعایە بکرێ بۆ ئەوەی منداڵەکەت توشی زەرەر و زیان نەبێ و دوایی شەیتان دەستی لێنەدات!.

**دووەم: بەجێهێنانی سوننەتەکانی پێغەمبەر** (علیه الصلاة والسلام) لە منداڵێتی ئەو منداڵەدا، لەوانە: سوننەتەکانی رۆژی لە دایکبوون، شیرینکردنی دەمی منداڵەکە (تحليك) جا ئەگەر بە خورما بێ یان بە شتێکی شیرین بێ دەمی شیرین بکرێ، سوننەتی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) کە ئەوەی کردووە لەگەڵ حەسەن و حوسێنی نەوەکانی (کوڕانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب)، وە لە هەمانکاتدا بانگدان لەگوێی راستی وە قامەتکردن لە گوێچکەی چەپی، ئەوانە کە سوننەتی پێغەمبەرن (علیه الصلاة والسلام) وە پیادەی کردوون، سوننەتن بۆ

---

[72] ((حدثنا علي بن عبد الله قال حدثنا جرير عن منصور عن سالم بن أبي الجعد عن كريب عن بن عباس يبلغ به النبي صلى الله عليه وسلم قال لو أن أحدكم إذا أتى أهله قال بسم الله اللهم جنبنا الشيطان وجنب الشيطان ما رزقتنا))، صحيح البخاري، كتاب الوضوء، باب: التسمية على كل حال وعند الوقاع، رقم الحديث ١٤١

ئێمەی مسوڵمانیش کە لەکاتی منداڵبووندا لـە ڕۆژی یەکەمـدا ئەوانـە پیـادە بکرێن!، دەکرێ دوای ڕۆژی یەکەمیش بەڵام لە ڕۆژی یەکەم باشترە.

دوو حەقیقەتی تریش هەیە دەبێ ئینسان بیزانێ کە لە ڕۆژی لـە دایکبوونـدا ئەو منداڵە هەموو مافێکی دەستەبەر دەکرێ بۆ نموونە: ئەگەر لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا لە دایك ببێ دەبێ سەرفترەی بۆ بدرێ!، نابێ بڵێی جا ئەوە تـازە لـە دایك بووە!، نەخێر سەرفترەی ئەو منداڵەش واجب دەبێ، وە ئەو ڕۆژەی کە لـە دایك دەبێ میراتی دەکەوێتـە سـەر بـاوکی و بـرای و دایکـی، بەداخـەوە کـە ئێستاش -چەند جارێك باسمانکردووە- مەسـئەلەی مـیرات لـەناو کـوردەواری خۆماندا زۆر بەبێ شـەرعیيانە تـەوزیع دەکـرێ!، وە زۆر بـە بـێ شـەرعیيانە تەماشـای دەکـرێ، تەنانـەت زۆر مـاڵ هـەن زۆر بـاوك و بـرا کـچەکان و خوشکەکانیان لە میرات دەردەکەن، چ جـای ئـەوەی کـە منداڵـە بـەڵکو هـەر بەگەورەیی لە میراتی دەردەکەن، بەڕاستی ئەوەی زوڵم و تاوانێکە خەجاڵەتییـە لە بەرامبەر خوا ڕۆژی قیامەت!، بـەهیچ شـێوەیەك شـەرعیی نییـە میراتێـك بەش بکرێ کە خوای گەورە دایناوە تۆ هێندێکیانی لـێ لا دەدەی خـۆ تـۆ لـە خوای گەورە باشتر نازانی؟، خوای پـەروەردگار شـتێکی بـە فـەڕز دانابـێ بـۆ ئافرەتان و خوشکان چۆن ئەتوانی تۆ لێی زەوت بکـەی؟، هـەر کەسـە چـەندی دەکەوێ دەبێ حەقی بدرێتێ جا ئەگەر ڕۆژی لە دایکبوونیشی بێ ئەوە بۆخـۆی ئەو میراتەی بۆ واجب دەبێ کوڕ بێ یان کچ.

**سـێیەم: لـە ڕۆژی حەوتەمـدا نـاوێکی خۆشـی لێبنـێ**، منـداڵ حەقییەتی کاتێك کە گەورە دەبێ ڕەخنە لە بـاوکی بگـرێ بڵـێ: باوکـە گیـان بۆچی ئەو ناوە ناخۆشەت لێناوم؟، بەتایبەت لە ناوەکانی ئـەمڕۆ کـە زۆرییـان ناشەرعیين!، ئەو ناوانـەی کـە بـۆ کوڕەکـان و کـچەکانی مـسوڵمانان ئـەمڕۆ

بەکاردێن بەداخەوە زۆریان ناشەعیین، لەبەرئەوە دەبێ ناوی خۆش لە کوڕەکان و کچەکان بنرێن بۆ ئەوەی کە گەورەبوو پێی شەرم نەبێ، وە پێغەمبەریش (علیە الصلاة والسلام) فەرمووی: ناوی خۆش لە کوڕەکان و کچەکانتان بنێن چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا بە ناوەکانی خۆیانەوە بانگیان دەکرێت!.

پاشان هۆزەبانە (العَقِیقَة) کە ئەوەشیان دیارە بەپێی توانا سوننەتە بەڵام بەگوێرەی سوننەتی پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) ئاوایە کە بۆ کوڕان دوو مەڕ سەربڕدرێ و لە حدیث دا هاتووە کە یەکێکیش دەبێ، بۆ کچانیش یەکێك کە دیارە ئەوە لە سوننەتی پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام)دا هاتووە وە صەحابەکان پیادەیان کردووە ئەوە بەپێی بوونی دەستەڵاتی ئینسان، پاشان سەرتاشینی منداڵەکە و خێرکردن بەپێی گرانایی مووی سەری ئەو منداڵە لەگەڵ کێشانی بە زیو، کاتێك بە زیو کێشات و چەندە گران بوو بە ئەندازەی ئەوە بە قیمەتی زیوەکە خێری پێ بکەی، ئینجا سوننەتکردنی دیارە ئەوەش یەکێکە لە مافەکانی، پاشان شیر پێدانی دوو ساڵی تەواو کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضِيعَةَ﴾ ٢٣٣- البقرة، زۆر دایك هەیە هەر زوو منداڵەکەی لە شیری خۆی دەکاتەوە بەبێ هۆ پێیوایە کە گوناهی ناگاتێ!، شیری دایك لە بەرامبەر منداڵەکەیدا واجبە بۆیە خوای پەروەردگار وایکردووە ئەو شیرە لە زستاندا بۆ منداڵ گەرمە و لە هاوینیشدا بۆ منداڵ فێنکە!، ئەو شیرە لە ڕۆژی لە دایکبوونییەوە هەتا دەگاتە دوو ساڵ وردە وردە جۆرایەتییەکەی دەگۆڕێ بەپێی حەجمی منداڵەکە!، لەبەرئەوە زۆر گرنگە کە دایك و باوك وا بکەن ئەو شیرەی دایك بدرێ بە منداڵەکان، دوو ساڵ بۆی هەیە شیری بداتێ لەسەریەك ئەو کەسەی کە دەیەوێ شیردانەکە تەواو بکات و ساڵەوەختەکەی (حَول) تەواو

بکات بەرامبەر منداڵەکە ئەگەرنا ئەتوانێ وەختێ کە ساڵێك تێپەڕی یان خواردنی دیکەی بەکارهێنا لێی بکاتەوە بەڵام بە رازیبوونی مێردەکەی.

**چوارەم: بەخێوکردنی منداڵەکە لەلایەن باوك و دایکەوە**، دیارە ئەوەش سوننەت نییە و واجبە، بەخێوکردنی بەپێی عورف سونەتەکانی ئیسلام دەبێ هەر لە منداڵییەوە بتوانێ گەشەیان پێبدا ئەگەر کچ بێ یان کوڕ بێ، هی وا هەیە زۆر بە کچان سەربەرز نییە!، دیارە ئەوەی کە وا دەکا و ئەو تێڕوانینەی هەیە ئیمانی ناتەواوە!، ئەگەرنا منداڵ کچ بێ یان کوڕ بەڕاستی نیعمەتی خوایە، بۆیە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) هانی ئەو مسوڵمانانە ئەدات کە کچ پەروەردە دەکەن بە تایبەتی ئەو ماڵەی کە کچان پەروەردە دەکا خێری زیاتر دەگاتێ تا ئەو ماڵەی کە کوڕان پەروەردە دەکات!، فەرموودەی پێغەمبەرە (علیە الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (مَن عالَ جارِيَتَينِ حَتَّى تَبلُغا جاءَ يَوم القِيامَةِ أنا وهو كَهاتَينِ وضَمَّ أَصابِعَهُ)[٧٣] واتە: هەر کەسێك دوو کچان لە ماڵێکیدا بەخێو بکات بە پەروەردەیەکی مسوڵمانەتی تا گەورەدەبن لە رۆژی قیامەتدا دێ من و ئەو وەکو ئەو دوو پەنجە واین، پەنجەکانی لەگەڵ یەکتری جووتکرد!، یان فەرمووی: (أَنا وَكافِلُ اليَتيمِ فِي الجَنَّةِ هَكَذا)[٧٤] ئەوە حەدیسی صەحیحی ئیمامی بوخارییە فەرمووی: من و بەخێوکەری منداڵی یەتیم وەکو ئەو دوو پەنجە واین بەیەکەوە لە بەهەشتدا!، کەوابوو بەخێوکردنی منداڵەکان چ جای ئەوەی کە واجبە بەڵام نیعمەتێکی گەورەشە بۆ دوارۆژ و دەبێ ئینسانی مسوڵمان ئیستیغلالی بکات، زوڵم هەر ئەوە نییە کە ئینسان لە کەسێکی تری

---

[٧٣] صحيح مسلم، كتاب البر والصلة والاداب، باب: فضل الاحسان الى البنات، رقم الحديث ٢٦٣١.

[٧٤] ((حدثنا عمرو بن بينها أخبرنا عبد العزيز بن أبي حازم عن أبيه عن سهل قال رسول الله صلى الله عليه وسلم أنا وكافل اليتيم في الجنة هكذا وأشار بالسبابة والوسطى وفرج بينهما شيئا باب إذا عرض بنفي الولد))، صحيح البخاري، كتاب الطلاق، باب: اللعان، رقم الحديث ٤٩٩٨

بکات لە بازاڕ لە موعامەلە لە دائیرە لە کوێ...، بەڵکو ئینسان زوڵم لە ماڵ و منداڵی خۆیشی بکات هەر زوڵمە!.

لە هەمانکاتدا خۆشەویستەکانم، دوای گەشەکردنی لە بواری عەقڵی دا پێویستە ئەو منداڵە عەقیدەی ئیسلامەتی لە دڵ و دەروونیدا درووست بکەی؟:

یەکەم شت کە منداڵ تەئسیری تێدەکا بۆ عەقیدە و مەبدەئی کە شەیتانی لێ دوور دەکەوێتەوە فێرکردنییەتی بە وشەی (لا الـه الا الله) لە منداڵییدا ئەم وشەیەی فێر بکە ئەگەرچی سەرەتای وشەکانی بە (باوکە) و (دایکە) دەستپێدەکات بەڵام دوای ئەو وشانە لێمەگەڕێ شتی تر فێر ببێ هەتا بە (لا الـه الا الله) دەستپێدەکات!، بۆ ئەوەی نووری ئیمان بچێتە ناو دڵی و شەیتان زەفەری پێنەبات لە منداڵییەوە.

پاشان کاتێك کە فێری زمان دەبێ دەگاتە حەوت ساڵیی نوێژی فێر بکە، نوێژ کە پێغەمبەر لە تەمەنی حەوت ساڵیدا ئەمر بە باوکان و دایکان دەکات دەفەرموێ: (مُرُوا أولادكُم بالصَّلاةِ وهُم أبنَاء سبع سِنين ، واضرِبوهن عَلَيها وهم أبناءُ عشرٍ) رواه أبوداود، ئەفەرموێ: لەکاتی حەوت ساڵییدا ئەمر بکەن بە منداڵەکانتان نوێژ بکەن، وە لە دەساڵییشدا ئەگەر نوێژی نەکرد لێی بدە!، لێمەگەرێ تێبپەرێ بەسەریدا و دوایی کە گەورە بوو لە دەستت دەربچێ، (وفَرِّقُوا بَينَهُم في المَضاجِع) واتە: لە دە ساڵی دەبێ کوڕ و کچ لە یەکتر جودا بکرێتەوە بۆ خەوتن و نابێ لە یەك شوێندا بەیەکەوە بخەون.

دیارە قورئان خوێندن بەهرەیەکی گەورەیە نەك هەر بۆ منداڵ بەڵکو ئەو منداڵەی دەیخوێنێ زۆری پاداشتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ باوك و دایکی!، نیعمەتێکی گەورەیە منداڵ لە سەرەتاوە فێری قورئان خوێندن ببێ!، گوێبگرن لە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (مَن قَرَأَ

القُرآنَ فَأَحكمه وَعَمِلَ بِما فيهِ ألبَس اللهُ والِدَيهِ يوم القِيامة تاجاً، ضَوءهُ أحسن مِن هذا القَمَر»[75] هەر کەسێ قورئان بخوێنێ و کاریشی پێبکات رۆژی قیامەت تاجێك لەسەر سەری باوك و دایکی ئەو کەسە دادەنێ کە قورئانی خوێندووە و عەمەلی پێکردووە، رووناکایی ئەو تاجە لە رووناکایی مانگ جوانترە!!، دیارە باوك و دایك بەهرەمەند دەبن بە قورئان خوێندن و عەمەل پێکردنی منداڵەکانیان، بۆیە جێگای خۆیەتی باوك و دایکانی منداڵەکانیان هان بدەن لەسەر ئەوە کە فێری قورئان خوێندن بن، لەسەر مزگەوت و جومعە و جەماعەت و مەجلیسی مسوڵمانان رابێن.

خۆشەویستەکانم: پاشان خۆشەویستی خوا و پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام)، دوای ئەوەی کە ئینسان وشەی (لا الـه الا الله) فێری منداڵەکانی دەکات دەبێ خۆشەویستی خوا و پێغەمبەریان لە دڵدا دروست بکات!، وایان لێبکات کە خوایان لە هەموو کەس زیاتر خۆشبوێ، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾ ١٦٥- البقرة، واتە: ئیمانداران گەورەترین خۆشەویستییان بۆ خوایە، دەبێ تۆ کە ئەوەت تێدایە بە منداڵەکەشت ئەوە یەکلا بکەیتەوە، خۆشەویستی خوا پاشان خۆشەویستی ئیسلام و قورئان لەلای ئەو لە هەموو شتێك گەورەتر بێ تەنانەت لە خۆشەویستی خۆت و دایکی!، وە لە هەمانکاتدا خۆشەویستی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) چونکە فەرمووی: «والَّذي نَفس مُحَمَّدٍ بِيدِهِ لايُؤمِنُ أحَدُكُم حَتَّى

---

[75] «حدثنا عبد الله بن وهيب الغزي ثنا محمد بن أبي السري ثنا رشدين عن ربان بن فايد عن سهل بن معاذ بن أنس عن أبيه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال من قال سبحان الله العظيم بني له غرس في الجنة ومن قرأ القرآن فأحكمه وعمل بما فيه ألبس الله والديه يوم القيامة تاجا ضوءه أحسن من هذا القمر»، المعجم الكبير، جزء٢٠، باب الميم: معاذ بن أنس الجهني، رقم الحديث ٤٤٥، صفحة ١٩٨.

أكُونَ أَحَبَّ اِلَيهِ مِن والِدِهِ وولَدِهِ وَالنَّاسِ أجمَعِين)[٧٦] واتە: سوێندم بەو خوایەی کە گیانی منی بەدەستە کەستان ئیمانی تەواو نییە هەتا وای لێنەیێ منی خۆشتر نەویێ لە خۆی و لە باوك و دایکی و هەموو خەڵکی!، دەبێ ئەو فەرموودەیە بۆ منداڵەکانی شەرح بکات کە منداڵەکانی دەبێ پێغەمبەریان (علیه الصلاة والسلام) خۆشتربوێ، وە سوننەتەکانی پێغەمبەریان خۆشتر بوێ تەنانەت لە باوك و دایکیان ئەو کاتە ئەو منداڵانە باوك و دایکیان لێی بەهرەمەند دەبن لە رۆژی قیامەت.

پاشانیش مافێکی تری ئەو منداڵانە ئەوەیە کە رەفیقایەتیکردنی باوك یاخود دایك لە مەجلیس و سەردان، ئەوەکە زۆر کاریگەری هەیە باوك جارجار منداڵەکەی لەگەڵ خۆی بگێڕێ، کوڕەکەی لەگەڵ خۆی بباتە مەجلیسی پیاوان و گوێبگرێ لە قسەی پیاوچاکان، منداڵەکەی لەگەڵ خۆی بگێڕێ بۆ سەفەر بۆ ئەو شوێنانەی کە موناسەباتی گشتین و خێری ئیسلام و مسوڵمانانی پێوەیە، ئەو موناسەباتانەی کە وتاری تێدا پێشکەش دەکرێ، ئەو موناسەباتانەی کە مسوڵمانانی زۆر لێ هەن بۆ ئەوەی کە ئەو منداڵە چاوی ببێتەوە، ئەو منداڵەی گوێی لە قسەی مامۆستایان بێ، ئەو منداڵە شتی تر ببینێ بێجگە لەوەی کە لە ماڵەوە کۆمەڵێك شتی سنووردراو (محدود) دەبینێ، بۆ ئەوەی بزانێ لە مەجلیسدا چۆن دادەنیشێ، وە لە مەجلیسدا خەڵك چۆن قسە دەکات، کاتێ کە پیاوێك قسە دەکات هەموویان گوێی بۆ رادەگرن نەك لە ماڵەوە کە فێربووە هەموویان بەیەکەوە قسە دەکەن!، ئەو منداڵە با شتی وا فێر ببێ لە مەجلیسی پیاوان کە باوکی هانی دەدات و لەگەڵ خۆی دەیگێڕێ، وە هەروەها دایکیش بەهەمان شێوە کاتێك کە دەچێتە ماڵێك کچەکەی لەگەڵ خۆی دەکاتە رەفیق بۆ ئەوەی فێرببێ، بۆ ئەوەی بتوانێ کاتێك کە گەورە دەبێ

---

[٧٦] مصنف عبدالرزاق، کتاب الجامع لامام معمر بن راشد، باب: المرء مع من أحب.

كچه‌كه‌ی به نوێنه‌ری خۆی بنێرێ بۆ ماڵێك بۆ شتێكی پێویست، وه كاتێك كه پیاو له‌گه‌ڵ خۆی ده‌بات بۆ شوێنێك ئه‌و منداڵه فێر ده‌بێ له دوارۆژدا یان دوای چه‌ند ساڵێك چه‌ند مانگێكی تر كه بینێرێ بۆ شوێنێك ئه‌گه‌ر بۆ موناسه‌به‌تێكه ته‌عزیه‌یه له جیاتی باوكی ده‌یكات، ئه‌گه‌ر بۆ جێبه‌جێكردنی كارێكه له جیاتی باوكی جێبه‌جێی ده‌كات مامه‌ڵه‌یه‌كه..، ئه‌و منداڵه ئه‌گه‌ر له سه‌ره‌تادا فێری نه‌كه‌ی به عه‌مه‌لیی ته‌نها. به قسه‌و به زمان زۆرجار فێر نابێ!.

له‌به‌رئه‌وه دانیشتن و گوێگرتن له قسه‌ی پیاوچاكان دیاره كاریگه‌ریی هه‌یه له‌سه‌ر منداڵه‌كان، جاری واهه‌یه باوك له ماڵه‌وه ئایه‌ت و حه‌دیس بۆ كوره‌كانی ده‌خوێنێته‌وه كه‌متر وایه ئه‌و منداڵانه گوێ له باوك و دایكی خۆیانیان رابگرن چونكه به غه‌ریبی نازانن زۆرتر شه‌رمیان لێناكه‌ن!!، به‌ڵام ئه‌گه‌ر بچێ بۆ وتاری ماموستایه‌ك یان بچێ بۆ مه‌جلیسی پیاوچاكێك زیاتر ئیستیفاده له ئامۆژگاریه‌كانی ده‌كات ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر بۆ ته‌عامولكردنی بێ له‌گه‌ڵ باوك و دایكیشیدا، پێغه‌مبه‌ر (علیه الصلاة والسلام) ده‌فه‌رموێ: نموونه‌ی ڕه‌فیقایه‌تی پیاوی چاك وه‌كو ئه‌وه وایه كه عه‌تر بفرۆشێ!، بۆیه ئه‌گه‌ر یه‌كێك بچێته لای ئه‌و جۆره پیاوه ئه‌گه‌ر هیچیشی پێنه‌برێ به‌ڵام بۆنی خۆشی بۆ دێ!، نموونه‌ی ڕه‌فیقایه‌تی پیاوی خه‌راپیش وه‌كو خاوه‌نی كووره‌ی ئاگرین وایه ئه‌گه‌ر نه‌شتسوتێنێ پڕشكت پێ ده‌كه‌ون!، جا بێگومان پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ راستی فه‌رمووه، به‌ڕاستی پیاوی چاك به‌ره‌كه‌ته له هه‌ر شوێنێك بێ، ئیماندار وه‌كو بارانی به به‌ره‌كه‌ت وایه له هه‌ر شوێنێك وه ئه‌رزێ بكه‌وێ ئه‌و بارانه سوودی ده‌بێ!، جا هه‌ر كه‌سێ له مسوڵمانی نزێك بێ ئه‌و به‌ره‌كه‌ته‌ی بۆ دێ!، هه‌ر كه‌سێ له زانای مسوڵمان نزێك بێ ئه‌و به‌ره‌كه‌ته‌ی بۆ دێ، خۆ ماموستا قسه به پاره ناكات، ئامۆژگارییه‌كان به پاره پێشكه‌ش ناكات، خۆ بۆ دونیا و قیامه‌تی تۆیه‌تی!، بۆ دونیا و قیامه‌تی منداڵه‌كه‌ی تۆیه‌تی، جا ئه‌گه‌ر ده‌ستی

منداڵەکەت بگری و بیهێنی بۆ مزگەوت یان بۆ لای مامۆستایەك، مامۆستایەکی بۆ بگری بۆ ئەوەی فێرە نوێژی بکات، فێری ئەخلاقی بکات لە بەرامبەر باوك و دایك و جیران و هاوڕێکانی بەڕاستی ئەوە بەختەوەرییە کە بۆ خۆت نەك تەنها بۆ منداڵەکە!.

خۆشەویستەکانم، پاشان خووڕەوشت و ئەخلاق سەرەتا لە ماڵەوە فێری دەبێ، یەکەم شت فێری بکە چۆن دەستی بەسەردادەهێنی، چۆن وا دەکەی بەقسەت بکات، دەستبەسەرداهێنان کاریگەری زۆرە بۆ منداڵەکان!، ماچکردنی منداڵ کاریگەری زۆرە بۆ ئەوەی کە منداڵ قسە لە باوك و دایکی خۆی وەربگرێ!، ئێستا منداڵەکان لە ئەوروپا و وڵاتە غەربیەکان کە هەست بە عەتف و حەنانی باوك و دایك ناکەن بۆیە ئەو رەحم و بەزەییە نییە و بۆیە ئەو بەرەڵایی و فەساد و بێئەخلاقییە هەیە چونکە پەروەردەی باوك و دایکیان نەبینیوە، پەروەردەی مامۆستا و مزگەوتیان نەبینیوە، منداڵ لە دەرەوە لە (دایەنگا: حضانة) پەروەردە ئەکرێ و نایەتەوە لای باوك و دایك بەڵام لێرە لەناو باوەشی دایك و باوکیدا پەروەردە ئەکرێ!، باوك و دایکی چۆنی رابهێنێ ئاوای لێدێ، پاشان وای لێ بکات لێپرسینەوە و پاداشتی هەبێ کاتێك کە منداڵە ئیشێکی چاك دەکات هانی بدەو سوپاسی بکە!، وەختێ کە ئیشێکی خەراپیش دەکات موحاسەبەی بکە!، بۆ موحاسەبەکردنیش دەبێ ئینسان بزانێ چ جۆرە موحاسەبەیەك بەکاردێنێ!، گوێڕاکێشانی منداڵ نەك بەو شێوەیەی کە ئەزیەتی زۆر بخوا بەڵام گوێگرتنی منداڵ کاریگەرییەکی راستەوخۆی هەیە وەکو زانایان باسی دەکەن!، گوێی منداڵ بگرە و تۆزێك ئاوا ئەزیەتی بدە کە هەست بکا بەوەی موحاسەبەی دەکەی کە لەڕاستیدا ئەو گوێگرتنە کاریگەریی خۆی لەسەر دەروونی منداڵ دروست دەکات، وە لە هەمانکاتدا تەشجیعکردنی لە کاتێکدا کە چاکەیەکی کردووە یان هەنگاوێکی باشی ناوە وە بەخشینی

شتێك پێـی وە هەدیـە پێبەخـشینی بەڕاسـتی ئـەوە كاریگـەری لەسـەر دڵ و دەروونی ئەو منداڵە دروست دەكات.

پاشان فێری راستگۆیی بكە كـە لەگـەڵ دراوسـێكانیدا لەگـەڵ منداڵەكانـدا راستگۆبێ لەگەڵ خەڵكیدا راسـتگۆبێ، راسـتی خۆشەویـستی خوایـە و درۆزن دوژمنی خودایە، فێری ئەوەی بكە چۆن نهێنی دەپارێزێ!، قسەیەك كە لە باوك و دایكییەوە گوێی لێ دەبێ ناچێ لە دەرەوە بڵاوی بكاتەوە!، باوك و دایك لـە ماڵەوە زۆر قسان دەكەن ئەگەر هەر قسەیەك كراو منداڵەكان چوون لـە دەرەوە باسیانكرد و لە مەجلیسەكان گێڕایانەوە هیچ بۆ باوك و دایكان نامێنێتـەوە!!، بەڵام ئەگەر باوك و دایك وریا نەبن پەروەردەی منداڵەكانیان بكەن زۆری لەسەر قەرزدار دەبنەوە!.

وە لە هەمانكاتیشدا خیانەت نەكردن لە ئەمانەت، ئەو منداڵە فێردەبێ چۆن خیانـەت لـە ئەمانـەت ناكـات وە چـۆن هاوكـاری مـسوڵمانان و منداڵـە مسوڵمانەكان دەكات، وە لە هەمانكاتیـشدا وای فێـر بكـات چـۆن تـەعامول لەگەڵ باوك و دایكی خۆی دەكات!، چۆن تەعامول لەگەڵ میوانـەكانی دەكـات و میوانەكان بەخێردێنێ، یان كـە دێتـەوە ژووریٚ چـۆن لـە دەرگـا دەدات، تـا ئێستاش منداڵەكانی ئێمەی مسوڵمان وە نەك هەر منداڵەكان بەڵكو بەداخەوە پیاوەكانیشمان فێر نەبوون كاتێك كە دێنەوە لە دەرگا نادەن، لە مـاڵی خۆیـان لە دەرگا نادەن كە ئەوە باش نییە خۆشەویستەكانم، ئەگەر كەسیش لە ماڵـەوە نەبێ لە دەرگا بدە پێش ئەوەی بێیە ژوورەوە، هەر راست دەرگا مەكەوە و بێیە ژوورەوە، لەوانەیە ئەوكاتەی تۆ دێیـە ژوورەوە دایكـت یـان باوكـت خـەریكی گۆڕینی جل و پۆشاكییەتی!، یان خێزانەكەت ئـافرەتێكی تـری لەلایـە و پێـی ناخۆشە تۆ بەو شێوەیە بێیتە ژوورەوە!، یان بۆ نموونە منـداڵێك دێتـە ژوورەوە

دایك و باوكی بەجۆرێك دەبینێ..، لەبەرئەوە سوننەتە كە منداڵەكان دێنە ژوورەوە یان دەچنە ژووری باوك و دایكیان لە دەرگا بدەن، وە هەروەها ئەگەر باوكیش دەچێتە ژووری منداڵەكانی هەر لە دەرگا بدات وە بە هەمانشێوە ئەندامانی ماڵەوە بەو جۆرە هەڵسوكەوت بكەن چونكە سوننەتی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) كە پیادەی ئەكەن.

یان لە پێغەمبەریان پرسی: چۆن لە دەرگای ماڵ بدەین؟، فەرمووی: وەختێ لە دەرگا ئەدەن لەڕاستی دەرگاكە رامەوەستن!، لە تەرەفێكی دەرگایەكە رابوەستن، یان لەلای چەپی یان لەلای راستی رابوەستن!، بۆ ئەوەی كە كاتێ دەرگایەكە دەكرێتەوە رووبەڕووی ئەو ماڵە نەبیەوە، بەڵكو ئەوكەسە پێی ناخۆشە شەرم دەكات یان ئافرەتێكە دەرگا دەكاتەوە، بەڵكو شتێك لە حەوشەكەیە لە ژوورەوەیە كە كەس حەز ناكات بیبینێ لەبەرئەوە ئەو خووڕەوشتانە ئینسان خۆیشی عیبرەتی لێ وەربگرێ وە بتوانێ منداڵەكانیش فێر بكات.

لە هەمانكاتدا دۆزینەوەی برادەر بۆ منداڵ، دەبێ پێی بڵێی: تۆ لەگەڵ فلانە منداڵەی گەڕەكدا رەفیق بە!، ئەگەر كچیشە دایكی پێی بڵێ تۆ لەگەڵ ئەو كچەدا رەفیق بە!، نەك هەر بۆ خۆی بچێ برادەر بۆخۆی بدۆزێتەوە و دوایی وەختێك دەزانێ لەگەڵ برادەرەكەی سەفەری كردووە و چۆتە هەندەران!، بەڕاستی ئەوە ئەسەفە!، كاتێ باوك منداڵەكانی لە دەست دەچێ لەبەرئەوەیە كە خۆی ئاگای لێ نییە چ دۆستێك و چ منداڵێكی رەفیقە هەتا دوایی وای لێدێ دەكەوێتە ژێر كاریگەریی رەفیقەكانی!!.

وە لە هەمانكاتیشدا دادگەریی لە نێوان منداڵەكانیدا كە ئەوەش كاریگەری راستەوخۆی هەیە، كە چۆن بتوانێ تەنانەت لە ماچكردندا یان لە كڕینی هەدیە لە سەفەردا بتوانێ دادگەر بێ لە نێوان منداڵەكان.

لە کۆتاییشدا دەڵێم: (قدوَة حَسَنَة) لەلایەن باوك و دایکەوەیە بۆ مندالـەکان، باوك و دایك لـە مالـەوە چـی بکـەن ئـاوا تەماشـایان دەکـەن!، شـەڕ بکـەن منداڵەکان زیاتر فێری شەڕ دەبن، درۆ بکەن لەگەڵ یەکتریـدا زیـاتر فێـری درۆ دەبن، باوك و دایك بێ وەعدی لە بەرامبەر یەکتریدا بکەن منداڵـەکانیش ئـاوا بێ وەعدی لە بەرامبەر یەکتریدا دەکەن!، لەبەرئەوە واجبی سەرشانی باوکـان و دایکانە لەماڵەوە (قُدوَة حَسَنَة) بن، نموونەی چاك بن، بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: وەختێ کە دایـك گـوتی منداڵەکـەم هـا وەرە ئـەو شـتەت بدەمێ و دوایی نەیدایێ ئەوە درۆی کردووە!، رۆژێ چـەند جـاران دایـك بـانگ دەکات کوڕم یان کچم وەرە ئەو شتەت بدەمێ دواییش نایداتی!، منـداڵ فێـری درۆ دەبێ، لەبەرئەوە مەسئولییەتی گەورە لەسـەر شـانی بـاوك و دایکانـە وە ماڵەوە قوتابخانەیەکە بۆ منداڵان بۆ کوڕان و بۆکـچان جـا لـە پێنـاوی ئـەوەی بەختەوەر بین لـە دونیـاش و لـە قیامەتیـشدا بـا ئێمـە بتـوانین منداڵـەکانمان لەدەست دەرنەچن بتوانین لە منداڵییەوە پەروەردەیان بکەین، بتوانین بەسـەریان رابگەین بۆ ئەوەی هەم لە دونیاشدا لە بەردەستیان بحەسێینەوە، خاوەنی مەدح بن و خاوەنی زەم نەبن و پێیان سەربەرز بین و سەرنزم نەبین وە لـە دوارۆژیـشدا دوعای خێرمان بۆ بنێرن!.

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە دەڵێین: یاڕەببی خوایە منداڵەکانمان صالح بکەی، خوایە هیدایـەتمان بـدەی بـۆ ئـەوەی راسـترین خووڕەوشـتی ئیـسلامەتی لـە منداڵەکانماندا بهێنینەدی، خوایە خۆمان و ماڵ و منداڵمان هیدایەت بدەی بـۆ راسترینی قسە و کردارەکانمان یارب العالمین.

أَقولُ قَولِي هَذا وَأَستَغفِرُاللهَ لِي وَ لَكُم وَلِسائِرِالمُسلِمِينَ، أَعُوذُ بِاللهِ منَ الشَّيطانِ الرَّجيم

(رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)

آمين

# توڕەبوون

﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاء وَالضَّرَّاء
وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ
وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ ١٣٤- آل عمران

# بسم الله الرحمن الرحيم

انَ الحَمدَ لِلهِ نَحمَدُهُ ونَشكُرُهُ وَنَستَغفِرهُ وَنَستَهدِيه، ونعوذ بِاللهِ مِن شُرُورِ أنفُسَنا وَسَيئات أعمَالِنا، مَن يَهدِهِ اللهُ فَلا مُضِل لَـه، وَمـن يُضلِل فَـلا هـادِي لَـهُ..، نَشهَدُ أن لا الهَ الا اللهُ وحدَهُ لاشَريك لَهُ، وَنشهَدُ اَن سيدَنا وَنَبينا مُحمـداً عَبـدُه وَرَسُولهُ.. هَذا الرَسُولُ الذِي بَلّغَ الرِسَالةَ وَأدَى الامانَةَ وَجَاهَدَ فِي اللهِ حَقَ جِهَـادِهِ وَتَركَنا عَلى المحجَةِ البَيضاء، لَيلُها كَنَهارِها، لايَزيغُ عَنها الا هَالك، صَلَواةُ اللهِ و سَلامُهُ عَلَيهِ وَ عَلى ألِهِ وَأصحابِهِ الى يَومِ الدِّين.

اَمَا بَعدُ ياعِبادَ الله أُوصِيكُم وَنَفسِي أولاً بِتَقـوَى اللهِ وَطاعَتِـهِ وَلُـزومِ أوامِـرِهِ وَكَثرَةِ مَخافَتِهِ فَإنَّ التَّقوى شِعارُ المؤمِنين، ووَصيةُ اللهِ تَبارَك و تعالى في القُـرأنِ العَظيمِ لِلناسِ أجمعين، قَالَ اللهُ (سبحانه وتعالى) فِي كِتابِهِ الحَكيم بِسمِ اللهِ الـرَحمنِ الرَحِيم ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ ١- النساء.

برایانی بەڕێز، ئیماندارانی خۆشەویست، ئەی ئوممەتی موحەممەد ﷺ، ڕەحمـەتی خوای پەروەردگار برژێ بەسەر ئێمەی مسوڵمان و هەموو مسوڵمانانی دونیا لـەم ڕۆژە پیرۆزەدا، یاڕەببی خوایە عاقیبەتی عومرمان خێر بکەی، یاڕەببی خوایە بە مسوڵمانی بمانژیەنی و بە مسوڵمانی بمانمرێنی، یـاڕەببی خوایـە لـە دونیـا و لـە قیامەت لەژێر ئاڵای (لا الِهَ الا الله مُحَمدٌ رَسولُ الله)دا بمانحەسێنییەوە، ئامین..

خۆشەویستەکانم: بابەتی ئەمڕۆ لـە وتـاری هـەینی بابەتێکـە کـە پێویـستە هەموو ئیمانداران لێی ئاگـاداربن وە بـە ئەنـدازەی بـە شـەرعییدانانی بـەپێی

قورئان و سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) رەفتاری پێ بکەین و وەریبگرین، ئەمیشیان بابەتی توڕەبوون و توڕە نەبوونە بۆ ئینسان لە هەردوو حاڵەتی پەسەند و ناپەسەند، توڕەبوون لە ئینساندا غەریزەیەکە خوای پەروەردگار خوڵقاندوویەتی!، هەموو ئینسانێك مادام پێی ئەگوترێ ((ئینسان)) قابیلیەتی توڕەبوونی هەیە، ئێمەی مسوڵمانیش دەبێ توڕەبوونمان بەپێی رەزابوونی خوا و پێغەمبەری خوا بێ ﷺ، بەداخەوە زۆرجار ئەو غەریزەی توڕەبوونە لە شوێنی ناپەسەند و ناشەرعیی بەکاردێنین، لە شوێنێکدا کە پێویستە توڕە نابین بەڵام لە شوێنێکدا کە پێویست نییە توڕە دەبین!، توڕەبوونێکیش کە بەپێی شەریعەتی خوا نەبێ لە شەیتانەوەیە، شەیتان و نەفس ئینسانی هان دەدەن، کە شەیتان زاڵ بوو بەسەر عەقڵی ئینساندا ئەو عەقڵە بەهۆی ئەو نەفسەوە ئەتوانێ کاری غەڵەت بە ئینسان بکات بەهۆی توڕەبوونەوە، جا لە راستیدا زۆرجار ئینسان بەهۆی توڕەبوونەوە بڕیاری وای داوە دوایی زۆر زۆری لەسەر کەوتووە!، زۆری لەسەر پەشیمان بۆتەوە بەڵام دادی نەداوە!.

بابزانین ((توڕەبوون)) چییە؟، وە توڕەبوونی پەسەند کامەیە و لە چ کاتێکدا پێویستە توڕە ببین؟، وە لە چ کاتێکدا پێویست نییە توڕە ببین؟، وە بزانین زیانەکانی توڕەبوونی ناپەسەند چییە؟، وە **چارەسەرەکانی توڕەبوون چییە؟...**

## یەکەمیان: توڕەبوون یانی چی؟

توڕەبوون بریتییە لە هەڵچونی ئینسان بە دڵ وە کارکردنی ئەو هەڵچونە لەسەر ئەندامەکانی ئینسان و لێکەوتنەوەی ئەنجامی ئاشکرا، جا جاری وا هەیە کە ئینسان توڕە دەبێ بە دڵ توڕەبوونەکە دەخواتەوە، جاری وا هەیە توڕە دەبێ بەدڵ کاریگەری لە بۆچون و عەقڵی ئینسان دەکات، قسەیەکی غەڵەت لە زمان دەردەچێت، زمان وەدەنگ دێنێ، جاری وایە توڕەبوون دەست بەکاردێنێ،

جاری وایە تورەبوون ئەندامەکانی تر بەکاردێنێ!، جا چ بە باری چاکدا وە چ بەباری خەراپەدا، بە شێوەیەکی گشتی تورەبوون چاک نییە تەنها لەو حاڵەتانەدا نەبێت کە پێویستن، چونکە یەکێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئامۆژگاریم بکە!، ئەویش فەرمووی: (لا تَغضَب: تورە مەبە!)، جاری دووەم پرسیاری کردەوە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ئامۆژگاریم بکە، جاری دووەمیش هەر پێی فەرموو (تورە مەبە)، جاری سێیەمیش هەر دووباری کردەوەو وتی: ئامۆژگاریم بکە فەرمووی (تورە مەبە!)، هەر ئەوەندە وەڵامەی دایەوە..، بۆچی چونکە ئەو ئینسانە غەریزەی تورەبوونی زۆر زیاد بوو، لە کاتی نادروستیشدا هەر تورە دەبوو بۆیە فەرمووی تورە مەبە، سیفەتی تورەبوونی هەمیشەیی لە ئینساندا (ئینسانێك کە هەمیشە تورە و توند و نێوچاوان گرژبێت) پەسەند نییە!، جا بۆیە ئیسلام تورەبوونی هەمیشەیی رەفز کردووە.

تورەبوون یان پەسەندە یان ناپەسەندە، وە زانایانیش دەفەرموون: ئینسان کە تورە دەبێ چوار حاڵەتی هەیە، جاری واهەیە ئینسان زوو تورە دەبێ بەڵام زووش چاك دەبێتەوە، ئەوە حاڵەتی یەکەمیانە..، حاڵەتی دووەمیان: زوو تورە دەبێ بەڵام درەنگ چاك دەبێتەوە، حاڵەتی سێیەمیان: درەنگ تورە دەبێ بەڵام درەنگ چاك دەبێتەوە، حاڵەتی چوارەمینیشیان: درەنگ تورە دەبێت بەڵام زوو چاك دەبێتەوە!، باشترین حاڵەت لەو چوارانە ئەوەیە کە ئینسان درەنگ تورە ببێ بەڵام زوو چاك ببێتەوە!، ئەوە بۆ تورەبوونی پەسەند لەحاڵەتی ئاساییدا، وە خەراپترینیشیان ئەوەیە زوو تورە ببێ بەڵام درەنگ چاك ببێتەوە!، جا ئێمەی مسوڵمان بابزانین ئیسلام چیمان پێ دەڵێت و لە چ کاتێکدا دروست نییە ئێمە تورەببین:

**یەکەم حاڵەت لەو حاڵەتانەی کە پێویست نییە ئینسان لێی توڕەببێ ئەوەیە**، مسوڵمانێك یان بەرامبەرەکەت کە ئیماندارە هەڵەیەکت لە بەرامبەردا بکات، ئێمە ئینسانین وە لە کۆمەڵگای ئینسانییەتیشدا دەژین!، دەوروبەرمان ئینسانن ئینسانیش قابیلی غەڵەتە، ئەتۆ بڵێی نابێ کەس غەڵەت بکا ئەوە نابێت!، کافرەکان کاتی خۆی دەیانگوت: ﴿لَوْلا أُنزِلَ عَلَيْنَا الْمَلائِكَةُ﴾ ٢١- الفرقان: بۆچی خوای گەورە مەلائیکەتی بۆ نەناردووین تا تەبلیغمان بکات؟، بۆ ئینسانێکی کردووە بە پێغەمبەر؟!، یان دەیانگوت: ﴿أَبَعَثَ اللَّهُ بَشَرًا رَّسُولا﴾ ٩٤- الاسراء: ئەوە چۆن خوای گەورە ئینسانێکی کردووە بە پێغەمبەر (رَسول)؟! شتی وا چۆن دەبێ؟!، خوای پەروەردگار فەرمووی: ﴿قُل لَّوْ كَانَ فِي الأَرْضِ مَلائِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ السَّمَاءِ مَلَكًا رَّسُولا﴾ ٩٥- الاسراء، فەرمووی: ئەی موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) پێیان بڵێ ئەگەر لە ئەرزدا مەلائیکەت هەبوونایە ئێمەش مەلائیکەمان بە پێغەمبەر دەناردن، بەڵام لە ئەرزدا وە لە دونیادا ئینسان هەن بۆیە ئینسانمان ناردووە!، ئێمە ئینسانمان لە دەوروبەرە، ئینسانیش قابیلی غەڵەتە، ئینسان هەمیشە نەفسی لەگەڵی دایە نەفسیش هەموو کات فەرمان بە خراپە دەکات مەگەر نەفسێك خوا رەحمی پێبکات، ﴿إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلاَّ مَا رَحِمَ رَبِّيَ﴾ ٥٣- یوسف، مەگەر خوا رەحم بە کەسێك بکات ئەگەرنا نەفس هەمیشە هاوکاریکەری کێیە؟ هاوکاریکەری شەیتانە، شەڕی نەفس و شەیتان بە یەکەوەیە و (مُتَّفِق)ن، لە یەك سەنگەرن، ئەوە شەیتانە و ئەوەش نەفسە هەمیشە ئینسان وا لێ دەکەن توڕەی بکەن و بڕیاری غەڵەت بدات و قسە و کردەوەی غەڵەت بکات و ئەنجامی غەڵەت دروست بکات ئەدی کێ لە موقابیلیان راوەستاوە و موونافەسەیان دەکات و لە سەنگەریاندایە؟، عەقڵ و ئیمان!، عەقڵ و ئیمان لە بەرامبەر نەفس و شەیتاندا رادەوەستن، چەندە عەقڵ

بیرتیژ بێت و چەندە ئیمـانیش بـەهێز بێـت ئەوەنـدە سـەنگەریان بـەهێزو زاڵ (مسیطِر) دەبێت بەسەر دوژمنەكانیاندا كە شەیتان و نەفسە!.

جا خۆشەویستەكانم: خـوای پـەروەردگار (سبحانهُ وتعالى) پێمـان دەفـەرموێ: سیفەتی ئیمانداران ئەوەیە دەبێ رقی خۆیان بخۆنەوە، لـە قورئانـدا دەفـەرموێ ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ ١٣٤- آل عمران: ئەوانەی كە دەچنە بەهەشت ئەوانەن كە رقی خۆیان دەخۆنـەوە!، (زیـن العابدین) زانای بەناوبانگ جارێكیان غولامێكی هـەبوو ئـاوی بـۆ بـە سـەردا دەكرد بۆ دەستنوێژ لەناكاو مەسینەكەی كەوتە خوارەوە سـەری شـكاند، (زیـن العابدین) كە سەری بەرزكردەوە و سەری خوێنی پێدا هاتووە و دیارە ئەوەی كە ئاوی بەسەردا كردووە زیرەك بووە و ئاگای لـە قورئـان هـەبووە ئـەو ئایەتـەی بۆخوێندەوە و فەرمووی: ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ: ئەوانەی رقـی خۆیـان دەخۆنـەوە، تورەیی خۆیان دەخۆنەوە﴾ ١٣٤- آل عمران، ئەویش فەرمووی ئەوە رقی خـۆم خواردەوە!، ئایەتەكەی بۆ تەواوكرد و فەرمووی: ﴿والْعافِينَ عَنِ النَّاسِ: ئەوانـەی كە خەڵكی عـەفوو دەكـەن﴾ ١٣٤- آل عمـران، فـەرمووی: عـەفوم كـردی!، ئەوجار هەموو ئایەتەكەی تەواوكرد و فەرمووی: ﴿وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ: خـوا چاكەكارانی خۆشدەوێ﴾ ١٣٤- آل عمران، فەرمووی: ئـەوە ئـازادم كـردی!، ئەوانـە ئەوەنـدە ئیلتزامیـان بـە قورئانـەوە كـردووە وەختـێ ئایـەتیان بـۆ خوێندراوەتەوە تەسلیم بوون!، بەڵێ سەری شكاوە، كـاتێكی ناڕەحەتـە، بـەڵام قسەیەكی ناشیرینی بە دەمدا نـەهاتووە!، دەبـێ عـەفووی بكـات، لەبەرئـەوە ئینسانی مـسوڵمان دەبـێ خـاوەنی عـەفوو بێـت، خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا﴾ ٢٢- النور، واتـە: بـا مـسوڵمانان عـەفویان هـەبێت و خاوەنی سینگفراوانی بن، هەمیـشە دڵتونـد و ناڕەحـەت نـەبن، زوو نەكەونـە ناڕەحەتی و دڵتوندی لە بەرامبەر هەر هەڵەیەكی موقابیلدا، خـوا دەفـەرموێ ﴿أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ﴾ ٢٢- النور، واتە: ئایا پێتان خـۆش نییـە خـوا

عەفوتان بكات؟!، كێ پێی خۆش نییە خودا عەفوی بكات؟!!، جا كەوابوو خوا ئەفەرموێ ئەگەر عەفوو لێبوردنتان هەبێت، سینگفراوانیتان هەبێت خوا عەفوتان دەكات، هەر كەسێك لەبەر خاتری خوا مسوڵمانێك عەفوو بكات لە كاتێكدا دەستەڵاتی هەیە تۆڵەی لێ بسێنێتەوە خوا عەفووی دەكات!، (العَفْو عِندَ المَقدِرَةِ أفضَلُ)[77]: لێبووردەیی لە كاتی دەستەڵاتدا هونەرە نەك لە كاتی بێ دەستەڵاتیدا، ﴿وَجَزَاء سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ﴾ ٤٠- الشورى، لە بەرانبەر هەر خراپەیەك دەتوانی تۆڵە وەربگریەوە، بەڵام ئەگەر عەفوی بكا و ئاشتی بكا ئەوە پاداشتی لەسەر خوایە، جا تۆڵەی دونیا هیچ نییە و پاداشتی لای خوا زۆرە!، (زين العابدين) نەك هەر تورەش نەبوو، بەڵكو چاكەیەكیشی لە جێگا داناو ئازادی كرد!.

خۆشەویستەكانم: ئێمەی مسوڵمانیش دەبێ خاوەنی عەفو و لێبووردن بین لە بەرامبەر هەڵەی برایەك، خوشكێكمان..، هەر كەسێك هەڵەیەكمان لە بەرامبەر دەكات، خۆ دونیا خەراپ نابێت عەفووی دەكەین!، تەماشای پێغەمبەر ﷺ بكەین چەندە سینگفراوان بووە!، خوا ئەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ ٢١- الأحزاب، واتە: بێگومان بۆ ئێوە هەیە لە پێغەمبەری خودا سەرمەشقییەكی چاك، كابرایەك هاتووە -بە نەزانیی- عەبایەكەی پێغەمبەری ﷺ راكێشاوە بە جۆرێك كە خێتی عەباكەی لە گەردنی دیاربووە!، سووری كردۆتەوە و خەریكبووە خوێنی لێبێت!، صەحابەكان ویستویانە تورە بن پێغەمبەر فەرموویەتی نەخێر، لێی تورە مەبن بزانن چی دەوێت، زۆر بە نەرمیی!!!، جارێكی دیكە[78] ئەعرابییەك هاتووە و لەناو

[77] حلية الاولياء، جزء ٥، صفحة ٢٦١.

[78] ((حدثنا عبد الله بن عبد الوهاب حدثنا حماد بن زيد عن ثابت عن أنس بن مالك أن أعرابيا بال في المسجد فقاموا إليه فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم لا تزرموه ثم دعا بدلو من ماء فصب عليه))، صحيح البخاري، كتاب الوضوء، باب: صب الماء على البول في المسجد، رقم الحديث ٢١٧.

مزگه‌وت میزی كردووه!، ئه‌وكاته مزگه‌وت ئاوا به‌و شێوه نه‌بووه كه ئه‌و رایه‌خ و ئه‌و هه‌موو دیكۆر و ئه‌وانه‌ی هه‌بێت، صه‌حابه‌كان په‌لاماریانداوه و ویستویانه نه‌هێڵن، پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی: لێی گه‌ڕێن با میزه‌كه‌ی ته‌واو بكا!، دوایی كابرا رۆیشتووه و فه‌رمووی بێنن سه‌تڵێ ئاوی پێدا بكه‌ن، توڕه‌بوون له كه‌سێك كه هه‌ڵه‌یه‌كی كردووه، ئه‌وه به جۆرێك له جۆره‌كانی ناپه‌سه‌ند داده‌نرێت، كه‌سێكی نه‌زان هه‌ڵه‌یه‌ك ده‌كات كه له‌وانه‌یه نه‌یزانێت، یا له‌وانه‌یه هه‌ر ئه‌وه‌نده بزانێت، هه‌ڵه‌یه‌كی كرد قابیلی عه‌فووه!.

**دووه‌میان: كاتێك نه‌فامێك قسه ده‌كات**، زۆرجار له مه‌جلیسێكدا نه‌فامێك قسه ده‌كات كه به‌ڵێ قسه‌كانی جێی خۆی نییه، یان كارێك ئه‌نجام ده‌دات كاره‌كه جێی خۆی نییه، به‌ڵام نابێت ئینسان به قسه‌ی نه‌فامێك تێ بكه‌وێت!، توشی هه‌ڵوێستێكی ناخۆش ببێ كه دوایی له‌سه‌ری په‌شیمان ببێته‌وه!، خوا ده‌فه‌رموێت (جل جلاله): ﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الارْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سلامًا﴾ ٦٣- الفرقان. به‌نده راسته‌قینه‌كانی خوا ئه‌وانه‌ن كه له‌سه‌ر ئه‌رز به هێمنی و ئارامی ده‌ڕۆن، وه‌ختێك كه جاهیلێكیش قسه‌یه‌ك ده‌كات نابه‌دڵیانه، هه‌روا به قسه‌یه‌كی چاك وه‌ڵامی ئه‌ده‌نه‌وه و ده‌ڕۆن، یان ده‌ڵێن سه‌لامت له‌سه‌ر بێ و زۆری ناهێننه سه‌ره‌خۆ، نابێ ئینسانی مسوڵمان ئه‌وه‌نده دڵی گچكه بێت كه به‌قسه‌ی هه‌موو كه‌سێك توڕه ببێ!، پێغه‌مبه‌ر (علیه الصلاة والسلام) زۆر شتی گه‌وره‌ی پێ گوتراوه!، جا ئه‌گه‌ر پێغه‌مبه‌ر هه‌موو خه‌ڵكی لێی رازی نه‌بێ ده‌بێ من و تۆ هه‌موو خه‌ڵكمان لێ رازی بێ؟!!، بۆ خه‌ڵك هه‌مووی له خوا رازییه هه‌تا له تۆ رازی بێت؟!، پێغه‌مبه‌ر (علیه الصلاة والسلام) پێش ئه‌وه‌ی ببێته پێغه‌مبه‌ر پێیان ده‌گوت (الصَّادِقُ الامِين) به‌ڵام دوایی گوتیان شاعیره، گوتیان كاهینه، درۆزن (كاذِب)ه، گوتیان (مَجنون)ه، گوتیان ساحیره، هه‌موو ئه‌و سیفه‌ته خه‌راپانه‌یان

دایە پاڵ، وەختێك كە بوو بە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) ئینجا ئەو تۆمەتانەیان بۆ هەڵبەست، خۆ كاتێك كە بوو بە پێغەمبەر وەحی بۆ هات، بەرزتر و بەرێزتر و چاكتر و پاكتر بوو، ئەی بۆچی پێی دەڵێن (ساحیر، شێت، شاعیر، لێی گۆڕاوە، مامۆستای خەراپی هەیە)، نەخێر.. كەوابوو خەڵكی ناحاڵیی هەر هەیە!، ﴿وَلا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ إلا مَن رَّحِمَ رَبُّك وَلِذَلِك خَلَقَهُمْ﴾ ١١٨، ١١٩- هود، ئینجا گوێبگرن لە ئیمامی شافیعی (خودا لێی رازی بێت) لە بەرامبەر قسەی نەفاماندا چ دەفەرمویێ؟، دەفەرمویێ:

يُخاطِبُنِي السَّفِيهُ بِكُلِّ قُبحٍ
فأكرَهُ أن أكونَ لَهُ مُجِيبا
يَزيدُ سَفاهَةً وأزيدُ حِلماً
كَعودٍ زادَهُ الاحراقُ طِيبا

واتە: ئینسانی نەفام بە هەموو شێوە دواندنێكی ناشیرین دەمدوێنیێ، وە منیش پێمناخۆشە وەڵامدەرەوەی قسەكانی ئەوبم و خۆم بهێنمە رێزی وی!، ئەو هەرچەندە گەمژە بێت و قسەی نابەجێ زیاتر بكات، ئەوامنیش نەرم و نیانی لە بەرامبەریدا زیاتر دەنوێنم!، وەكو بخورێك كە هەتا زیاتر بسوتێ بۆنی خۆشتر دەبێ!...

ئینسانی مسوڵمانیش هەتا زیاتر بەربەرەكانی بكریێ، وە هەتا زیاتر رقی هەڵبسێنن و ململانێی لەگەڵدا بكەن و نارەحەتی بكەن، ئەجر و پاداشتی لای پەروەردگار گەورەتر دەبێت!، بۆنی خۆشتر دەبێت، مسوڵمان ئەگەر لەسەر رێگای راست بێت غەیبەتی بكریێ و بە خراپە باسی بكریێ بۆ وی قازانجە، وەكو ئیمامی غەزالی فەرمووی: (وەختێ مسوڵمانێك خەڵكی بێ دین زۆر رقیان لێ ببێتەوە ئەوە نیشانەی ئەوەیە كە خوا خۆشی دەوێت)، چونكە ماقوڵ نییە ئینسانێك هەموو خەڵكی لێیی رازی بن!!، وەكو زۆرجار گوتومانە، هی

واهه‌یه ده‌ڵێت: فلا نه‌که‌س پیاوێکی زۆر چاکه هه‌موو خه‌ڵکی لێی رازین!، هه‌رگیز ناکرێت ئینسان هه‌موو خه‌ڵکی لێی رازی بن!، چونکه خه‌ڵکی له دونیا دوو تاقمن: تاقمێك خۆشه‌ویستی خوایه، تاقمێکیش دوژمنی خوایه!، ماقوڵه تۆ دۆست و دوژمنی خوات هه‌موو هه‌ر لێ رازی بن؟!!، هیچ ماقوڵ نییه، خۆ که‌س له پێغه‌مبه‌ر به‌رزتر و چاکتر و پاکتر نه‌بووه ئه‌ی بۆ دوژمنی هه‌بوون؟!.

به‌ڵێ خۆشه‌ویسته‌کانم، **سێیه‌مینیشیان: له کاتی نه‌خۆشی و موسیبه‌تدا پێویست نییه ئینسان توره ببێ**!، ئینسانه و به‌لا و ناخۆشی به‌سه‌ردێن، خوا ئه‌فه‌رموێ: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوفْ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الأموالِ وَالانفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ﴾ **١٥٥- البقرة**، واته: تاقیتان ده‌که‌ینه‌وه به رۆیشتنی ماڵ و سامان و میوه‌جات و منداڵ و...، وه به ترسێتی و برسێتی، موژده بده به خۆراگران ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر (عليه الصلاة والسلام)، ئه‌وانه‌ی که صه‌بر ده‌گرن و توره نابن و ناشکور نابن، ئینسان تاقی ده‌کرێته‌وه: سه‌یاره‌ی وه‌رده‌گه‌ڕێت، یاخود (ده‌عم) ده‌کات، زراعه‌تی ئه‌مساڵ نایه‌ته به‌رهه‌م، قازانج ناکات له مامه‌ڵه‌که‌ی..، پێویست ناکات قسه‌یه‌کی غه‌ڵه‌ت بکات یان ناشکور بێت!، خوا ئه‌فه‌رموێ: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لأزِيدَنَّكُمْ﴾ **٧- إبراهيم**، واته: ئه‌گه‌ر شوکری خوا بکه‌ن ئه‌وجار بۆتان زیاد ده‌که‌ین، هی واش هه‌یه که نه‌خۆش ده‌بێت ناشوکر ده‌بێت و جاری وا هه‌یه ده‌ڵێ: من له‌وه‌تی هاتومه‌ته ناو ئه‌و خانووه هه‌ر نه‌خۆشم!، یان له‌وه‌تی جیرانی فلانه که‌سم هه‌ر نه‌خۆشم، یان من هه‌رگیز ساغ نه‌بووم، خوایه بۆ من هه‌ر نه‌خۆشم!، ئه‌و ناشکوریانه ئینسانی وا لێ ده‌که‌ن خوای پێ له خۆی توره بکات!، نه‌خۆشی ده‌سته‌ڵاتی خوایه و قه‌زا و قه‌ده‌ری خوایه بۆ ئینسان خۆشه‌ویسته‌کانم، زانایه‌ك ده‌فه‌رموێت: به‌لای مزگه‌وتێکدا تێپه‌ڕیم ته‌ماشام کرد که‌سێکی سه‌قه‌ت له‌وێ چاوی نییه و ده‌ستی نییه و دوعا ده‌کات و ده‌پاڕێته‌وه و ده‌ڵێت: (خوایه من

زۆر مەمنونم ئەو بەلاّ و موصیبەتانەی کە بۆ خەڵکت ناردوون بۆ منت نەناردووە!)، سەقەتە و کوێرە!!، ئەو زانایە لێی نزیك دەبێتەوە و دەڵێ: ئەوە چییە ئەو بەلاّو موصیبەتانەی بۆ خەڵك هاتووە و بۆ تۆ نەهاتووە بابزانم؟، ئەویش دەڵێ: (الحَمدُلله الذي مَنَحَنِي لِساناً ذاكِراً وَقَلباً شاكِراً وَبَدَناً عَلَى البَلاءِ صابِراً)، ئەفەرموێ: سوپاسی ئەو خوایە دەکەم کە زمانێکی داومەتێ هەردەم لە زیکر و یادی خوا دایە کاتێك بەلاّیەکم بەسەر هاتووە!، سوپاسی ئەو خوایە دەکەم کە دڵێکی داومەتێ دڵەکەم هەمیشە سوپاسی خوای کردووە!، دڵم قەناعەتی هەبووە، ناشکور نەبووە بەرامبەر بە موصیبەتەکان، وە جەستەیەکی داومەتێ کە لەسەر بەلاّو موصیبەت صەبری گرتووە!، وەختێك کە دەست و چاوم نەماون جەستەم وای نەکردووە کە ناشکورییەك بە زمان و دڵم بکات!، بەڵێ خۆشەویستەکان: ئینسانی مسوڵمان دەبێ لە بەرامبەر نەخۆشییەکاندا ناشکور نەبێ، پاشان فەرموی: ئەی ئەو موصیبەتانەی کە خەڵك هەیەتی لە تۆدا نییە چین؟!، فەرمووی: موصیبەت ئەوە نییە ئینسان چاوی کوێر بێت، یان نەخۆش دەبێت!، نا...، بەڵکو ئەوانە نیعمەتن ئەگەر ئینسان لەسەر دینی خوا بێت، ئەگەر ئینسان مسوڵمان بێت نەخۆشی نیعمەتە! چونکە صەبری لەسەر دەگرێ و لەسەر صەبریش پاداشتی دەدرێتەوە، ئافرەتێك دێتە لای پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) نەخۆشی بورانەوە (صرع)ی هەیە و دەبورێتەوە، وە لە کاتێکیشدا کە دەبورێتەوە خۆی رووتدەکاتەوە و عەورەتی بەدەردەکەوێ، دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خوا دوعام بۆ بکە!، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: پێتخۆشە دوعات بۆ بکەم کە چاك ببیتەوە یان ئاوابی کە لەسەر نەخۆشیەکەت بەردەوام بیت و خوا بەهەشتت بداتێ؟، فەرموی: دەمەوێ خوا بەهەشتم بداتێ بەلاّم دەمەوێ یەك دوعام بۆ بکەی کە لەکاتی بورانەوەمدا خۆم رووت نەکەمەوە، پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) ئەو دوعایەی بۆ دەکات

کە لەمەودوا خۆی رووت نەکاتەوە!، ئەگەرنا داوای دوعای چاکبوونەوە لە پێغەمبەر ناکات (علیه الصلاة والسلام)، بەڵێ ئەو موصیبەتانە چین کە بۆ خەڵك هاتووە و بۆ ئەو نەخۆشە سەقەتە نەهاتووە؟، ئەفەرموێ: موصیبەت ئەوە نییە ئینسان نەخۆشبێت، بەڵکو موصیبەت ئەوەیە ئینسان چاو و دەست و دڵی ساغ بێت، هەموو بەدەنی ساغ بێت، بەڵام سەجدە بۆ خوا نەبات و بێ دین بێت!!، ئاگای لە خوا نەبێت، ئەوە موصیبەتی گەورەیە کە ئینسان لە دینی بێت!، نەك لە بەدەنی، بەڵێ خۆشەویستەکانم ئینسان دەبێ لە بەرامبەر نەخۆشیەکاندا تورە نەبێ و ناشکور نەبێت.

ئینجا، لە بەرامبەر رای جیاوازدا: دەبینی جاری وا هەیە بەرامبەرەکەت رایەکی جیاوازی هەیە، لێی تورەمەبە!، بەتایبەت ژن و مێرد جاری وایە هەموو رۆژێك تێکدەگیرێن لەسەر رایەکی جیاواز!، هی وا هەیە هەموو رۆژێك تێکدەگیرێ لەگەڵ خێزانەکەی لەبەرئەوەی رای جیاوازە، عەجایب نییە!، خۆ دونیا خەراپ نابێ ئەگەر جاریك بە قسەی خێزانەکەت بکەی، یان خێزانەکەت بە قسەی تۆ بکات!، ئەگەر یەکێکتان تورە بوو دەبێ ئەویتریان تورە نەبێ ئەگەرنا هەردوو لە ماڵێ تورە بن وەزعی ماڵێ دەشێوێت!، ئینسان پێویستە جارجار رای خێزانەکەی خۆشی وەربگرێ، وە بەقسەشی بکات، بۆ ئەوەی بەسەرخۆیدا نەشکێتەوە و هەست بکات کە ئەویش خاوەنی را (رَئي)یە، وە ئەگەر رای خۆیشی دەربری و لەگەڵ رای تۆدا جیاواز بوو گاڵتە بە رایەکەی مەکە!، لێی تورە مەبە و چاوپۆشی لێ بکە، ئیمامی شافیعی (خودا لێی رازی بێت) فەرموویەتی: (هەمیشە کاتێك کە لەگەڵ کەسێکدا گفتوگۆم کردبێت حەزمکردووە حەق لەسەر زوبانی ئەو دەرکەوێ)[٧٩]، ئینسان نابێ ئەوەندە

---

[٧٩] ((وَدِدتُ إذا ناظَرتُ أحَداً أن يُظهِرَالله الحَقَّ على يَدَيهِ)).

بەخیل بێت پێی وابێ هەر ئەو راست دەکات!، پێی وابێ هەر ئەو رایەکەی راستە، وە دەبێ هەموو خەڵك لە رایەکانیاندا غەڵەت بن بەس ئەو رایەکەی راست بێ!، ئیمامی شافیعی دەفەرموێ: رای خۆم پێ راستە بەلآم ئیحتیمالی هەیە هەڵەش بم، رای بەرانبەرەکەشم پێ هەڵەیە بەلآم ئیحتیمالی راستیشی هەیە، کە ئەمە خۆ بەکەمزانیی (تَواضُع) پەیدا دەکات، (مَن تَواضَعَ للهِ رَفَعَه الله)[80] واتە: هەرکەسێ لەبەر رەزابوونی خوا خۆی بەکەم بگرێت، خودا -لەنێو خەڵکیدا- بەرزی دەکات.

## خاڵی دووەم: لەچ کاتێکدا پێویستە تورە ببین؟

**یەکەم: لە کاتێکدا کە بێڕێزی بەرامبەر بە خوا** (سبحانه وتعالى) و پێغەمبەر بکرێت، هەرکاتێك بێڕێزی بەرامبەر خوا و پێغەمبەر کرا لە قسە و کردەوەدا پێویستە ئینسان تورە ببێت، چونکە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) بۆ شەخسی خۆی تورە نەبووە!، ئەزیەتیانداوە تورە نەبووە، بەلآم لەبەر خاتری خوا و لەسەر دینی خوا دەبێ تورە ببێ، ئەها خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللّهِ يُكَفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلا تَقْعُدُواْ مَعَهُمْ﴾ ١٤٠- النساء، ئەفەرموێ: ئەگەر بیستتان گاڵتە بە ئایەتەکانی خوا کرا، گاڵتە بە ئیسلام کرا، لەگەڵ ئەو کەسانە دامەنیشن!، وە لەگەڵ ئەو کەسانە مەڕۆن کە گاڵتە بە دینی خوا و ئایاتی خوا دەکەن!، بۆچی؟، چونکە: ﴿إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ﴾ ١٤٠- النساء، واتە: ئێوەش وەکو ئەوان دەبن ئەوکاتە،

[80] ((حدثنا أبو معاوية عن الاعمش عن أبي ظبيان عن جرير قال نزلنا الصفاح فاذا نحن برجل نائم في ظل شجرة قد كادت الشمس تبلغه قال فقلت للغلام انطلق بهذا النطع فأظله فلما استيقظ إذا هو سلمان قال فأتيته أسلم عليه قال فقال يا جرير تواضع لله فان من تواضع لله رفعه الله يوم القيامة))، مصنف ابن أبي شيبة، كتاب الزهد، كلام عمر بن الخطاب، رقم ٣٤٤٦١

نابێ ئینسان تورە نەبێ!، وە ئەگەر لەو حاڵاتانەدا ئەو مەجلیسەی كە تێیدا گاڵتە بە دین دەكرێ، گاڵتە بە ئیسلام و مسوڵمانان و سوننەتی پێغەمبەر دەكرێ ئینسان لێیی تورە نەبێ وەكو ئەوان حەشری دەكرێت!!، خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ﴾، ئێوەش وەكو ئەوان حیسابتان بۆ دەكرێ چونكە مەجلیستان مەجلیسی ئەوانە!، وە كۆڕ و كۆبونەوەتان كۆڕ و كۆبونەوەی ئەوانە، لە گەڵیان دانیشتون كاتێك ئەو قسە كوفرانەیان كردوە و لێیان جیانەبونەوە.

**دووەم: دیفاعكردن لە برای مسوڵمان**، وەختێك كە مسوڵمانێك زوڵمی لێ دەكرێ پێویستە ئینسانی مسوڵمان لەسەری تورە ببێ، بۆچی؟، چونكە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿لا تَظْلِمُونَ وَلا تُظْلَمُونَ﴾ ٢٧٩- البقرة، واتە: نە زوڵم بكەن، نە قەبوڵی زوڵمیش بكەن!، ئینسان بۆخۆی زوڵم ناكا -وەكو مسوڵمان- بەڵام نابێ قبوڵیش بكا زوڵم لە خۆی بكرێت وە زوڵمیش لە مسوڵمانانیش بكرێت، لە حاڵی حەیاتیشدا دەبێ دیفاعیان لێ بكات وە لەحاڵی مردنیشدا، ئەبوجەعفەری مەنصور ئەوەی كە بەغدادی دروستكرد، زانایەك لە مەجلیسەكەی دانیشتووە، ئەبوجەعفەر دەڵێتە زاناكە: زەحمەت نەبێ ئەو قوتوە مەرەكەبەم بدەرێ!، ئەویش دەفەرموێ: ئەو قوتوە مەرەكەبەت نادەمێ!. دەڵێ: بۆ نامدەیتێ؟، لە یەكتری تورە دەبن، دەفەرموێ بۆیێ ناتدەمێ چونكە دەترسم نامەیەكی پێ بنوسی بەو حوبرە كە كۆمەڵێك مسوڵمان توشی بەلا بكەی، ئەمنیش شەریكی گوناهەكەی تۆ دەبم لە رۆژی قیامەت خودا بانگ دەكات: (أينَ الظَّلَمَة وَأعوانُ الظَّلَمَة؟)[81]: كوان زاڵمەكان و یارمەتیدەری زاڵمەكان؟، دەترسێم منیش لە یارمەتیدەری زاڵمەكان لەگەڵ تۆ ریز بكرێم لە رۆژی قیامەت، دەبێ دیفاع لە مسوڵمانان بكرێ وە ئینسان

[81] الورع، جزء ١، صفحة ٩٣، تتمة جزء الاول من الكتاب.

لەسەر مسوڵمانان تـورە ببـێ، كـچێكی سـاڵیحەی مـسوڵمان لـە سـەردەمی عومەری كوڕی خەتتابدا باشترین نموونەیـە بـۆ ئافرەتـانی ئێمـە وەختێـك كـە دایكی ئەو كچە دەیەوێ هەنـدێ ئـاو بكاتـە نـاو شـیرەكەی و بیبـا لـە بـازاڕ بیفرۆشێت بۆ ئەوەی شیرەكەی زیاد بێ، كچەكە تورە دەبێ و دەڵێ: دایـە ئـەی باشە گوێت لێ نەبووە ئیمامی عومەر فەرمووی گوناهە ئینسان غەش بكـات، ئاو لەناو شیر بكات بۆ فرۆشتنێ بۆ ئەوەی شیرەكە زیاد بێت؟!، دایكی دەڵـێ: كچم خۆ ئیمامی عومەر لێرە نییە؟، كچەكە دەڵـێ: راسـتە ئیمـامی عومـەر لێرە نییە بەڵام ئەدی خودای ئیمامی عومەر لێرە نییە؟!!، نابێ شەرم لـە خـوا بكەیت؟!، ئیمامی عومەر گوێی لەو قسەیە دەبێ لە دەردەوە و ئەو دەرگەیە بە نیشانی دەكات دوایی دێت داخوازی ئەو كچە دەكات بۆ كوڕەكەی، ئـەو كـچە نموونەی تەقوایە، نموونەی ئافرەتانی مسوڵمانە كە تەماشا ئەكـەی لـە پێنـاوی خوا تورە بووە، لە پێناوی ئەوە كە زوڵـم و غـەش و خیانـەت لـە مـسوڵمانان نەكرێت، درۆیان لەگەڵ نەكرێت!، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) تورە بووە لەسەر حەقی مسوڵمانان، رۆژێكیان هاتۆتە ناو بازاڕ كۆمەڵێك گەنم دانرابـوو یـەكێك دەیفرۆشتن، ئەفەرموێ دەستی لەناو گەنمەكە راكرد دەسـتی بـە تـەڕی هاتـەوە دەرێ، تەماشای كرد ژێرەوەی گەنمەكە تەڕە، فەرمووی: بۆ ئەوگەنمە تەڕە؟! ئەو ئینسانە فەرمووی: باران لێی داوە، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: ئەی بۆ تەڕایەتییەكەت نەخستۆتە سەرەوە هەتا خەڵك بزانـێ ئـەوە تـەڕە؟! ئینجـا فەرمووی: (مَن غَشَّنا فَلَيس مِنَّا: هەر كەسێ غەش بكـات هەڵـەی كـردووە و لەسەر سوننەت و بڕیاری ئێمە نییە!)، جا خۆشەویستەكانم ئینسان دەبێ لەبـەر خاتری خـوا تـورە ببـێ تەنانـەت بـۆ دوای مردنێـشیان دەبـێ لەسـەر حـەقی مسوڵمانان تورە ببێ، نابێ بەخیل بێت و هەر بەرژەوەنـدی (مـصلَحة)ی خـۆی بوێت!، رۆژێكیان پێغەمبـەر (علیـه الـصلاة والـسلام) یـەكێك لـە تەنیـشتی نوێـژی

دەكرد، گـوێی لـێ بـوو كـه ئـەو كەسـه دوعايـەك دەكـات پێغەمبـەر زۆری پێناخۆشـبوو!، ئـەو ئینـسانه دەیگـوت: (اللـهُمَّ ارحَمنـي وَمُحَمَّـداً وَلا أَحَـداً)، دەیگوت: خوایه رەحم به من و موحەممەدی بكـەی و بەكەسـی تـری نەكـەی!، پێغەمبەریش (عليه الصلاة والسلام) فەرمووی: (لَقَد حَجَّرتَ واسِعاً)[82]، فەرمووی: تۆ شتێكی زۆر فراوانت زۆر گچكه كردۆتەوە، رەحمی خـوا ئەوەنـدە كەمـه بـەس بەشی من و تۆ بكات؟!!، بۆچی نـاڵێی خوایـه رەحـم بـه هـەموو مـسوڵمانان بكەیت؟!، جا نابێت ئینسان بۆ دوای مردنێش ئەوەندە بەخیل بێت پێـی وابـێ كه بەهەشت هەر دەبێ بۆ ئەو بێت!، زۆرجار ئینسان دوعا دەكات له خـەڵكی: ((خوایه سەرلێشێواوی بكەی))، یان ((خوایه غەرقی غـەزەبی خـۆتی بكـەی))، یان ((توشی جەهەننەمی بكەی))!، نەخێر دەبێ كه دوعا دەكات بڵێ: ((خوایـه هیدایەتی فلانه كەس یان فلانه قەومه بدەی))، پێغەمبـەر (عليـه الصلاة والـسلام) قەومەكەی ئەوەندە ئازاریشیاندا كەسانێكی وەكو ئەبولەهـەب و ئەبوجـەهل و موغەیرەی كوڕی شوعبه و عاصـی كـوڕی وائیـل...، وە هـەموو ئـەو كـافرە ناقۆڵایانەی قـوڕەیش، ئـەوجاریش دەیفـەرموو: (اللَّهُـمَّ اِغفِـر لِقَـومِي فَـاِنَّهُم لا يعلَمـون)[83]: خوایـه لـه قەومەكـەم خۆشـبەو هیدایـەتیان بـدە چـونكه ئەوانـه نەزانن!)، هەر كەسێك بزانێ تام و چێژی ئیسلام چییه و داهـاتوو (مُـستَقبَل)ی ئیسلام چەندە زێڕینه له دونیا و له قیامەت بەڕاسـتی لـه ئیـسلام دێتـەپێش، بەڵام نازانێ و ئاگای لێ نییه بۆیه نەخۆشه.

---

[82] ((حدثنا أبو اليمان أخبرنا شعيب عن الزهري قال أخبرني أبو سلمة بن عبد الرحمن أن أبا هريرة قال ثم قام رسول الله صلى الله عليه وسلم في صلاة وقمنا معه فقال أعرابي وهو في الصلاة اللهم ارحمني ومحمدا ولا أحدا فلما سلم النبي صلى الله عليه وسلم قال للاعرابي لقد حجرت واسعا يريد رحمة الله))، صحيح البخاري، كتاب الادب، باب: رحمة الناس والبهائم، رقم الحديث ٥٦٦٤.

[83] صحيح البخاري، كتاب الانبياء، باب: أم حسبت أن أصحاب الكهف والرقيم، رقم الحديث ٣٢٩٠.

**سێیەم: لەکاتی زوڵمکردن لە حەیوان**، وەختێک کە زوڵمێک لە حەیوانێك دەکرێت ئینسان دەبێ توڕە ببێ، لەسەر دینی خوا توڕە دەبێ و، لەسەر حەقی مسوڵمانان توەڕە دەبێ و، لەسەر حەقی حەیوانیش دەبێ ئینسان توڕە ببێ!، حەیوانیش ئەگەر مەزلوٚم بوو دەبێ ئینسان لەسەری بێتە وەلاٚم!، حەدیسی صەحیحی پێغەمبەرە (عليه الصلاة والسلام) ئافرەتێك دەچێتە جەهەننەم، لەسەر چی؟، لەسەر ئەوەی یەك پشیلەی سجن کردووە ئاو و خواردنی نەداوەتێ هەتا مردووە، پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرمووی: لەسەر ئەو پشیلەیە ئەو ئافرەتە دەچێتە جەهەننەم با مسوڵمانیش بێ![84]، لەبەرئەوە ئەو حەیوانەش حەقی خوٚیەتی، جا هەموو جوٚرە حەیوانێك کە زوڵمی لێ بکەی ئەوە گوناهبار دەبی وە لەسەر حەقی حەیوانیش دەبێ ئینسان توڕە ببێ و وەدەنگ بێ.

## خاڵی سێیەم: زیانەکانی توڕەبوونی نابەجێ

ئینسان زوٚرجار لە ئەنجام (نَتيجَة)ی توڕەبوون تێدەگا کە توڕەبوونەکەی چەندە زیان (ضَرَر)ی بووە:

**یەکەم شت**: بەهوٚی توڕەبوونی ناشەرعی و نابەجێ خوا لەخوٚت توڕە دەکەیت!، چونکە قسەیەك لە زوبانت دەردەچێ یان کردەوەیەك ئەنجام دەدەی، بڕیارێك دەدەی، کە خوا پێی ناخوٚشە و خوا لێت توڕە دەبێ!.

**دووەم**: شەیتانی بەخوٚت دڵخوٚش دەکەی، چونکە دەبیتە رەفیقی شەیتان بەوەی کە بڕیارێکی هەڵە بدەی، یان قسەیەکی هەڵە بکەی.

---

[84] المعجم الكبير، صفحة ٣١٥، جزء١٧، باب العين: عقبة بن عامر الجهني يكنى ابا حماد كان ينزل مصر.

**سێیەم**: نیگەرانبوونی بەرامبەرت، ئەوەی کە لە بەرامبەرتە لە خۆتی تـوڕە دەکەیت!، ئەگەر پیاوە و ئەگەر ئافرەتـە، لـە خـۆتی تـوڕە دەکـەی و حیقـد و بوغزت زیاد دەبێ لە دڵ و دەروونی خەڵکدا.

**چوارەم**: ئینجـا ئـەنجامی خـەراپی لـێ دەپـشکوێتەوە!، جـاری وا هەیـە توڕەبوون دەبێتە مایەی بڕیای هەڵە وەکو ئەوە لـەکاتی توڕەبوونـدا پـەلاماری چـەقۆیەك یـان سـیلاحێك دەدات و کەسـێك دەکوژێـت!!، تەقەیـەك دەکـا، پەلاماری کەسێك دەدات و لێی دەدات، یـان پـەلاماری خێزانەکـەی ئـەدات و لێی ئەدات دوایی پەشیمان دەبێتەوە بۆی!، یان پەلاماری منداڵەکەی ئەدات و ئەوەندەی لێئەدات دوایی پەشیمان دەبێتەوە و نازانێ چـی بکـات لەبەرئـەوەی لەکاتی توڕەبووندا کردوویەتی!، جاری وا هەیە توڕەبوون ئەنجامی خـەراپی لـێ دەپشکوێتەوە بۆیە ئینسان دەبێ ئاگاداربێت!!.

## خاڵی چوارەم و کۆتـایی: چارەسـەرەکانی توڕەبـوون چـییە؟:

ئینسان چۆن بتوانێ توڕە نەبێت؟، وە ئەگـەر توڕەبـوو چـی بکـات؟، **یەکەم**: جـارێ ئەگـەر ئینـسان توڕەبـوو پێویـستە ئەگـەر بـە پێـوە بێـت دابنیـشێ، توڕەبوونەکەی کەم دەبێتـەوە!، **دووەم**: پاشـان ئەگـەر ئـاوی لـێ نزیـك بـوو بـەزووترین کـات بـچێ دەسـتنوێژ بگـرێ، بۆچـی؟، چـونکە توڕەبـوون لـە شەیتانەوەیە و شەیتانیش لە ئاگر دروستکراوە، تۆ بچۆ دەستنوێژ بگرە بە ئـاو چونکە ئەو ئاوەش ئاگر دەکوژێنێتەوە!، دەستنوێژ بشۆ تا دەستنوێژەکە دەگری و دێیتەوە تۆزێك دێیەوە سـەرخۆت و توڕەبوونەکـەت کـەم دەبێتـەوە، **خاڵی سێیەم**: نوێژ بکـات، دوای توڕەبوونەکـەت دەسـتنوێژ بگـرە، وە دوو رکـات نوێژی (سوننەتی دەستنوێژ) بکە توڕەبوونەکەت نامێنێ!، ئەدی ئەگەر بمانـەوێ

چاك بین و توڕەبوونەكەمان هەر نەمێنێ، یاخود ئینسانێك هەمیشە توڕەیە و دەیەوێ نەرم و نیانیی بێتەوە سەرەخۆ:

١- با قورئان بخوێنێ!، قورئان شیفای تێدایە بۆ هەموو نەخۆشیەكانی ئینسان، ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآن مَا هوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ ٨٢- الاسراء، ٢- وەلە بارەی هەنگوینیش ئەفەرموێ: ﴿فِيهِ شِفَاء لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِك لآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ ٦٩- النحل، ئایەتی قورئانە، جا ئینسان بتوانێ بەهۆی قورئانەوە شیفای نەخۆشییەكەی خۆی بهێنێ كە الحمدالله هەموو ماڵێك قورئانی تێدایە!، الحمدالله ئەمڕۆ خەڵك زۆربەی خوێندەوارە!، ئەگەر هەرنا ئەتوانێ گوێ لە قورئان بگرێ لە جیاتی ئەوەی بیخوێنێ ئەگەر خوێندەواری نییە، گوێ لە قورئان بگرێ هەمیشە دڵی سەكینەت و ئارامی و نەرم و نیانی پێوە دیار دەبێ.

**خاڵی چوارەم:** یەكێك لە چارەسەرەكان ئەوەیە كە خۆ بەكەمگرتن (تَواضع) لەخۆیدا بهێنێتە دی، چونكە زۆربەی ئەو توڕەبوونانە جاری وا هەیە لە خۆ بەزلزانینەوەیە، كەسێك قسەیەك دەكات پێتخۆش نییە گوێ لەقسەی بگری، پێتوایە قسەی تۆ راستە و لە ئەنجامی ئەوەدا توڕە دەبی، كەسێك رەخنەت لێدەگرێ پێتخۆش نییە كەس رەخنەت لێبگرێت، (الاعجاب بِالنَّفس: سەرسام بوون بەخۆ)ت هەیە و خۆت لە خۆت رازی لە ئەنجامی ئەوەدا توڕە دەبی، نەخێر...، خۆ بەكەمگرتن لە خۆتدا بهێنەدی توڕە نابی!.

**خۆ بەكەمگرتن (تَواضُع) چۆن دێتەدی؟:** بە لەگەڵ دانیشتنی هەژاران دێتەدی، وە بەوە دێتەدی كە ئینسان دەچێتە مەجلیسێك لەلای خوارێ دابنیشێ، خۆ بەكەمزانین بەوە دێتەدی ئینسان كە لەگەڵ خەڵكێك بڕوا وە پێشیان نەكەوێ لە خۆڕا، لەلای سەرەوە دانەنیشێ، لە پێشەوەی سەیارە دانەنیشێ هەمیشە، كاری خۆ بەكەمگیری بكات لەلای مسوڵمانان بۆ ئەوەی

شەیتان رقی ببێتەوە چونکە ئەو کەشخە (کِبر)یە لە شەیتانەوە دێت بۆ ناو دڵ و دەروونی ئینسان!، پێویستە ئینسان لە دەروونەوە خۆی پێ کەم بێ، سەیر بکات خوای گەورە لە چی دروستی کردووە!، (تَواضُع) ئەوەیە کە کاتێ هەقی بیست و بینی ئیعتیرافی پێ بکات و بەهەقی بزانێ و خەڵکی پێ کەم نەبێ، بۆیە ئەگەر تەماشای نموونەیەك بکەین لە ژیانی ئیمامی مالیك (خودا لێی رازی بێت) کە موحەممەدی کوڕی مەهدی زانایەکە دەگێڕێتەوە و ئەفەرموێ: جارێکیان لە مەجلیسی ئیمامی مالیك دانیشتبووم پیاوێك هاتە ژوور سەلامی کرد و ئیمامی مالیك لەلای خۆی داینا و ئەو پیاوە فەرمووی: ئەی ئیمام من رێگای شەش مانگەڕێ هاتووم بۆ لای تۆ قەومەکەی من منیان ناردووە پرسیارێك لە جەنابت بکەم!، ئیمامی مالیك ئیمامی مەدینەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بووە!، فەرمووی: پرسیارەکەت بڵێ، پرسیارەکەی لێکرد وەڵامەکەی ئیمامی مالیك هەر ئەوەندەبوو فەرمووی: نازانم!، کە ئەو وەڵامەی دایەوە، ئەو ئینسانە وەکو ئەوەی سەتڵێك ئاوی ساردی پێدا بکەن ئاوای لێهات!!، شەش مانگەڕێ هاتووە بۆ لای ئیمامی مالیك کە هەڵیانبژاردووە بەحیساب ئەو پرسیارە لای ئەو وەڵامەکەی دەست دەکەوێ ئەویش دەفەرموێ نایزانم!، زۆری پێ سەیربوو گوتی: چۆن پێم دەڵێی نایزانم، ئەی من کە گەڕامەوە لای قەومەکەی خۆم چیان پێ بڵێم؟!، بڵێم ئیمامی مالیك چی فەرموو؟!، فەرمووی بڕۆ پێیان بڵێ: مالیك گوتی نایزانم!.

ئەوە ئەوپەڕی خۆ بەکەمگرتنە!!، ماموٚستای وا هەیە ئەمڕۆ هەر پرسیارێکی لێ بکە وەڵامت دەداتەوە!، برای وامان هەیە هەر پرسیارێکی لێ بکە لە شەرعدا وەڵام ئەداتەوە!، پێیوایە ئەگەر وەڵامی هەموو پرسیارێك بداتەوە ئەوە هونەری تێدایە!، ئەوە زیرەکی و زانابیە!، نەخێر ئەوە بەهەڵەدا چووە، (أجرَأُكُم

عَلَى الفَتيا أجرَأُكُم عَلَى النَّار)[85] واتە: کێتان (جَريء) تر بێت لەسەر فەتوا ئەوە سوورە لەسەر -توشبون بە- ئاگر!، فەتوادان هەوەنتە نییە!، بۆیە ئیمامی مالیك فەرمووی: نایزانم، عەیب نییە ئینسان بڵێ نایزانم، عەیبە ئەگەر بزانێ و وەڵام نەداتەوە، یان نەزانێ و وەڵام بداتەوە!، یان دکتۆری وا هەیە دەچێتە لای لەوانەیە لە نەخۆشییەکە نەزانێت بەڵام ناڵێ: نازانم، شتێك دەنوسێ لە کاغەزەکە و دەیداتێ بۆ صەیدەلیە و دەرمانیشی ئەداتێ!، یاخود وەستایەکە ئالەتێك دەبەیتە لای با بڵێ: نایزانم، و دەستکاری نەکات!، ئەوە لە ئەنجامی چییە؟، لە ئەنجامی خۆ بەزۆرزانینە!، پێیوایە هەموو شت دەزانێ!، نەخێر..، ئینسان دەبێ خۆ بەکەمگرتن (تَواضع)ی هەبێ و لە خۆیدا بیهێنێتەدی بۆ ئەوەی کە بەرامبەریشی خۆشی بوێ و رقی لێ نەبێتەوە کە ئەو نەرم و نیانی (حَليم)یەی تێدا بێتە دی.

جا ئێمەش نامانەوێ درێژە بە وتارەکەمان بدەین زیاتر بەڵام پێویستە ئەو توڕەبوونەی کە زۆرجار لە ئێمەدا دروست دەبێ لە حاڵەتی شەرعییدا بەکاری بهێنین و لە پێناوی خودا توڕە ببین، چونکە ناکرێ ئینسان قەت توڕە نەبێ بەڵام گرنگ ئەوەیە بە هەق توڕە ببێ، ئیمامی شافیعی (خودا لێی رازی بێت) دەفەرموێ: (مَن إستُغضِبَ.وَلَم يَغضَب فَهو حِمارٌ) واتە: هەر کەسێ توڕە بکرێ و توڕە نەبێت ئەوە وەکو گوێدرێژ وایە!، یانی لە کاتی ئیهانە بە دین، لە کاتی ئیهانە بە مسوڵمانان، لە کاتی ئیهانە بە مەزڵومان ئینسان توڕە نەبێ ئەوە وەکو گوێدرێژ وایە!، وەکو حەیوان وایە کە حەیوان توڕە نابێ، ئینجا لە کۆتاییدا لە خوای پەروەردگار دەپاڕێینەوە و دەڵێین: یاڕەببی خوایە هیدایەتمان

[85] ((أخبرنا إبراهيم بن موسى ثنا بن المبارك عن سعيد بن أبي أيوب عن عبيد الله بن أبي جعفر قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم أجرأكم على الفتيا أجرأكم على النار))، سنن الدارمي، جزء ١، المقدمة باب الفتيا وما فيه من الشدة.

بدەی بۆ ئەوەی بتوانین لە کاتی گونجاو و پەسەندا تورە ببین، یارەببی خوایە تورەبوونی ناشەرعییمان تێدا نەهێنیە دی، خوایە بمانپارێزی لە کاتی تورەبوونی بێ شەرعیی، یارەببی خوایە ئاخیری عومرمان خێر بکەی، خوایە لە مردووەکانمان خۆشبیت، خوایە شیفای نەخۆشییەکانمان بهێنی، خوایە رەحمەت و بەرەکەتی خۆتمان بەسەردا برژێنی، خوایە لەژێر رەحمەتی دینەکەی خۆت خۆمان و میللەتەکەمان ئاسودە بکەیت، خوایە هەموو مسولمانانی دونیا لە دەردەسەری رزگار بکەی، خوایە خۆشی و راحەت بۆ هەمووماڵێکی مسولمانان بنێری، دەردەسەری و ناخۆشی ئەمرۆ لەسەر هەموو مسولمانێك هەڵگری لە دونیا... یا أرحَم الرَّاحِمينَ.

أقولُ قَولِي هَذا وَأستَغفِرُاللهَ لِي و لَكُم وَلِسائِرِالمُسلِمِينَ فَاستَغفِروهُ إِنَّهُ كانَ غَفَّاراً، أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم

﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾

آمين

# شەرم و شکۆ

قال رسول الله ﷺ:

(الإيمانُ بِضعٌ و سبعُونَ شُعبَة فأَفضلُها قَولُ لا الهَ الا الله وَأَدنَاها إماطَةُ الاذى عَنِ الطَّريقِ وَالحَياءُ شُعبَةٌ مِن الايمان) رواه مسلم.

# بسم الله الرحمن الرحيم

إنَ الحَمدَ لِلهِ نَحمَدُهُ وَنَستَعينه وَنَستَغفِره، وَنَعوذُ بِاللهِ مِن شُرورِ أنفُسِنا و سيئاتِ أعمالِنا، من يَهدِهِ اللهُ فَلا مضِلَ لَه، وَمَن يضلِل فَلا هَادِي لَه، وَنَشهَدُ أن لا الـهَ إلا اللهُ وحدَهُ لاشَرِيكَ لَه، وَنَشهَدُ أنَّ سيدَنا وَنَبيَّنا مُحَمَّداً عَبدُهُ ورسُولُه، اللهُمَ صَلِي وَسَلِم وَزِد وَبارِك عَلَى سيدنا محَمَدٍ وَعَلى آلِهِ وَأصحَابِه، صَلاةً وسلاماً إلى يومِ الدِّين، أما بَعدُ ياعِبادَ الله، أُوصيكُم بِتَقوى الله و طاعَته وَلُزومِ أوامِرِه وَكَثرَةِ مخافتهِ، فَأنَّ التَّقُوى شِعارُ المُؤمِنينَ، وَدِثارُ المُتَّقِين، و وصِيةُ اللهِ فِيَّ وَفيكُم وَفي النَّاسِ أجمعين.

أعوذُبِاللهِ مِنَ الشَيطانِ الرَجِيم: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ ١- النساء.

ئیماندارانی بەڕێز، ئەی ئوممەتی پێغەمبەری پێشەوا حەزرەتی موحەممەد ﷺ، سەلامی خوای پەروەردگارتان لێبێ و میهرەبانی خوا بڕژێ بەسەر ئێمە و هەموو مسوڵمانانی دونیا، یاڕەببی خوایە لە گوناهمان خۆشبێت، یاڕەببی خوایە ئاخیری عومرمان خێرکەیت، یاڕەببی خوایە ڕەحمەتی خۆمان لێ نەگریەوە، خوایە لە غەزەبی خۆت بمانپارێزی، خوایە لە (شُبُهات) و (شَهَوات) بمانپارێزی، ئامین...

بەڕێزان: ئیمان بناغە و بنچینەی ئیسلامەتی هەریەكێك لە ئینسانەكانە، لەناو ئیمانیشدا بە شێوەیەكی گشتی حەیاو ئابڕوو، شەرەف، شەرم و شكۆ، بەشێكی سەرەكی ئیمانە، پێغەمبەرمان ﷺ لە فەرموودەیەكدا كە موسلیم و

بوخاری (خوا لێیان رازی بێت) ریوایەتی دەكەن فەرمووی: (الایمان بِضعٌ و سبعونَ أو بِضعٌ و سِتُّونَ شُعبَة، فأفضلُها قَولُ لا الهَ الا الله، وَأدناها إماطَةُ الاذی عَنِ الطَّریقِ، وَالحَیاءُ شُعبَةٌ مِن الایمان) [٨٦] واتە: ئیمان حەفتا و ئەوەندە بەشە، یان شەست و ئەوەندە بەشە، بەرزترین بەشی ئیمان بریتییە لە (لا الهَ الا الله)، شایەتیدان بەوەی هەر خودا (الله) شایەنی پەرستنە، ئەوە دانپێداهێنانێكی دەروونی قەناعەتێكی ئینسان بەو شایەتومانییە وە جێبەجێكردنی بەرزترین بەشی ئیمانە، گچكەترینیشیان لادانی دڕك و ناخۆشی و كۆسپێكە لە رێگای مسوڵمانان، بە رێگایەكدا دەڕۆی بەردێكت دەكەوێتە سەر رێگا، دڕكێكت دەكەوێتە سەر رێگا، دارێكت دەكەوێتە سەر رێگا، لەسەر رێگای مسوڵمانانی لابدەی، كۆسپێك لەسەر رێگایە لەسەر رێگای مسوڵمانانی لابدەی، دڕندەیەك لەسەر رێگای مسوڵمانانە لای بدەی ئەوەیان گچكەترین بەشی ئیمانە!.

(وَالحَیاء شُعبَةٌ مِن الایمان): وە حەیاش بەشێكە لە ئیمان، بۆچی خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی گرنگی بە حەیا كردووە لە بەرامبەر خودا و پێغەمبەری خودا ﷺ، وە لە بەرامبەر مسوڵماناندا یەكیان بۆ ئەویتر؟!، لەبەر گرنگی زۆری، هەر بۆیەش پێغەمبەر لەو فەرموودەیەدا باسی بەشەكانی تری ئیمان ناكات، بەڵام ئەفەرموێ (حەیا بەشێكە لە ئیمان!)، یانی حەیا گرنگە بۆیە لێرەدا ئەوی بەتەنها باسكردووە!، لە نێوانی بەرزترینیان و نزمترینیان بەشێكی گرنگی باسكردووە كە بریتییە لە حەیا، بۆیە ئەگەر كەسێك حەیای نەبێت ئیمانیشی تەواو نییە یان نییە!، وە هەروەها ئەگەر

[٨٦] ((حدثنا زهیر بن حرب حدثنا جریر عن سهیل عن عبد الله بن دینار عن أبي صالح عن أبي هریرة قال قال رسول الله صلی الله علیه وسلم الایمان بضع وسبعون أو بضع وستون شعبة فأفضلها قول لا إله إلا الله وأدناها إماطة الاذی عن الطریق والحیاء شعبة من الایمان))، صحیح مسلم، كتاب الایمان، باب: بیان عدد شعب الایمان، رقم الحدیث ٣٥.

كەسێك ئیمانی نەبێت حەیاشی نییە!، یا ئەگەر حەیاشی هەبێ زۆر كەمە!، بۆیە دەڵێین پێغەمبەرمان (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: حەیا بە ئیسلامەتییەوە رادەوەستێ، كەسێكی مسوڵمان ئافرەت بێت یان پیاو خاوەنی حەیا و شەرمە چونكە پابەندە بە ئیسلامەوە، چونكە لە فەرموودەیەكدا كە ئیمامی بوخاری و موسلیم ریوایەتی دەكەن فەرمووی: (الْحَيَاءُ لايَأتِي إلا بِخَير)[87] حەیا هەر خێری بەدوادا دێ و خێری پێوەیە.

حەیا لە بەرامبەر خوا یانی سنوور نەبەزاندن، یانی خەتی سوور نەشكاندن، لە نێوان حەڵاڵ و حەرام خوای گەورە سنورێكی داناوە، سنووری حەڵاڵت بەزاند بۆ حەرام ئەوە بێ شەرمی و بێ حەیایی لە بەرامبەر خوادا كراوە (جل جلاله)، حەیا لە بەرامبەر پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بریتییە لە رێزگرتن لە فەرموودەكانی و شوێن پێ هەڵگرتنی، بەجێگاو رێ و سوننەتدا رۆیشتنی، رێز (إحترام) لە فەرموودەكانی و سوننەتە پیرۆزەكانی و دیفاع لێكردنی، ئەوە شەرمە لە بەرامبەر پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، چونكە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئیمانداریـنە!، ﴿لا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ﴾ ٢- الحجرات، دەنگی خۆتان بەرزمەكەنەوە بەسەر دەنگی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام)، ﴿لا تَجْعَلُوا دُعَاءَ الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاءِ بَعْضِكُمْ بَعْضًا﴾٦٣- النور، بانگی پێغەمبەر ﷺ مەكەن بەو شێوەیەی كە خۆتان بانگی

[87] ((حدثنا محمد بن المثنى ومحمد بن بشار واللفظ لابن المثنى قالا حدثنا محمد بن جعفر حدثنا شعبة عن قتادة قال سمعت أبا السوار يحدث أنه سمع عمران بن حصين يحدث عن النبي صلى الله عليه وسلم أنه قال الحياء لا يأتي لا بخير فقال بشير بن كعب إنه مكتوب في الحكمة أن منه وقارا ومنه سكينة فقال عمران أحدثك عن رسول الله صلى الله عليه وسلم وتحدثني عن صحفك))، صحيح البخاري، كتاب الادب، باب الحياء، رقم الحديث ٥٧٦٦.

یـەکتری دەکـەن، وە ڕێزگـرتن لـە قـسەی پێغەمبـەر و لـە فـەرموودەکانی و جێبەجێکردنیان ئەوە شەرم و حەیایە بەرامبەر بە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام).

وە شەرم بەرامبەر ئیماندارانیش یانی ڕێزگرتن لە ئیمانداران، یانی پاراسـتنی مافی ئیمانداران، یەکێك شەرم لە کەسێك دەکات ڕێزی دەگرێ، ئەگـەر باوکـە ڕێزی دەگرێ، حەیا بەرامبەر باوك یانی ڕێزگرتنی، حەیا بەرامبەر دایـك یـانی پاراستنی مافەکان (حقـوق) ی، ڕێز و حورمەتی جیران یانی حـەیا بەرامبـەری، حەیا بەرامبەر مسوڵمانان یانی پاراستنی ماف و پاراستنی ڕێز و حورمـەت و شان و شکۆیان.

## خۆشەویـستەکان، حـەیای ئینـسان ئینـسانی لـە گوناهـان دەپارێزێت:

چەندە ئینسان بە حەیا بێت ئەوەندە ئینسان لە گوناهان پارێزراوە، حـەزرەتی یوسف گەورەترین نموونەیە بۆ ئێمە کە کاتی خۆی خێزانەکـەی عـەزیزی میـسر داوای گوناهێکی لێکرد بەڵام یوسف (علیه الصلاة والسلام) فەرموی ﴿رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ﴾ **٣٣- یوسف**، خوایە سجنم زۆر پێخۆشترە لـەوەی کە ئەوانە داوام لێ دەکەن، ئافرەتەکە گوتی: یان دەبێ سجنی بکەم یـان دەبـێ بە قسەم بکاو شتی خراپ بکات، بەڵام حەزرتی یوسف لە شەرمی خودا لەبـەر حەیای لە بەرامبەر خوا سجنەکەی هەڵبژاردوە، (حەسـەنی بەصری) زانای تابعین (خوا لێی ڕازی بێ)، لێیـان پرسـی بـۆ ئەوەنـدە زاهیـدی و دونیـات پـێ کەمـە؟، فەرمووی لەبـەر چـەند شـتێکە، یـەکیان لەوانـە (عَلِمت بـأنَّ اللهَ يَراني حينَ المَعصِيَةِ): دەزانم لەکاتی گوناهکردندا خوا دەمبینێ بۆیە شەرمم کـرد گونـاهم نەکرد، ئینسانێك ئەگەر شەرم لە خوا بکات گوناه ناکات، بەتایبەت کـە هـەر خۆی و خوایەتی و کەس نایبینێت، ئەو کاتـە باشـترین حـەیای لـە بەرامبـەر

خوای خۆیدا ئەنجامداوە، بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لـە فەرموودەیـەكی صـەحیحدا باسـی ئـەو حـەوت كەسـانە دەكـات كـە لـەژێر سـێبەری خـوادا بەشێوەیەك كە خۆی دەزانـێ ڕۆژی قیامـەتێ ڕادەوەسـتن، ئەفـەرموێ یـەكیان لەوانە: «رَجُلٌ دَعَتـهُ إمـرأةٌ ذاتُ مَنـصبٍ وَجَمـالٍ قـالَ إنِّـي أخـافُ اللهَ»[88] واتـە: پیاوێك كە ئافرەتێكی خاوەن جـوانی و شـكۆ داوای گونـاهی لێبكـات، داوای ڕابواردنی لێبكات لەگەڵیدا وە ئەو پیاوە خۆی و خوای خۆیەتی و كەسی تریـان لەگەڵ نییە، بەڵام دەڵێ: ئەی ئافرەتە من لە خوا ئەترسـم!، لـە شـەرمی خـوا دەست لەو ئافرەتە نادات، شەرم و شكۆ و حـەیا لـەو حاڵەتانـەدا گرنگـە كـە تەنها خۆت و خوای شەرم لە خوا دەكەیت و لە گوناهان دەگەڕێیتەوە.

خوا ئەفەرموێ بە ئیمانداران بڵێ: ﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصارِهِمْ﴾ ٢٩- النور، واتە: چاویان لە ئاستی ئافرەتی نامەحرەمدا بگرنـەوە ﴿وَقُـلْ لِلْمُؤْمِنَـاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ﴾ ٣٠- النـور، بـە ئیمانـدارە ئافرەتـەكان و خوشـكانی مسوڵمانیش بڵێ چـاویان لـە بەرامبـەر پیـاوانی نامـەحرەم بگرنـەوەو نـەزەر نەكەن!، نەزەر بۆ پیاوان و ئافرەتان هەر نەزەرە، لەبەر خاتری خوا شەرم دەكا و حەیای هەیە نەزەر ناكات، ئەو چاودێری (مراقَبَة) ئیلاهیەیە كە وا لـە ئینـسان دەكات خۆی توشی گوناه نەكات و لە گوناهان بگەڕێتەوە، لە هەمانكاتیـشدا بێ شەرمی و بێ حەیایی ئینسان رادەكێشێت بۆ گوناه، چـونكە لـە حەدیـسی

[88] «حدثنا مسدد حدثنا يحيى عن عبيد الله قال حدثني خبيب بن عبد الرحمن عن حفص بن عاصم عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال سبعة يظلهم الله تعالى في ظله يوم لا ظل إلا ظله إمام عدل وشاب نشأ في عبادة الله ورجل قلبه معلق في المساجد ورجلان تحابا في الله اجتمعا عليه وتفرقا عليه ورجل دعته امرأة ذات منصب وجمال فقال إني أخاف الله ورجل تصدق بصدقة فأخفاها حتى لا تعلم شماله ما تنفق يمينه ورجل ذكر الله خاليا ففاضت عيناه»، صحيح البخاري، كتاب الزكاة، باب: الصدقة باليمين، رقم الحديث ١٣٥٧.

صــەحیحی پێغەمبــەردا هــاتووە کــە ئیمــامی بوخــاری ریوایــەتی دەکــات، ئەفەرموێ: (إِنَّ مِمَّا أَدرَكَ النّاس مِن كَلامِ النُّبوةِ الاولى إذا لَم تَستَحي فَاصنَع ما شِئتَ)[89]: ئەگەر کەسێك حەیای بەخۆ نەبێت هەرچی دەکـات بـا بیکـات!، یانی کەسێك حەیای نـەبێت لـە هـیچ ناگەڕێتـەوە!، بۆیـە حـەیا زەخیرەیـەکی گەورەیە بۆ ئینسانی ئیماندار!.

حەیا زۆر ناسکە، ئەگەر یەکێك حەیای نەبێت پێی دەڵێن حەیای ڕژاوە، کورد دەستەواژەیەکی زۆر جوانی هەیە دەڵـێ: ((حـەیا دەڕژێ، سـومعە دەشـکێ))!، سومعەی ئینسان بە نرخە ئەگەر شکا بە زەحمەت چاك دەبێتەوە، بەڵام هەر لـە حـەیا ئـەهوەنترە، شـتی شـکاو دەکـرێ چـاکبکرێتەوە ئـەمما شـتی ڕژاو کۆناکرێتەوە!، ئاو ئەگەر ڕژا کۆناکرێتەوە، دەگوترێ ((حەیا دەڕژێ)) یانی حەیا ئەگەر ڕژا کۆناکرێتەوە جارێکی تر، ئەگەر ئینسان حەیای چـوو ئـافرەت بێـت یان پیاو ناوی دەچێتە سەر لق و پۆپەی دار و لە هەموو شـوێنان نـاوی دەزڕێ، حەیا زۆر بە نرخە!!، حەیا زەخیرە و سەرمایەیە بۆ ئینسان، بۆیە زۆر ناسـکە و پێویستە بیپارێزین...

بۆیە دەڵێین حەیا چونکە بەشێکی ئەساسـییە لـە ئیمـان، ئەگـەر دەمانـەوێ ئیمانمان سەلامەتبێ با حەیامان سەلامەت بێت، بەرامبەر بە خـوا، بەرامبـەر بە پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام)، وە بەرامبەر ئیماندارانیش، بەتایبەت بۆ ئافرەتان کە بەداخەوە ئـەمڕۆ ئافرەتـان بـە پـیلان و چەواشـەکاری دوژمنـانی

[89] ((حراش حدثنا أبو مسعود عقبة قال قال النبـي صلى الله عليه وسلم إن مما أدرك الناس من كلام النبوة إذا لم تستحي فافعل ما شئت، حدثنا آدم حدثنا شعبة عن منصور قال سمعت ربعي بن حراش يحدث عن أبـي مسعود قال النبـي صلى الله عليه وسلم إن مما أدرك الناس من كلام النبوة إذا لم تستحي فاصنع ما شئت))، صحيح البخاري، كتاب الانبـياء، باب: أم حسبت أن أصحاب الكهف، رقم الحديث ٣٢٩٦.

ئیسلام هەر لە رۆژئاواوە هەتا زۆر شوێنی دیكەی دونیا زۆرێك لە ئافرەتان حەیایان ڕژاوە!، بونەتە مایەی شەرمەزاری ئوممەتان، ڕێزم بۆ خوشكانی مسوڵمان ئەمما ئافرەتان بەڕاستی زۆرێكیان حەیایان ڕژاوە لە سەردەمی خۆماندا بەتایبەتی زیاتر شولیان لێ هەڵكێشاوە، دوژمنانی ئیسلام لە ڕۆژئاواوە بە دیاری ئابرووی ئافرەتانمان بۆ دەبەن و بۆمان دەنێرنەوە جلوبەرگی رووت وە جلوبەرگێك كە لە ئیسلام و مسوڵمانان ناوەشێتەوە بۆ وڵاتی مسوڵمانانی دەنێرن بۆ ئەوەی كە ئابرووی مسوڵمانان بچێت و ئافرەتانیش بێ حەیا و بێ شەرم بن، جارێ بە رووتی ئافرەتانمان بۆ عەرز دەكەن لە سینەما و مەسرەح و قومارخانە و مەیخانە و لەیالی شەوانە كە مەشرووباتی تێدا دەخورێتەوە!، جارێ لە ئاهەنگ و گۆرانی و هەڵپەركێ و سەما و سەیرانەوە كە تەماشای رۆژئاوا (غَرب) و ئەوروپا دەكەین بەتایبەتی و بەدیاری لێیان وەردەگرین، جارێ بەو جلوبەرگە نامۆ و غەریب و سەرسوڕهێنەرانە كە لە دەرەوە بۆمان دێت!!، كە نازانین چ دەستێك ئەو جلوبەرگەمان بۆ دەدورێت و بۆمان دەنێرێت؟!، كە بەداخەوە رۆژانە تەماشای بازارەكان دەكرێت چ جلوبەرگێكی نوێ هاتووە بۆ ئەوەی ئافرەتانی كوردیش پیادەی بكەن و لەبەری بكەن، هەر لە كابۆوە بگرە هەتا ستریز و كۆڵۆن و تەنوورە و هەرچی كە قوماشی خاریجییە لە تەنگی و لە تەنكی كە بە دیاری بۆ ئێمە دێت و ئێمەش لێیان وەردەگرین و دەیكەینە كاڵا بە باڵای خۆماندا، وا دەزانین خەڵاتمان دەكەن!، وا دەزانین پێشكەوتنمان لەوەدایە كە ئافرەتانمان لە هەموو جلوبەرگێكدا تەقلیدی رۆژئاوا بكەن!، بازرگانی بە ئافرەتی مسوڵمان دەكرێت!، چەواشەی مسوڵمانان دەكرێت بۆ سەرلێشێواندنی گەنجەكان.

بەڕاستی ئەمڕۆ مسوڵمان نازانێ چۆن بە بازاڕەكانی كوردستاندا بڕوات؟!، دەبێ مسوڵمان چاوی نزم بكات لە جیاتی ئەوەی ئافرەت چاوی نزم بكات!، دەبێ پیاوی مسوڵمان ڕێگایەك بدۆزێتەوە پێیدا تێپەڕ ببێ ئەگەرنا ئافرەتان شان لە شانی ئەدەن لە بازاڕەكاندا!، تەماشای بازاڕەكانی خۆمان دەكەی خەریكە دەگاتە بازاڕەكانی ئەوروپا!!، چ شتێك وایكرد بازاڕەكانی ئێمەی كورد وای لێبێت لەگەڵ بازاڕەكانی ئەوروپا لە مەسەلەی بەرەڵایی ئافرەت مونافەسە بكات؟!، هەندێك خەڵكی بە هەڵە حاڵی خۆشمان پێیوایە كە ئەو جلوبەرگە غەریب نییە بۆ كورد و ئەوە پێشكەوتنە!!، بەڵام لۆمەی جلوبەرگی مسوڵمانان دەكات، زەم و زەمكاری حیجابی مسوڵمانان دەكات، حیجاب و سەرپۆشی ئافرەتانی مسوڵمان دەبێزرێنێت و ناشیرینیان دەكات گوایە ئەو حیجاب و جلوبەرگە لە وڵاتانی بێگانەوە هاتوو (مستَورَد)ە بۆ كوردستان!!، تەنانەت لە قوتابخانەكانیشدا هەندێ ماموٚستا بەداخەوە لەچك لە سەری قوتابی دەكەنەوە (كە لە ڕاستیدا بینراوە!) بە بیانووی ئەوە كە گوایە كەم گوێی لە دەنگی ماموٚستا دەبێت لەبەرئەوەی گوێی داپۆشیوە!!، ئەوە كەی پاساو (مبرر)ە كە شیاوە بهێنرێتەوە لەبەرئەوەی كە گوایە گوێی لێ نییە؟!!، بۆچی سەرژمێری ئەو ئافرەتانە ناكەن كە لە قوتابخانەكاندا یەكەم و دووەم و سێیەم دەبن بزانن كامە لە ئافرەتان زیرەكترن ئەوانەی كە داپۆشراو (مُحَجَّبة)ن یان ئەوانەی كە سافیرەن؟!.

ئێمە پێمانوایە ئەو حیجابە وەكو دین میللەتی كورد وەریگرتووە نەك وەكو عادات و تەقالیدا!، ئەوەیە ((عوزر لە قەباحەتێ گەورەتر))، دەڵێ ئەوە بێگانەیە! بەڵام كابۆ و كۆڵۆن و سترێز و ئەوانەی پێ بێگانە نییە؟!، وەك بڵێی دیفاع لە كابۆیەك دەكات پێیوایە كە میراتی داپیرەیەتی بۆی بەجێماوە!!، توخوا پێم بڵێن كەی كابۆ جلوبەرگی داپیرەمان بووە؟!، كەی داپیرە و پور و دایكمان لە ڕابردوودا ناوی كابۆ و كۆڵۆن و سترێز و تەنورەیان زانیوە؟!، كەی

جلوبـەرگی دایکـان و داپیرەکانمـان ئـاوابوون؟!، یـاخود چـارۆکەیان بەسـەر سەرداوە؟، ئەگەر ئەوە دیفاعە لە جلوبەرگی کوردی ئـەوە جلوبـەرگی کـوردی نییە و جلوبەرگی رۆژئاوا و بێگانەیە، ئەو رۆژئاوایەی کـە کوردسـتانی پارچـە پارچەکرد لە ساڵی ١٩١٦ز لە رێکەوتننامەی سایکس بیکۆ!!، ئەو رۆژئاوایـە هەر رۆژئاوای پێشووە!، بەڵام ئێمە دەبێ بزانین چـی بەکـەڵکمان دێـت؟، هـەتا کوردستان بە گوند و شار و دێهاتەوە بە حوجرە و مامۆستاو فەقێ و عـادات و تەقالیدی مسوڵمانانەوە پابەندبووە ئەو جلوبـەرگ و بـێ حەیاییـەی ئـەوروپای نەناسیوە!، ئێستا بەهۆی تەلەفیزیۆن و سەتەلایت و سەفەری خاریج و هاتنـەوە و رۆیشتن و ئەو چاولێکەرییەی کە هەیە خەڵك گەیشتۆتە ئەو ئاستە لە بـواری ئەخلاقدا لاسایی رۆژئاوا بکرێتەوەو هەرچی لەوێ هەیە لێردش لەناو ماڵەکاندا پیادە بکرێت!!، بەڕاستی ئەوە جێگای داخە!..

جاران ئەگەر ئافرەتێك لە کۆڵانێکدا رۆیشتبایە پیاوێکی هاتبا سەر رێگا ئەو ئافرەتە سەری خۆی بە کونە دیوارێکـەوە دەنـا و نەدەڕۆیـشت هـەتا پیاوەکـە تێدەپەڕی!!، ئێستا ئەگەر پیاوێك و ئافرەتێـك بەرامبـەر یـەکتری بـێن دەبـێ پیاوەکە سەری خۆی نزم بکات نەك ئافرەتەکە!!، شەرمی لێ ناکـات!!، جـاران ئەگەر کۆمەڵە ئافرەتێك لەسەر رێگایەك یان لەبەر دەرگایـەك بونایـە، ئەگـەر کۆمەڵە پیاوێك یان پیاوێك بەوێدا رۆیـشتبایە ئافرەتـەکان دەچـونەوە ژوورەوە دەیانگوت: ئەوە پیاو بە ئێرەدا هاتن بابچینە ژوورەوە!، بەڵام ئێستا نەك هـەر ناچنە ژوورەوە بەڵکو بەسەری کۆتەوە دادەنیشن لە تـەوقی سـەرەوە تـا بـەری پێیان تەماشای دەکەن و دەبێ پیاوەکە سەری خۆی نـزم بکـات بـە شـەرمەوە هەتا تێدەپەڕێت!.

ئەو شتە بۆ پێچەوانە بویەوە؟!، خۆ ئافرەتەکان هەر کوردن، پیاوەکانیش هەر کوردن، ئافرەتان و خوشکانمان، کچان و خێزانەکانمان ئەو عادات و تەقالیـدەیان

له‌ كویٚ وه‌رگرت؟، كێ به‌رپرسیاره‌ لێی؟، ئایا باوك و دایك و برا و خوشك و خێزانه‌كان و هه‌موو ئه‌و خزمانه‌ی كه‌ سه‌رپه‌رشتی كچه‌كان و ئافره‌ته‌كانیان ده‌كه‌ن به‌رپرسیار نین لێی؟، پێغه‌مبه‌رمان (علیه الصلاة والسلام) رێگای به‌ پیاوان نه‌داوه‌ له‌سه‌ر رێگاوبان و به‌رده‌رگا دابنیشن چ جای ئافره‌تان؟!!، كه‌ ئه‌مرۆ هه‌موو كوٚڵانێك ئافره‌تانی تێدا داده‌نیشن، فه‌رمووی (علیه الصلاة والسلام): (إيّاكم وَالجُلوس فِي الطُّرُقات)[٩٠]: ئاگادارتان ده‌كه‌مه‌وه‌ له‌سه‌ر رێگا دامه‌نیشن، به‌ پیاوانی فه‌رموو!!، (قالُوا مالَنا بدٌ يارَسولَ الله نَتَحَدَّثُ فِيها): فه‌رموویان: چارمان نییه‌ ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ئیشمان له‌سه‌ر رێگاوبانه‌، فه‌رمووی: (فَإِذا أَبَيتُم إلا المَجلِس فَأعطُوا الطَّريقَ حَقها): ئه‌گه‌ر هه‌ر دانیشتن له‌سه‌ر رێگا حه‌قی رێگا بده‌ن، فه‌رموویان: (وَمَا حَقُّ الطَّرِيقِ يارَسولَ الله) حه‌قی رێگا چییه‌؟، فه‌رمووی: (غَضُّ البَصرِ وَكَفُّ الاذى ورَدُّ السَّلامِ وَأمر بِالمَعرُوفِ ونهيُ عَنِ المُنكَرِ): چاوت بگریه‌وه‌ له‌ به‌رامبه‌ر هه‌ر ئافره‌تێك كه‌ به‌وێدا دێت، وه‌ڵامی هه‌ر سه‌لامێك بده‌یه‌وه‌ كه‌ لێت ده‌كرێت، ئه‌گه‌ر خه‌راپه‌یه‌كت بینی بیگۆڕی، وه‌ فه‌رمان به‌ چاكه‌ بكه‌یت، وه‌ ده‌ستیشت بپارێزی له‌ ئه‌زیه‌ت و ئازاری هه‌ر مسوڵمانێك كه‌ به‌و رێگایه‌دا دێت، ئه‌گه‌ر بۆ پیاوان دروست نه‌بێت چۆن بۆ ئافره‌تان دروسته‌ كه‌ له‌سه‌ر رێگاوبان و كوٚڵانه‌كان دابنیشن، یان ئافره‌ت پیاسه‌ی بازاڕ بكات به‌بێ پرسی مێرده‌كه‌ی، یان كه‌ كچی ماڵه‌وه‌یه‌ بێ پرسی باوكه‌كه‌ی، ده‌چێت بۆ بازاڕ و پیاسه‌یه‌ك ده‌كات و ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ ماڵه‌وه‌!، یان له‌ ماڵه‌وه‌ ئه‌گه‌ر میوانێك دێت سه‌ری خۆی داده‌پۆشێت به‌ڵام كه‌ ده‌چێته‌ بازاڕ

---

[٩٠] ((حدثنا معاذ بن فضالة حدثنا أبو عمر حفص بن ميسرة عن زيد بن أسلم عن عطاء بن يسار عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال إياكم والجلوس على الطرقات فقالوا ما لنا بد إنما هي مجالسنا نتحدث فيها قال فإذا أبيتم إلا المجالس فأعطوا الطريق حقها قالوا وما حق الطريق قال غض البصر وكف الاذى ورد السلام وأمر بالمعروف ونهي عن المنكر))، صحيح البخاري، كتاب المظالم، باب: أفنية الدور والجلوس فيها، رقم الحديث ٢٣٣٣.

لەچكەكەی فڕێ دەدات گوایە: وەك بڵێی بۆ خەڵكی بازاڕ نەزەر نییە بەلاّم بۆ میوانەكە نەزەرە!، سەیر ئەوەیە كە ئەگەر میوانێك دێت دوو دەرگایان لەسەر خۆی دادەخات!، بەلاّم دوایی كە دەچێتە بازاڕەوە پێی ئاساییە ئەگەر نیو سەعاتێك لەگەڵ كەسێك قسەی بكات!، یان لەو دوكانە بۆ ئەو دوكان دەیان مامەڵە (مُعامَلَة) بكات كە پێویستیش نییە!.

نەزەر هەر نەزەرە!، چ پیاوێك بیكات نەزەرە وە چ ئافرەتێكیش بیكات هەر نەزەرە، هۆكارەكەیشی هەردووكیانن بە تایبەتی ئافرەتەكە كە خۆی كەمتەرخەم (مُقَصِّر)ە لەوەی كە بەو شێوەیە خۆی عەرز دەكات لە بازاڕەكاندا، بەلاّم مخابن وە ئەسەف بۆ ئەو باوك و برایانەی كە خۆیان بە مسوڵمان دەزانن بەلاّم كچەكانیان وە خوشكەكانیان و ئافرەتەكانیان لە بازاڕ دەسوڕێنەوە قاچ و قولیان رووتە، جێگای داخە زۆرمان هەن ئەهلی مزگەوتیشن، حاجییە و ئەهلی مزگەوتە، صۆفییە و ئەهلی مزگەوتە، پیاوی مسوڵمانە و ئەهلی جومعە و جەماعەتە، بەلاّم لەوە ناپێچێتەوە كە كچەكەی چۆن دەڕوات بۆ سەفەر؟، بە چ جلوبەرگێك دەڕوات؟، رۆژێك لە رۆژان بانگی نەكردووە: كچەكەم تۆ چ جلوبەرگێك دەكڕی؟، بەچ جلوبەرگێك سەفەردەكەی؟، ئایا بۆن لە خۆت دەدەی یان لە خۆت نادەی؟، كە لە كاتێكدا پێغەمبەرمان (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (أَيُّما امرَأَةٍ إستَعطَرَت ثُمَّ خَرَجَت عَلى قَومٍ لِيَجِدُوا رِيحها فَهِي زانِيةٌ)[91] ئەفەرموێ: هەر ئافرەتێك خۆی بۆنخۆش بكات بۆ دەرەوە بەلای كۆمەڵێك خەڵكدا تێپەڕێت بۆ ئەوەی بۆنی بكەن ئەوە زینای كردووە!، توشی زینای چاو بوون ئەو خەڵكە بەهۆی ئەو ئافرەتەوە، بۆنیان كردووە، شەهوەتی

[91] ((أخبرنا محمد بن إسحاق بن خزيمة حدثنا محمد بن رافع حدثنا النضر بن شميل عن ثابت بن عمارة الحنفي عن غنيم بن قيس عن أبي موسى الاشعري عن النبي صلى الله عليه وسلم قال : أيما امرأة استعطرت فمرت على قوم ليجدوا ريحها فهي زانية))، صحيح ابن حبان، رقم الحديث ٤٤٢٤.

ئه‌و خه‌ڵكه‌، ئه‌و پیاو و گه‌نجانه‌ ده‌جوڵێنێ; له‌به‌رئه‌وه‌ ئه‌و گوناهه‌ كێ لێی هۆكاره‌؟، باوك و براكان دایكه‌كان لێی هۆكارن كه‌ ناپێچنه‌وه‌ كچه‌كانیان كه‌ ده‌ڕۆن بۆ موناسه‌بات، ئه‌رێ ئه‌و موناسه‌به‌ته‌ شه‌رعییه‌ یان شه‌رعی نییه‌، بوكێك ده‌گوازنه‌وه‌ شاییه‌ ره‌شبه‌ڵه‌كێكه‌ كچه‌كه‌ی وێڵ ده‌كات و ده‌ڕوات نازانێ چ ده‌كات له‌وێ و ده‌ستی چه‌ند كه‌سان ده‌گرێت؟!.

به‌ڕاستی جێگای ئه‌سه‌فه‌!، ئه‌گه‌ر لێشی بپرسی له‌وانه‌یه‌ بڵێ: كاكه‌ جا ده‌سته‌ڵاتم نییه‌، كچی منه‌ و به‌ قسه‌م ناكات، زۆر عه‌یبه‌ بۆ پیاوێك كه‌ كچه‌كه‌ی به‌ قسه‌ی نه‌كات، پیاو ده‌بێ كچه‌كه‌ی به‌ قسه‌ی بكات!، ده‌بێ خێزانه‌كه‌ی به‌قسه‌ی بكات و بۆ شوێنی حه‌رام نه‌هێڵێ بڕوات، وه‌ له‌ هه‌مانكاتیشدا باوكان و دایكان پاساو (مُبرِر) یان بۆ ده‌هێننه‌وه‌ گوایه‌: كاكه‌ خۆ كاتی خۆی ئێمه‌ش هه‌ر گه‌نج بووین و منداڵ بوین، ده‌با ئه‌وانیش چه‌ند رۆژێك و چه‌ند ساڵێك قۆناغی گه‌نجایه‌تی ببینن!، ئینسانی مسوڵمان نابێ ئه‌و قسه‌یه‌ بكات، چونكه‌ له‌ هه‌ر نه‌زه‌رێكدا ئه‌و باوك و دایكه‌ گوناهبارن!، وه‌ له‌ هه‌ر قسه‌یه‌كی ناشه‌رعی كه‌ له‌گه‌ڵ ئافره‌تێك یان پیاوێكی نامه‌حره‌مدا ده‌یكه‌ن، له‌ هه‌ر هه‌ڵس و كه‌وتێكدا كه‌ له‌گه‌ل پیاواندا راده‌وه‌ستێت، له‌ هه‌ر بۆنێكدا كه‌ خه‌ڵكێك بۆنی ده‌كات، ئه‌و عه‌تر و بۆنانه‌ی كه‌ ئیستا په‌یدابوون به‌تایبه‌تی ئه‌و بۆنانه‌ی كه‌ له‌ دووره‌وه‌ بۆنی ده‌ڕوا و هه‌ستی پێده‌كرێت، جێگای خۆیه‌تی باوكان و برایان دایكان له‌و بابه‌ته‌دا زۆر به‌خۆدا بچنه‌وه‌.

ئافره‌تی خه‌راپ فیتنه‌یه‌كه‌ بۆ ئومه‌تی مسوڵمان!، پێغه‌مبه‌ر (علیه الصلاة والسلام) فه‌رمووی (مَا تَركتُ بَعدي فِتنَةً أَضَرُّ عَلَى الرِّجَالِ مِن النِّساء) [92]: هیچ

---

[92] ((حدثنا آدم حدثنا شعبة عن سليمان التيمي قال سمعت أبا عثمان النهدي عن أسامة بن زيد رضي الله عنهما عن النبي صلى الله عليه وسلم قال ما تركت بعدي فتنة أضر على الرجال من النساء))، صحيح البخاري، كتاب النكاح، باب: ما يتقى من شؤم المرأة، رقم ٤٨٠٨.

فیتنەیەك لە دوای من جێنەماوە لـە ئـافرەتی خـەراپ گـەورەتر بێـت لەسـەر پیاوان!، بەڵام دەشفەرموێ: (الدُّنيا مَتاعٌ وَخَيرُ مَتاعِها المرأةُ الصَّالِحَة): دونیـا خۆشی یەو باشترین خۆشی لە دونیا ئافرەتێکی ساڵیحەیە!، رێزمان بۆ هـەموو ئافرەتانی ساڵیحە و مسولمان، بەڵام پێویستە خۆمان بپارێزین لـە دەسیـسە و پیلانی دوژمنـان کـە دەیانـەوێ خوشـکەکانمان و خێزانـەکانمان و کـچەکانمان، ئافرەتەکانمان تەقلیدی رۆژئاوا بکەن و وەریـانبگێرن، بەڕاسـتی ئـەوەش زیـاتر سەرەنجامی بێ پەروەردەییە کە لەکاتی خۆیدا باوکان و دایکان گرنگیان بە کـچ و کوڕەکانی خۆیانیان نەداوە، کوڕ ئەمڕۆ پێی شەرم نییە دەسـتی خوشـکەکەی خۆی دەگرێ دەڕوات، دەیداتە دەستی چەند کەسانێك و شایی پێـدەکات وە لـە سەیران و گەشت و گوزاردا هەڵیدەپەڕێنێت!، ئەگەر حەیا هەبێت دەبێ بەخۆیدا بچێتەوە!، زۆر عـەیبە یـەکێك خوشـکەکەی خـۆی تەسـلیمی خـەڵکی بێگانـە بکات!، زۆر عەیبە ماڵی وا هەیە لە شاردا خەڵکی دەچێتە ماڵیان بە ئاشـکرا بـەڵام دەنگـێ ناکـات ئـەوە پێـی دەگوترێـت (دَيُّـوس)، کـە (دَيُّـوس) ناچـێتە بەهەشت!، (دَيُّوس) ئەو کەسەیە بۆخۆی بێ شەرعی لـە مـاڵی خۆیـدا ببینێـت بەڵام نەهی لێ نەکات و بێ دەنگـی لێبکـات و چاوپۆشـی لێبکـات، ئـەوە چ مسولمانەتییەکە؟!!.

پەروەردەی ماڵ و منداڵمان ناکەین، هەتا کاتێك گەورەدەبن بۆخۆیـان حـەیاو شەرمیان نابێت توشـی گونـاە دەبـن بەتایبـەت ئافرەتـان هەسـتیان ناسـکە، ئافرەت هەستی ناسکە کاتێك لە منداڵییەوە پەرودردە نابێت بە پەروەردەیەکی ئیسلامی و ئیسلام ناناسێت کە گەورەش دەبێت بۆخۆی هەڵـسوکەوت دەکـات نازانێ چۆن هەڵس و کەوت دەکات، لە حەقیقەتی ئیسلام شـارەزا نییـە، بۆیـە زۆرجار دەگاتە سنووری خۆکوشتن!!، خۆسوتاندن کە ئەمڕۆ باوە لەناو ئافرەتاندا

بەداخەوە ئەوە دەڵێم: ئەگەر ئافرەتان بزانن سەرەنجامی خۆسوتاندنیان لە دوارۆژ چییە، هەرگیز پەنا نابەنە بەر خۆسوتاندن و خۆکوشتن!!، کە هۆکارێکی سەرەکیشیان باوکان و دایکانن وە مێردەکان و برایەکانیانن چ لەوکاتەوە کە پەروەردەیان نەکردوون چ لەوکاتەوە کە پاساو (مبرر) دروست دەکەن بۆ ئەوەی خۆیان بسوتێنن یان خۆیان بکوژن، بۆ ئەو ئافرەتانە دۆزەخیان پێ خۆشترە لە دونیا؟!!، مەگەر پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) نەیفەرمووە: هەر ئینسانێك لە دونیا بەچی خۆی بکوژێت لە دۆزەخیشدا بەو شێوە بەردەوام خۆی دەکوژێتەوە!![٩٣]، ئەگەر خۆی لە شاخ فڕێ بدات ئەوە بەردەوام لە دۆزەخدا خۆی لە شاخ فڕێدەداتە خوارەوە!، ئەگەر خۆی بە چەقۆ بکوژێت ئەوە بەردەوام لە دۆزەخ بە چەقۆ خۆی دەکوژێت!، ئەگەر خۆی بەئاگر بسوتێنێ ئەوە بەردەوام لە دۆزەخدا خۆی بەئاگر دەسوتێنێ و ئاگر لە خۆی بەردەدات!، ئەگەر خۆی بەژەهر بکوژێت بەردەوام لە دۆزەخدا ژەهر دەخوات!، ئەوە حەقیقەتێکی موتڵەقە دەبێ ئافرەتان هەموویان ئەوە بزانن، ئەوەی خۆی دەسوتێنێ ئەوە خۆی توشی جەهەننەم دەکات، ئەو ئاگرەی کە خوای گەورە ئامادەی کردووە، چونکە خۆکوشتن قەتڵێکە، باوکان و دایکان و براکانیش هۆیان لەو قەتڵەدا هەیە، هۆکارن ئەگەر کەمتەرخەمیان کردبێت لە پەروەردە و پێگەیاندنی ئافرەتان، هی کچەکانیان وە هی کوڕەکانیان، وە لە دروستکردنی پاساو (مُبرِر) بۆ ئەو ئافرەتانەی کە خۆیان دەکوژن، بۆیە ئەگەر حەیا نەبێت دەگاتە ئەو سنوورە کە ئینسان شەرم لە خوا نەکات و خۆی توشی کوشتنیش بکات.

---

[٩٣] ((حدثنا محمد بن بشار حدثنا عثمان بن عمر حدثنا علي بن المبارك عن يحيى بن أبي كثير عن أبي قلابة أن ثابت بن الضحاك وكان من أصحاب الشجرة حدثه أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال من حلف على الاسلام فهو كما قال وليس على ابن آدم نذر فيما لا يملك ومن قتل نفسه بشيء في الدنيا عذب به يوم القيامة ومن لعن مؤمنا فهو كقتله ومن قذف مؤمنا بكفر فهو كقتله))، صحيح البخاري، كتاب الادب، باب: ما ينهى من السباب واللعن، رقم الحديث ٥٧٠٠.

جاران ئافرەتان زۆر بەدەگمەن دەیانوێرا یاخود شەرمیان دەکرد لە بەرامبەر باوکەکانیان، مامیان، خاڵیان و ناوی پیاوەکەی خۆیان دێنا بەنەوعێك، یان هەر بە (مێرد) ناویان نەدەبرد!، دەیانگوت (پیاودکەم) یان دەیانگوت (ئەو، فلانە کەس)!!، بەڵام ئەمڕۆ بە ئاشکرا زۆرێك لە ئافرەتی بێ ئابڕوو داوای ڕەوابوونی زینا دەکات!، ئەو ئافرەتانە هەر ئەوەی کوردن خۆ کەسی تر نەهاتووە لە کوردستاندا ژیا بێت، ئەو ئافرەتانە هەر ئەوەی کوردن ئەمڕۆ لە بازاڕەکانی خۆمان دەیانبینین!، گەیشتۆتە ئەو ئاستە کە ئافرەتان بە ئاشکرا داوای زینا بکەن!.

فەرموون بڵاوکراوەیەکی کۆمەڵێك ئافرەتی بێ ئابڕوو کە نوسیویانە: ((بۆ ئازادی ئافرەتان))، ئەو دەقانەی کە تێیدا هەیە هەمووی دژایەتیکردنە بە قورئان و ئیسلام و بە خوا و بەپێغەمبەر ﷺ، ئەو ئافرەتانە لە کوێ هاتوون خۆ کوردن، هەر کچی ئەم و کچەزای ئەم و کوڕەزای ئەون!.

لە یەکێك لە بڕگە (فقَرة)کانیدا سەبارەت بە مارەیی دەڵێ: (دانانی هەر نرخێك بەرامبەر بە زەواجی هەر دوو کەسێك لەژێر هەر ناوێکدا بێت قەدەغەیە)!!، نابێ مارەیی و مارەکردن هەبێت!، بۆچی؟، بۆ ئەوەی بە ئاسانی دەستی ئەو بگرێ و پاشان چەند ڕۆژێکی پێ بچێت دەستی ئەو بەردات و دەستی یەکێکی تر بگرێت!، ئەگەر بە پارە بێت ئەو پارەیەی هەمووجار بۆ کۆناکرێتەوە ئەوەیان تەڵاق بدا و ئەوەیان مارە بکات و مارەیی ئەوە ئەوەندە بدات!، ئیسلامەتی چەندە نرخی بۆ ئافرەت داناوە! دەبێ مارەیی تەقدیم بکات کاتێك دەچێت بۆ داخوازی ئافرەتێك نەك ئاوا بەلاش بە سوك و سادەیی تەماشای ئافرەت بکرێت، ئایا ئەوە ڕێزی ئافرەتە کە مارەیی نەبێت؟، یان ئەوە ڕێزیەتی کە ئەو ئافرەتە بەبێ مارەیی بچێتە دەر لە ماڵ و یەکێك بیبات؟!!.

لە بڕگەیەکی تردا دەڵێت (ژن و پیاو ئازاد و یەکسانن لە جیابوونەوەدا)، یانی ئەو ئافرەتە لەگەڵ پیاوەکەدا هیچ فەرقیان نییە لە بابەتی جیابوونەوەدا!.هەر رۆژێك پیاوەکە حەزی لێبێت دەڵێ ئافرەت برۆ، هەر کاتێك ئافرەتەکەش حەزی لێبێت دەڵێ مێردەکە تەلاقم دایت و پەیوەندیت بە منەوە نییە!، یانی مەسەلەی تەلاق رۆڵی نەمێنێ و هەر ناویشی نەمێنێ کە هەر باسیشی نەکردووە!، لە یەکێکی تر دەڵێت: (مومارەسەی جینس -واتە زینا- هیچ جۆرە سزایەکی لەسەر نییە)!، باوکێك، دایکێك، برایەك کەس بۆی نییە بەو کورە بڵێ کە زینای لەگەڵ کچەکەیان کردووە بۆ وات کرد؟، بۆ دەستی کچەکەمانت گرتووە لەناو باخ، لەناو دائیرە و قوتابخانە لە لەیالی شەوانە، لە کوێ لە کوێ...، کەس بۆی نییە!!، ئەوە بەڕاستی دەرگای فیتنە و فەسادە بۆ میللەتی کورد دەکرێتەوە، ئەوە دژایەتی میللەتی کوردە نەك دڵسۆزایەتی بۆ میللەتی کورد و پێشکەوتن بۆ ئافرەت!.

لە بڕگەیەکی تردا -ماددەی چل و دووەم- دەڵێت: (ژنان لە پۆشینی جلوبەرگ و خۆ ئارایشتکردندا ئازادن، هەرجۆرە دەخالەتکردنێك لەو مافەدا سزای لەسەرە)، یانی ئافرەتان چ جۆرە جلوبەرگێك لەبەر دەکەن و تەقلیدی چ ولاتێك دەکەن ئازادن و کەس بۆی نییە دەست بخاتە رێگایان!!، لە راستیدا ئەوە هاندانی هەموو ئافرەتانە کە بە قسەی باوك و دایك و عورف و عاداتی خۆشیان نەکەن چ جای ئیسلامەتی.

پاشان دەڵێ: (هەرجۆرە رێگرییەك لە تێکەڵاوبوونی ژن و پیاو لە مەکتەب و شوێنە گشتییەکاندا سزای لەسەرە)، نابێ رێگری هەبێ لەوەی ئافرەت و پیاو تێکەڵاو بن و دەبێ سەربەخۆیی هەبێت!!، بەڕاستی ئەوانە جێگای ئەوەن کە ئینسان بیری لێ بکاتەوە بۆچی؟!، ئافرەت بۆچی وا بەو شێوەیە بەبێ پەردە و

بەڕاشکاوی، بەبێ شەرمانە و بێ ئابڕوانە ئەمڕۆ داوای بەرەڵاییەك بکات نەك هەر لە ئیسلام ناوەشێتەوە بەڵکو لە عورف و عادات و تەقالیدی کوردەواری خۆمان ناوەشێتەوە!، هەتا گوتویانە: (بۆچی پیاو بۆی هەیە چوار ژنان بهێنێ بەڵام ژن بۆی نییە چوار مێردان بکات؟!!، فەرقیان چییە؟)، چونکە هەر لە سەرەتاوە نوسیویانە ((قانونی یەکسانی ژن و پیاو))، پێمانوایە پیاو پیاوە و ئافرەتیش ئافرەتە، پیاو وەزیفەی خۆی هەیە و ئافرەتیش وەزیفەی خۆی هەیە، پیاو تەحەمولی وەزیفەی ئافرەت ناکات و ئافرەتیش تەحەمولی وەزیفەی پیاو ناکات!، توخوا کێ لە مسوڵمانان چ کوردێکی بە شەرەف با مسوڵمانیش نەبێت رازییە بێجگە لە خۆی خێزانەکەی سێ مێردی تری هەبن؟!، کێ رازییە بەوە؟، بۆ ئافرەتی کورد ئەمڕۆ ئەو قسەیە بکات بە ئاشکرا لەناو شارەکانی خۆماندا؟!، بەڕاستی قسورەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەموو لایەکمان، جا پێموایە کە ئەوانە وردە وردە بۆیان شل دەکرێت بۆیە دەگەنە ئەو ئاستەکە ئەو قسانە بکەن بۆ ئەوەی حەیا و ئابڕووی میللەتی کوردیش ببەن، چونکە ئەوە لێرە تەرجەمەش دەکرێت و دەچێتەوە وڵاتانیش، وە پێمانوایە میللەتی کورد مسوڵمانە و نەوەی سەلاحەددینی ئەیوبییە و نەوەی دەیان و سەدان زانای بەناوبانگە کە لە کوردستاندا پێگەیشتووە و خزمەتی ئیسلامی کردووە و مزگەوتەکانی لە هەموو گوند و دێهاتەکانیدا شاهێدن و کوژراوەکانی هەمووی بە شەهید لە قەڵەم دەدات و دەیان و سەدان هەزار بەناو ئەنفالی هەیە و شەهید و قوربانی داوە لە پێناوی خزمەتی دین و وڵات و رزگارکردنی وڵاتەکەی، کەچی ئەمڕۆ ئاوا ناشیرین بکرێت بەڕاستی جێگای داخە کە ئەوە بەرپرسیاریەتییە کە لەسەر شانی هەموو لایەکمانە.

بۆیە لە کۆتاییدا دەڵێم پێویستە ئێمە بۆخۆمان حەیا و ئابڕوومان زیاد بکەین، تەماشای عوسمانی کوڕی عەففان بکەین خەلیفەی سێیەمی

پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) لـە وەختێكـدا كـە عـائیـشە دەگێڕێتـەوە دەفەرموێ: رۆژێكیان پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) جلوبەرگەكانیم بۆ شـۆردبوو، كراسێكی بەسەر خۆیدا هەڵكێشابوو لە سەرووی چۆكییەوە گۆشتەكەی بـستێك دیاربوو نەدەگەیشتە سەرچۆكی، ئەفەرموێ: بـاوكم واتـە ئەبووبـەركی صـدیق هات ئیجـازەی وەرگـرت و پێغەمبـەر (علیه الصلاة والسلام) ئیجـازەی داو هاتـە ژوورەوە سەرچۆكەكەی دانەدایەوە و داینەپۆشی، عومەری كوڕی خەتتاب هـات هەروا، عوسمانی كوڕی عەففان لـە دەرگایـدا یەكـسەر پێغەمبـەر (علیه الصلاة والسلام) سەرچۆكی خۆی داپۆشییەوە!، عائیشە (خـوالێی وازیبـێ) زۆری سەرسـوڕما دوای ئەوەی كە ئەوان رۆیشتن لە پێغەمبەری پرسی ئەمە بۆچـی؟، فـەرمووی: ئەی عـائیشە عوسمان پیاوێكی زۆر بەحەیا و بە شەرمە، ئەگەر سەرچۆكی خـۆم دانەدابایەوە نەدەهاتە ژووری!، بەو عیبارەتە فەرمووی: (أَفَلا أَستَحِي من رجلٍ تَستَحِي منه المَلائِكَـة؟): من چۆن شەرم لە كەسێك نەكەم كە مەلائیكەتـەكانی خوا شەرمی لێ دەكـەن؟!!، حـەیای ئیمـامی عوسمـان نـاوا بـووە!، حـەیا لـە بەرامبەر پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) حەیا لە بەرامبەر خوا شـەرمی لـە خـوا كردووە، بـا ئافرەتـەكانمان و خوشـكەكانمان و خێزانـەكانمان تەماشـای خێزانـی فیرعەون بكەن لە سەردەمی حەزرەتی موسا كە كاتێك لـەژێر دەسـتی زوڵـم و ستەمی فیرعـەون و فیرعەونییەكانـدا دوعـای دەكـرد و دەپاڕایـەوە لـە خـوا، فەرمووی: ﴿رَبِّ ابْنِ لِي عِنـدَكَ بَيْتًـا فِـي الْجَنَّـةِ﴾ ١١- التحـریم، لـە كۆتـایی سوڕەتی (التَّحریم) لە قورئانی پیرۆزدا، واتە: خوایە لەلای خـۆت لـە بەهەشـت خانووێكم بۆ ئامادە بكە، (بَيْتًـا فِـي الْجَنَّـةِ): ماڵێـك لـە بەهەشـت!، خێزانـی فیرعەون لەچی كەم بوو داوای بەهەشت دەكات ئەگەر مەسەلە خۆشی و راحەت و خۆشگوزەرانی دونیا بوایە؟!، لە ماڵی فیرعەوندا هەموو شتێك هەیە! بـەڵام پێی خۆش نییە لەبەرئەوەی شەرم لـە خـوا دەكـات خـۆی لـە گونـاه و تـاوان

پاراستووە و خۆی دەپارێزێت، دەڵێ:: (رَبِّ ابْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ): لەلای خۆت لە بەهەشت ماڵێکم بۆ ئامادە بکە، (وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ): پەروەردگارم رزگارم بکەی لە فیرعەون وە لە کردەوەکانیشی، (وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ): لە گەلی ستەمکارییش کە گەلی فیرعەونە رزگارم بکەیت، دەبێ ئافرەتی مسوڵمانیش ئاوا بڵێت نەك تەسلیمی ویست (إرادة)ی بێ شەرعی مێردەکەی ببێ وەختێ کە بۆ شوێنێکی بێ شەرعی دەبات وەك گایەك کە هەست و ویستی نەبێ -تەشبیهی رێزی ئافرەت نەبێت- وە دوای دەکەوێت و ئیرادەکەی لە دەستی کەسێك دەنێت کە بۆ شوێنی شوبوهات و شەهەوات و غەرقی گوناه و تاوان رایدەکێشێ، بۆیە دەڵێم ئافرەتانیش دەبێ خاوەنی ئیرادەی خۆیان بن، مەرج نییە هەرشتێك کە براکەی پێی کوت دەبێ جێبەجێی بکات!، هەرشتێك کە مێردەکەی پێی گوت کە بێ شەرعیش بوو دەبێ جێبەجێی بکات، خوای پەروەردگار لە بەقسەکردنی دایك و باوکیشدا قەیدی داناوە چ جای بەقسەکردنی براو کەس و کاری تر!!، ئەفەرموێ ﴿وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَى أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا﴾ ١٥- لقمان، ئەگەر داوایان لێکردی شەریك بۆ من بڕیاردەی نابێ بەقسەیان بکەی بۆ دایك و باوك، داوای بێ شەرعییان لێکردی بە قسەیان مەکە، (لا طاعَةَ لِمَخلوقٍ فِي معصِيَةِ الخالِقِ)[٩٤]: هیچ کەسێك نابێ لە بێ ئەمری خوادا بە قسەی هیچ کەسێك بکات جا هەر کەسێك بێت!!، ئینسانی مسوڵمان دەیەوێت لەسەر رێگای شەرع بڕوات، دەیەوێ قیامەتی هەبێت، ئەگەر کار و وەزیفەکەی لە ماڵەوە بێت، لەناو کۆمەڵێك مسوڵمان بێت، لە دائیرە بێت، ئەگەر زانی کێشە لە کار و

[٩٤] ((قال حمزة وسمعت أبا الحسن الدارقطني يقول كان يتقى لسان تمتام قال أبو الحسن والصواب ان الوركاني حدث بهذا الاسناد عن عمران بن حصين ان النبي صلى الله عليه وسلم قال لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق))، مسند إمام أحمد، جزء ١، صفحة ١٣١، رقم الحديث ١٠٩٥

وەزیفەکەیدا هەیە لە رووی شەرعییەوە (فَلا سمعَ وَلا طَاعَة)، نابێ گوێڕایەڵی برا گەورەکەی خۆی یان سەرپەرشتیاری خۆی بکات لە بابەتەکەدا.

جا لە خوای پەروەردگار دەپاڕێینەوە دەڵێین یارەببی خوایە حەیا و شکۆ و شەرمان بۆ زیاد بکەی بۆ خۆمان و ماڵ و منداڵمان، بۆ کچەکان و کوڕەکان، بۆ خێزانەکانمان، خوایە بۆخزم و کەس و نەتەوەی کورد (یارَبَّ العالَمین)، یارەببی خوایە میللەتی کورد لەژێر سایەی ئیسلام و شەرم و شکۆی ئیسلامدا بپارێزی، یارەببی خوایە حەیا و شەرم و ئابڕووی دایکان و خوشکانی میللەتی کورد لە هەر کوێ هەن لێرە یان لە خاریج بپارێزی، یارەببی خوایە عاقیبەتی عومرمان خێر بکەی، خوایە لە دەسیسە و پیلانی دوژمنانی ئیسلام و دوژمنانی میللەتی کورد بمانپارێزی، یارەببی خوایە لە پیلانی زلهێزانی کوفر بمانپارێزی، خوایە مسوڵمانان لە هەر کوێ هەن سەریان بخەی، خوایە رزگاریان بکەی لەژێر نیری ستەمکاران و زاڵمان، یارەببی خوایە لە خۆمان و ماڵ و منداڵمان خۆش بیت، هیدایەتمان بدەی بۆ ئەوەی عەبدی راستەقینەی تۆ بین.

أمین، أقولُ قَولِي هَذا وَأستَغفِرُاللهَ لِي وَ لَكُم فَاستَغفِروه إنَّهُ كانَ غَفَّاراً، أعُوذُ بِاللهِ منَ الشَّيطانِ الرَّجيم

(رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)

آمین

# مـــردن

﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ ١٨٥- آل عمران

## بسم الله الرحمن الرحيم

انَ الحَمدَ لِله نَحمده ونَستَعِينه وَنَستَغفره، ونَعُوذ بِالله من شرورِ أنفُسَنا وسيئات أعمَالنا، من يَهدِهِ اللهُ فَلا مضل لَه، ومن يُضلِل فَلا هادي لَهُ..، نَشهَدُ أن لا الهَ الا اللهُ وحدَهُ لاشَريكَ لَهُ، وَنشهَدُ أن سيدَنا وَنَبينَا محمداً عَبده ورسُولهُ.. هَذا الرَسولُ الذِي بَلّغَ الرِسالةَ وَأدَى الامانَةَ، ونَصحَ الامَّةَ وَكَشَفَ الغُمَّة وَجَاهَدَ فِي الله حَقَ جِهَادِهِ وَتَركَنا عَلى المحجَة البَيضاء، لَيلُها كَنَهارِها، لايَزيغ عَنها الا هَالِك، صلَواةُ الله وسلامه عَلَيهِ وَعَلى آله وَأصحابِهِ صلاة وسلاماً الى يَومِ الدِّين، امَا بَعد عِبادَ الله أوصِيكُم وَنَفسِي أولاً بِتَقوَى الله وَطاعَتِه وَلُزومِ أوامرِهِ وَكَثرَةِ مخافَته فَإنَّ التَّقوى شعارُ المؤمنين، ودثار المُتَّقين، ووصيةُ الله سبحانَه وتَعالى فيَّ وفي النَاسِ أجمعين، قَالَ اللهُ (سبحانه وتعالى) في كِتابِهِ الحَكيمِ أعوذُ بِاللهِ من الشَّيطانِ الرَّجيم ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرا وَنِسَاءً وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ ١– النساء.

ئیماندارانی بەڕێز، ئەی ئوممەتی موحەممەد ﷺ، دڵسۆزانی خودا و پێغەمبەری خودا (عليه الصلاة والسلام)، سەلامی خوای پەروەردگارتان لەسەربێ، رەحمەت و میهرەبانی خوا بڕژێ بەسەر ئێمە و هەموو مسوڵمانانی دونیا لەم رۆژە پیرۆزەدا، بەڕێزان دیارە ئێمەی مسوڵمان بەپێی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرمان (عليه الصلاة والسلام) لەوە حاڵیی بووین کە دونیا تاقیگەیە بۆ ئینسان و شوێنی تاقیکردنەوەیە، ئەو چەند ساڵەی کە ئینسان لە دونیادا

بەسەری دەبات لە تاقیگە (مختَبر)ێکدایە، دوای ئەو تاقیکردنەوە و ئیمتیحانە ئەو ئینسانە دونیا بەجێدەهێڵێ!، کۆچ دەکات بەرە و قۆناغێکی تر کە قۆناغی بەرزەخە، پاشان لە دوای قۆناغی بەرزەخ (کە ناو گۆڕە) بەرەو قۆناغی مەحشەر، دواییش لەوێوە بەردو بەهەشت خوا بمانداتێ وە یان بەرەو دۆزەخ خوا بمانپارێزێ!، وە ئینسان لە دونیادا تاقیکراوەتەوە بە کۆمەڵێك مەرج ئەو مەرجانەی کە خوای گەورە لەسەر ئینسان دایناون لە قورئانی پیرۆزدا هەموویان باسکراون، بەگشتی خوای گەورە پێمان دەفەرموێ: من بپەرستن!، فەرمانبەریم بکەن..، ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالانس إلا لِيَعْبُدُون﴾ ٥٦- الذاريات، ئەفەرموێ: ئینسان و جنۆکەم تەنها بۆ پەرستراني خۆم دروستکردوون، حیکمەت لە دروستکردنی ئینسان و جنۆکە رابواردن نییە لە دونیا بەڵکو تەکلیفێکیان لەسەر شانە کە بریتییە لە عیبادەتکردن بۆ خوا (خواپەرستی)، هەرچی دروستکراوە تەسبیحاتی خوا دەکات: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إلا يُسبحُ بِحمْدَهِ﴾ ٤٤- الاسراء، ئەو کۆمەڵە مەرجە کە خوای گەورە لە ئیسلامدا لەسەر ئێمەی داناوە زامنی بەهەشتن، کەسێك دەیەوێ بچێتە بەهەشت با ئەو مەرجانەی کە خوا دایناوە لە قورئانی پیرۆز جێبەجێیان بکات دەچێ بۆ بەهەشت و خوا لێی رازی دەبێ!، دەستنوێژێك دەشۆی مەرجێکە بۆ نوێژکردن، نوێژکردن کاتێك دروستە کە دەستنوێژت هەبێ، بەهەشتیش کاتێك پێتدەدرێ کە عیبادەتت کردبێ بۆ خوا!، عیبادەتکردن و پاڕانەوە لە خوا و کرنۆش بردن و سەجدە بردن بۆ خوا وەرگرتنی تەوجیهاتی ربُ العالمين، رۆیشتن لەسەر بەرنامەی خوا و دەستگرتن پێیەوە مەرجن بۆ ئەوەی ئینسان بچێتە بەهەشت!، ئەوە یەك، دووهەم: کۆمەڵێك موسیبەت و بەڵا بۆ ئینسانەکان دێن لە دونیادا ئەو موسیبەتانەش هەموویان تاقیکردنەوەن، وەك برسێتی، تێنووێتی، هەوراز و نشێو، سەرما و گەرما، ترس، رۆیشتنی ماڵ و سەروەت

و سامان، رۆیشتنی منداڵ و ئەولاد و خۆشەویستان، ئەوانە هەمووی تاقیکردنەوەن!، یەکێك لەو موسیبەتانە ئەمڕۆ وەکو تاقیکردنەوە باس دەکەین کە بریتییە لە موسیبەتی مردن، مردن لە قورئاندا، مردن لە روانگەی ئینسانی مسوڵمانەوە چۆن تەماشا دەکرێ؟، دیارە جێگای خۆیەتی کە لەسەر ئەو بابەتە بەقووڵی بدوێین بەڵام ئەوەندەی کە لە فورسەتدا بێ لە وتاری ئەمڕۆدا عەرزی دەکەم سێ خاڵن: خاڵی یەکەم حەقیەتی مردن لە قورئاندا، خاڵی دووەم مردن کاتێکی دیاریکراوی هەیە، سێیەم: ئایا بە راکردن و خۆشاردنەوەی ئینسان لە مردن ئەجەل دوا دەکەوێ؟.

ئەو مردنەی کە واقیعێکە و ئینکار ناکرێ، ئەمڕۆ زۆر کەس لە ترسی مردن خۆی تووشی حەرام کردووە!، موعامەلەی حەلاڵ ناکات نەوەك برسی ببێ و ماڵ و منداڵی هەژار ببێ!، نەوەك دوای مردنی ئەو ماڵ و منداڵی لە برسان بمرن، مردن وای کردووە کە ئینسان ترسنۆك و بێ غیرەت بێ، موسیبەتی مردن وایکردووە نینسان حەق نەڵێ و بیشارێتەوە، موسیبەتی مردن موسیبەتێکی گەورەیە، زۆرجار ئینسانی لە رێ لادەدات هەر لەبەرئەوەی کە مردن دواخات و تووشی مردن نەبێ، پێیوایە کە مردن بەدەست خۆیەتی نازانێ مردن دەستەلاتی ئەو نییە!.

ئەگەر لەسەر خاڵی یەکەم هەندێك بەکورتی بڕۆین ((حەقیقەتی مردن لە قورئاندا)) بەوە دەست پێدەکەین کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ ١٨٥- آل عمران، واتە: هەموو گیانلەبەرێك ئەبێ بمرێ، ئەوە بڕیاری خوایە (جل جلالە)، هەروەك چۆن بڕیاری خوایە: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ﴾ ١٨٣- البقرة، واتە: رۆژووتان لەسەر فەرزکراوە، ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ﴾ ١٧٨- البقرة، واتە: تۆڵە سەندنەوەتان لەسەر فەرزکراوە، ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ﴾ ٢١٦- البقرة، جەنگ لە پێناوی

خوا، ﴿فَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَّوْقُوتًا﴾ **١٠٣- النساء**، واته: نوێژ لەسەر ئیمانداران فەرزكراوه و كاتێكی دیاریكراوی بۆ دانراوه، ﴿وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ وَارْكَعُواْ مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾ **٤٣- البقرة** ...، ئەوانە هەمووی ئەمری خودان ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ﴾ **١٨٥- آل عمران**، هەموو نەفسێك دەبێ بمرێ، بڕیاری خوایە (جل جلالـه)!، جا ئینسانی مسوڵمان له دوو لایەنەوه باوەڕی بە مردن هەیە:

**یەكەمیان**، بەچاوی خۆی دەیبینێ، **دووەمینیشیان**، ئایەتێكە لە قورئان!، بەڵام ئینسانی كافر هەر لەبەرئەوەی بە چاوی خۆی دەیبینێ باوەڕی بەمردن هەیە ئەگەرنا نەك لەبەرئەوەیە ئایەتێكە لە قورئان و دوای مردن زیندوو دەبێتەوه و حیسابی لەگەڵ دەكرێ و بەهەشت و جەهەننەم چاوەڕێی دەكەن!، بەڵێ مردن حەقیقەتێكە: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾ **٢٦، ٢٧- الرحمن**، واته: هەرچی لەسەر زەوییە ڕۆژێك دێ نامێنێ تەنها خودا دەمێنێ (جل جلالـه)!، ئەو ڕۆژەی كە تەنها خوا دەمێنێ دەفەرموێ: ﴿لِّمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ﴾ **١٦- غافر**، دەفەرموێ: موڵك و دەسەڵاتی دونیا، دەسەڵاتی كەون هی كێیە؟، كەس نییە وەڵام بداتەوه هەر بۆخۆی دەفەرموێ: (لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ) دەسەڵات دەسەڵاتی خودایە!، دەسەڵاتی (رب العالمين)ە، ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُواْ للّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ﴾ **٤٨- إبراهيم**، واته: ڕۆژێك دێ ئەو ئەرزە بەدل دەبێ خوا دەیگۆڕێ بە ئەرزێكی تر، ئاسمانەكانیش دەگۆڕدرێن...، ئەو وەزعەی كە ئێستا لە دونیادا ئێمە دەیبینین ئاوا نامێنێتەوه، فلانە كەسە بە كەیفی خۆی ئینسانەكان بچەوسێنێتەوه و فلانە كەسەش هەتا دەمرێ هەر بچەوسێندرێتەوه و فلانە گەلە مەزلوم بێت و فلانیش زالم بێت و فلانە دەوڵەتە ئاوا و فیسار بنەماڵە ئاوابێ!!، نەخێر ئەو دونیایەی كە ئەمڕۆ دابەشكراوه و بست بە بست

خەڵكی شەڕی لەسەر دەكات و ئەم پاوانكارییەی كە ئەمڕۆ لە دونیـادا دەكـرێ ئاوا نامێنێ!، ڕۆژێك دێ ئەو زەوییە تەختێ دەبێ!.

خۆشەویستەكانم، بۆیـە خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿كُـلُّ نَفْـسٍ ذَآئِقَـةُ الْمَوْتِ﴾ ١٨٥– آل عمـران، هـەموو نەفـسێك دەبـێ مـردن بـچێژێ، بـۆ دەفەرموێ ((بچێژێ))!، چونكە چەشتن لە حاڵی حەیاتدایە، ئینسان كە دەمـرێ یەكجاری كۆتایی نایە!، خۆ ئەگەر ئینسان بە مردن كۆتایی بهاتایـە ئـەی ئـەو ماندوبوونە بۆچی بوو؟! كافرەكان لە ڕۆژی قیامەت دەڵـێن: ﴿یَـا لَیْتَهَـا كَانَـتِ الْقَاضِیَةَ﴾ ٢٧– الحاقـة، خۆزگە كە دەمردین جارێكی تر زیندوو نەددبوینـەوە!، بەڵام دوای مـردن یەكـسەر قۆنـاغی تـر دەسـتپێدەكات كـە قۆنـاغی نـاوگۆڕ (بەرزەخ)ە، ئینسان كە مردیش ڕوحەكە جۆرە پەیوەندییەكی لەگـەڵ لاشـەكەی لـە گۆڕدا دەبێ جا ئەگەر مسوڵمان بێ ئەوا قەبرەكەی بۆ دەبێتە باغێك لـە باغـەكانی بەهەشـت و ئەگـەر مـوجریم و گوناهبـار و زاڵـم و كـافر و بێبـاوەڕیش بـێ ئـەوا قەبرەكەی بۆ دەبێتە چاڵێك لـە چـاڵە ئاگرینـەكانی دۆزەخ!، وەكـو پێغەمبـەرمان فەرمووی (علیه الصلاة والسلام): (القَبر إِمَّا رَوضَـةٌ مِـن رِیـاضِ الجَنَّـة أَو حُفـرَةٌ مِـن حُفَـرِ النِّیران)[95] واتە: قەبر یان باغێكە لە باغەكانی بەهەشت یان چاڵێكە لـە چـاڵەكانی دۆزەخ!، هەموو ئینسانێكیش دەبێ یەكێك لەو دووانە بچێژێ!.

مردن جێگای خۆیەتی هەموو كەس لێـی بترسـێ بـەڵام ئینـسانی مـسوڵمان دەبێ چاك بزانێ كە دوای مردن قۆناغـەكانی تـر دێنـەپێش خـۆی بـۆ ئامـادە دەكات، بەنو ئیسرائیلییەكان خۆیان پێیان وا بوو كە ژیـانی دواڕۆژ (قیامـەت) هەر بۆ ئەوانە بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا زۆر لـە مـردن دەترسـان!، خـوای گـەورە

---

[94] سنن الترمذي، كتاب صفة القيامة والرقائق والورع صفة أواني الحوض، باب السنة، رقم الحديث ٢٤٦٠

دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ الدَّارُ الاخِرَةُ عِندَ اللّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ النَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ الْمَوْتَ﴾ ٩٤- البقرة، واتە: ئەی بەنوئیسرائیل ئەگەر پێتانوایە ژیانی دوارِۆژ هەر هی ئێوەیە و بەهەشت هەر هی ئێوەیە و بۆ كەس نییە ئەی بۆ تەمەننای مردنێ ناكەن؟!، خۆ ژیانی دونیا ئەوەندە خۆش نییە، ئەگەر ئینسان یەقینی وا بێ دەچێتە بەهەشت ئەو دونیایە جێگای خۆشگوزەرانی نییە چونكە هەر لە منداڵییەوە ئینسان لە موعاناتدایە هەتا دەمرێ!، كاتێك كە منداڵە شعور بە ژیان ناكات، كاتێ گەنجە كێشەی ژنهێنانی هەیە دوایی كێشەی ماڵدانان و دامەزراندنی هەیە، پاشان كێشەی كورِ و كچ و ماڵ و سەروەت و سامان و خزم و كەس و عەشیرەت و قەومی هەیە!، پاشان پێش پیربوونی كێشەی زۆری بەسەردا دێ و موسیبەتی زۆری بۆ دێتە پێشێ چاوی زەعیف دەبێ و گوێچكەی زەعیف دەبێت و كاری بۆ نارِوات و دڵی زەعیف دەبێ!!، دونیا هەمووی مەینەتیی (مَشقَّة)ە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الانسَانَ فِي كَبَدٍ﴾ ٤- البلد، ئینسانمان دروستكردووە لە مەینەتییدا دەژی، بەڵێ خۆشەویستەكانم: خوای گەورە فەرمووی ئەی بەنوئیسرائیل بۆ داوای مردنێ ناكەن ئەگەر قیامەت هەر هی ئێوەیە!، ﴿فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ٩٤- البقرة، واتە: تەمەننای مردنێ بكەن ئەگەر راستگۆن و راست ئەكەن لە قسەكەتاندا، بەڵام خوا دەزانێ كە ئەوان شتیان بۆ دوای مردنێ ئامادە نەكردووە و خۆیان حازر نەكردووە بۆ مەحكەمەی ئیلاهی لە رۆژی قیامەت بۆیە خوای پەروەردگار هەر خۆی دەفەرموێ: ﴿وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ ٩٥- البقرة، بەهیچ شێوەیەك داوای مردنێ ناكەن لەبەرئەوەی كردەوەی خەراپیان بەرِێكردووە لە پێش خۆیاندا، ئینسانێك ئەگەر گوناهبارێ زۆر دەترسێ لەبەرئەوەی مەحكەمەكەی قورسە!، لەبەرئەوەی حیسابەكەی قورسە!، باوەرِی بە قورئان هەیە بەڵام كەمتەرخەمیی كردووە لە

جێبەجێكردنەكەی، باوەڕی بەوە هەیە: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ، وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾ ٧، ٨- الزلزلة، میسقالە زەڕڕەیەك لە خوای پەروەردگار ون نابێ لە چاكە و خەراپە، باوەڕی بەوە هەیە بەڵام خۆی بۆ ئامادە نەكردووە و خۆی لە خراپە نەپاراستووە بۆیە لە مەحكەمەی ڕۆژی قیامەت دەترسێ، جا هەیە لە ئیمانەكەی دەترسێ هەیشە ئیمانی نیە و كەمتەرخەمی كردووە و بۆیە زیاتر دەترسێ!، نەك هەر تەمەنناى مردنێ ناكەن بەڵكو: ﴿وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ النَّاسِ عَلَى حَيَاةٍ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ﴾ ٩٦- البقرة، بەڵكو لە هەموو كەس زیاتر داكۆكی لەسەر ژیانی دونیا دەكەن وە ئەوانەش كە موشریكن، تەماشا بكەن ئێستاش جولەكە حەریسترین كەسن لەسەر ژیان، لە پێناوی دروستكردنی دەوڵەتێكی جولەكە چیانكردووە!، پیاوە ریش سپی و بە تەمەنەكانمان چاكیان وەبیردێ كە كاتی خۆی جولەكە لە كوردستانی ئێمەشدا هەبوون وەختێ كە لەساڵی ١٩١٧ز بە وەعدی بەلفۆر كە ئەوكاتە وەزیری خاریجی بەریتانیا بوو وەعدیدا بە جولەكە كە دەوڵەتێكیان بۆ دروست بكات لە ساڵی ١٩٤٧ز یشدا بڕیاری ئەو دەوڵەتە درا لەو ساڵەوە هەتا ئێستا تەماشا ئەكەین جولەكە لە هەموو وڵاتانی جیهان كۆ دەبنەوە لە یەك دەوڵەت كە دەوڵەتی خۆیشیان نییە! چونكە فەڵەستین شوێنی ئیبراهیمە، شوێنی زەكەریيا و یەحیا و حەزرەتی موسا و موحەممەدە (علیه الصلاة والسلام) شوێنی مەریەمە..، ئەوان كە هاتوون بۆ ئەوێ ویستوویانە لە ناوەڕاستی ئەرزی مسوڵمانان شوێنێك داگیر بكەن!، تەماشا بكەن لە هەموو دونیا جولەكە بۆ ئەو شوێنە دێ چونكە سورن لەسەر دروستكردنی ژیان و دەستەڵاتی دونیا بە پێچەوانەی وڵاتانی تر!، خەڵكی خۆمان لە وڵاتی خۆی را دەكا بەرەو هەندەران دەڕوات بەڵام جولەكە لە چوارچێوەی دونیا كۆدەبێتەوە دەوڵەتەكەی خۆی دادەمەزرێنێ!، ﴿يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَن

﴿يُعَمَّرَ﴾ ٩٦- البقرة، واتە: هەر یەکێکیان پێی خۆشە تەمەنی هەزار ساڵ بێ!!، بەڵام خوا دەفەرموێ با هەزار ساڵیش تەمەنی بێ لە ئاگری دۆزەخ هەر نەجاتی نابێ!، ئەو هەزار ساڵەش هەر دەڕوات، ئەگەر ئینسان تەمەنی هەزار ساڵیش بێت ئەو هەزار ساڵە هەر تەواو دەبێ ئەگەر هەموویشی لە خۆشیدا رایبواردبێ چونکە حەدیسی صەحیحی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) کەسێك کە لە هەموو زەمەنەکاندا لە هەموو کەسێك زیاتر لەوپەڕی خۆشیدا رایبواردووە لە دونیا رۆژی قیامەت دەیهێنن کە کافرە یەکجار لە جەهەننەمێی هەڵدەکێشن لێی دەپرسن: خۆشیت بینیوە؟، دەڵێ: نەخێر هیچ خۆشیم نەبینیوە!!!، کەسێکیش کە لەوپەڕی ناخۆشیدا ژیاوە لە دونیا بەڵام مسوڵمانبووە یەکجار بە بەهەشتێی دەسوڕێنن لێی دەپرسن: ناخۆشیت بینیوە؟ دەڵێ: نەخێر یارەبی هەرگیز ناخۆشیم نەبینیوە!!، هیچی وەبیر نایێ!، هەزار ساڵ دەژی بەڵام وەکو خەوێکیش نایەتەوە یادی لە رۆژی قیامەت.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: بۆیە ئیمامی عوسمان (رەزای خوای لەسەر بێ) کە دەچویە زیارەتی قەبر زۆر دەگریا!، غولامێکی هەبوو لێی پرسی: ئەی ئەمیری بڕواداران خۆ تۆ ئەو ئایەتانەی لەماڵەوە دەیانخوێنیەوە هەمووی ئایاتی عەزاب و دۆزەخ و ترسی رۆژی قیامەتە بۆ لەوێ گریانت ئەوەندە نایێ وەك دێیە سەر قەبر ئەوەندە دەگری؟! فەرمووی: چونکە گوێم لێ بوو لە پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: ئەگەر ئینسان لە عەزابی قەبر رزگاری ببێ ئەوا قۆناغی دوای قەبر ئاسانترە!، وە ئەگەر ئینسانیش لە عەزابی قەبر رزگاری نەبێ ئەوا دوای ئەو زۆر ناخۆشترە!! جا لەبەر ئەوە زۆر لە قەبر ئەترسم!، بەڕاستی قۆناغی مردن قۆناغێکی زۆر هەستیارە و حەقی خۆیەتی ئینسان لە قۆناغی دوای مردنێ بترسێ کە قۆناغی بەرزەخ (ناوگۆڕ)ە، بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بە سوننەتی داناوە سەردانی قەبرستان بکرێ بۆ

پیاوان، بۆ ئافرەتان بەشێوەیەكی شەرعیی دروستە بەڵام بەڕاستی ئەو زیارەتەی كە ئەمڕۆ ئافرەتان دەیكەن بۆسەر گۆڕستانەكان دروست نییە!، ئەگەر دەشپرسن بۆچی؟ دەڵێین:

یەكەم: لەبەرئەوەی كە پیاوان و ئافرەتان تێكەڵاو دەبن لە زیارەتی گۆڕستانەكان بەتایبەت لە شارەكاندا، دووەم: بە جلوبەرگی ناشەرعی و رووت و قوت دەچن سەردانی گۆرستانەكان دەكەن، سێیەم: ئافرەتی خراپیان تێدایە كە پێویستە بە بەدەنی پاكەوە بچی بۆ ئەو شوێنە پاكانە كە گۆڕستان شاری مردووەكانمانە، شارێكە كە ئێمەش بەیانی بۆی دەچین!، شارێكە هەر بۆ ئەوانە نییە كە بە رۆژ بەلایاندا تێئەپەڕین و وا ئەزانین هەرئەوانی تێدان و ئێمە بۆی نارۆین رۆژێك دێ تەرمەكەی ئێمەش دەبەن بۆ لای ئەو شارە!، ئەو شارەی كە بەداخەوە زۆر بە بێڕێزی تەماشای دەكرێ! هەموو حەیوانەكانی دەخرێتەسەر، بزن و مانگا و گوێدرێژ و سەگی لێناگەڕێتەوە، هەموومان ئوممەتی موحەممەد ﷺ گوناهبارین لەوەی ئەو گۆرستانانەمان بەڕەڵا كردووە، ئایا كەسێك حەز دەكات مامۆستاكەی بە زیندوویێتی مانگا یان سەگێك بەسەریدا پاز بدات؟، كەسێك حەز دەكات باوكی یان برای یان خێزانی یان دایكی یان كوڕ و كچە خۆشەویستەكەی؟...، كەس حەز ناكات، ئەی گۆڕستان شاری ئەوان نییە؟ ئایا مردوودكانمان ئێستا پێیان ناخۆش نییە كە ئاوا بە بێڕێزی تەماشا دەكرێن؟، مامۆستایانی بەڕێزی ئایینی باسیانكردووە و ئەفەرموون كە لە شەریعەتی ئیسلامدا كاتێك كە دەچی بۆ زیارەتی گۆڕستان چۆن بە زیندوویێتی و وەك چۆن لە حاڵی حەیاتدا شەرمت لێكردووە لەو كەسە دەبێ كاتێك كە دەچی بۆسەر گۆڕەكەی ئاوا بە شەرم و ریز و حورمەتەوە بۆی بچی!، نەك بچی لەسەر گۆڕەكەی پاڵبدەیەوە، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئەفەرموێ: ئەو كەسەی كە لەسەر قەبرێك دادەنیشێ لەسەر پەنگر و پۆلو (پشكۆ) دابنیشێ و بسووتێ

باشترە!، دانیشتن لەسەر قەبر پازدان بەسەر قەبردا ریز و حورمەت نەنواند بۆ گۆڕستان بەڕاستی تاوانێكە ئەگەر لە دێیەك بن هەموو دێیەكە گوناهبارە، ئەگەر شارێك بێ هەموو شارەكە گوناهبارە، بۆیە جارێكی تریش لە وتاری هەینی وتوومە رەجا دەكەم كە غەم بخۆن لە پەرژینكردنی گۆڕستانەكانمان بۆ ئەوەی گوناهبار نەبین.

كاتێك چویە سەر گۆڕستان سەلام بكە، وەكو پێغەمبەر بە عائیشەی فەرموو: ئەگەر چویە سەر گۆڕستان ئاوا سەلام بكە «السَّلامُ عَلَيكُم دارَ قَومٍ المُؤمِنين، أَنتُمُ السَّابِقُونَ، وَنَحنُ اللاحقُونَ، ونَحن إن شاءَ اللهُ بِكُم لاحقُون، نَسأل اللهَ لَنا ولَكُم العَافِية»[٩٦] سەلامتان لێبێ ئەی خانووی قەومی ئیمانداران، ئێوە پێش ئێمە رۆیشتوون، ئێمەش وا بەدوای ئێوە دێین و إن شاء الله بەئێوە دەگەینەوە، داوای سەلامەتی دەكەین بۆ ئێوە و بۆ خۆشمان لە خوای پەروەردگار، ئەگەر چویە سەر گۆڕستان ئاوا بڵێ چونكە ئینسان كە دەچێتە سەر گۆڕستان سەردانی خۆشەویستی خۆی دەكات دەبێ بڵێ: «رَبَّنا اغفر لَنا وَلاخوانِنا الَّذينَ سَبَقُونا بِالايمان ولا تَجعَل في قُلُوبِنا غِلا للّذينَ آمَنُوا» خوایە لە ئێمە خۆشبێ و لەوانەش كە لە پێش ئێمەدا رۆیشتوون، وە رق و قینەشمان لە دڵدا مەهێڵە كە لە بەرامبەر ئیمانداران لە دونیا هەمانبێ!، چونكە هەرچی ئیماندارە لە دونیا دەبێ برای یەك بێ!، وە دەبێ بەناخۆشی یەكدی نارەحەت بێ، مسوڵمانێك لە رۆژهەڵات لێی دەدرێ یەكێكیان لە رۆژئاوا دەچەوسێندرێتەوە یەكیان لەوێ ماڵی دەسووتێ و دەربەدەر دەبێ..، ئەگەر ئێمەی مسوڵمان لە دڵماندا پێمان ناخۆش نەبێ دیارە مسوڵمانەتیەكەمان

[٩٦] صحيح مسلم، كتاب الطهارة، باب: استحباب إطالة الغرة والتحجيل في الوضوء، رقم الحديث ٢٤٩

ناته‌واوه‌ و ئیمانه‌كه‌مان به‌هێز نییه‌!!، چونكه‌ یه‌كێك له‌ مه‌رجه‌كانی ئیمانی به‌هێز و ته‌واو ئه‌وه‌یه‌ ئیمانداران به‌ برای خۆی بزانێ، خێری ئیمانداران به‌ خێری خۆی و ناڕه‌حه‌تی ئیمانداران به‌ ناڕه‌حه‌تی خۆی بزانێ (لا يؤمن أَحَدُكم حَتَّى يُحِبَّ لاخيهِ ما يُحِبُّ لِنَفسِهِ)[٩٧]، بۆیه‌ ئینسان ئه‌گه‌ر كه‌سێكی خۆشه‌ویستی خۆی لێ ده‌ڕوا و ده‌مرێ ناڕه‌حه‌ت ده‌بێ چونكه‌ مردن موسیبه‌تێكه‌ و واقیعێكه‌ دێته‌پێش!، ته‌ماشا بكه‌ن عومه‌ری كوڕی خه‌تتاب (خوا لێی رازی بێ) وه‌ختێ كه‌ پێغه‌مبه‌ر وه‌فات ده‌كات چه‌نده‌ ناڕه‌حه‌ت ده‌بێ!، صه‌حابه‌كانی مه‌دینه‌ زۆربه‌یان له‌ مزگه‌وتدا په‌لوپۆیان كه‌وتبوو! عه‌لی كوڕی ئه‌بی تالیب قاچه‌كانی ئیفلیج بوبوون خۆی پێ هه‌ڵنه‌ئه‌ستایه‌وه‌ و به‌ ئه‌رزه‌وه‌ نوسابوون!، عومه‌ری كوڕی خه‌تتاب ده‌یفه‌رموو: هه‌ر كه‌سێك بڵێ پێغه‌مبه‌ر وه‌فاتیكردووه‌ به‌م شمشێره‌ سه‌ری په‌لده‌ده‌م! هه‌تا ئه‌و كاته‌ی ئه‌بوبه‌كری صدیق (خوا لێی رازی بێ) وتاری داو مسوڵمانانی وشیاركردنه‌وه‌ فه‌رمووی: (من كانَ يعبد محمَّداً فَإنَّ محَمَّداً قَد ماتَ ومن كانَ يَعْبُد اللّهَ فَإن اللّهَ حيٌّ لا يموت)، ئه‌ی صه‌حابه‌كان ئه‌ی ئوممه‌تی موحه‌ممه‌د (عليه الصلاة والسلام)، هه‌ر كه‌سێ پێغه‌مبه‌ری ده‌په‌رست ئه‌وا پێغه‌مبه‌ر مرد، وه‌ هه‌ر كه‌سێكیش خودای ده‌په‌رست خودا هه‌رماوه‌!، ئێوه‌ش و موحه‌ممه‌دیش (عليه الصلاة والسلام) خواتان ده‌په‌رست ئه‌و خودایه‌ هه‌رماوه‌، ئینجا هه‌ندێ ئامۆژگاری عومه‌ری كوڕی خه‌تتابیشی كرد

---

[٩٧] ((حدثنا محمد بن المثنى وابن بشار قالا حدثنا محمد بن جعفر حدثنا شعبة قال سمعت قتادة يحدث عن أنس بن مالك عن النبي صلى الله عليه وسلم قال لا يؤمن أحدكم حتى يحب لاخيه أو قال لجاره ما يحب لنفسه))، صحيح مسلم، كتاب الايمان، باب: الدليل أن من خصال الايمان أن يحب لاخيه المسلم، رقم الحديث ٤٥.

(خوا لێی رازی بێ) زیاتر هۆشی هاتەوەسەر خۆی وە ئینجا عومەری کوڕی خەتتاب لەو شوێنەدا فەرمووی:

تَـقَوَّسَ ظَـهْرِي مِـن فِراقِ مُحَـمَّدٍ
فَـصَارَ فَضاءُ الارضِ عِندي مُضَيَّقاً
لَـوكـانَتِ الدُّنيـا تَدُـومُ لِسـاكِنٍ
لَـكــانَ رَسُــولُ اللهِ فِيها مُخَلَّداً
ولَـــو دامَـتِ الـدُّنيا ودامَ نَعيمُها
لَما ماتَ فِيها سَيِّدُ الرُّسُلِ أحمَداً

واتە: پشتم کوڕبۆتەوە لەبەرئەوەی فیراقی موحەممەدم هاتۆتە پێش و لێم جیابۆتەوە ﷺ، ئەو ئەرز و فەزایە پان و بەرینە و ئەو دەشتەم لێ تەسك بۆتەوە!، ئەگەر ئەو دونیایە بۆ کەس بمابایە تێیدا نیشتەجێ ببێ دەبوایە موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) تیایدا نەمرێ!، ئەگەر خۆشی دونیا و گوزەرانی دونیا بەردەوام بوایە دەبوو پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) نەمردبا!، خۆ پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) زۆر خۆشەویست بووە لای خوا خۆشەویسترین کەسی سەر رووی زەوی بووە لەلای خوا!، لە هەمانکاتدا لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا وەفاتی کردووە کە تەمەنێکی کەمە و تەمەنی ئوممەتەکەیەتی وەکو فەرمووی: تەمەنی ئوممەتەکەم بەزۆری لە نێوان شەست و حەفتادایە بۆیە خۆیشی لە نێوەندی ئەم تەمەنەدا وەفاتی کردووە، جا ئا لەو کاتەدا عومەری کوڕی خەتتاب نەصیحەتی خۆی دەکات، دەفەرموێ:

(تَجَرَّد مِنَ الدُّنيا فَإِنَّك إِنَّما خَرَجتَ مِـنَ الـدُّنيا وأَنـتَ مجَـرَّدا)[٩٨] واتـە: ئـەی عومەر خۆت رووت بکە لـەو دونیایـە چـونکە رۆژێـك دێ تـۆ بـەڕووتی لـەو دونیایە دەچیتەدەر!.

**خاڵی دووەم: مردن کاتێکی دیاریکراوی بۆ دانراوە**، ئێمە دەبێ چـاك بـزانین کە مردن وەختێکی دیاریکراوی هەیە نەپاش دەکات و نەپێشیش دەکات!، خوا تەحدیدی کردووە هەروەکو فەرموویَ: ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلا بِإِذْنِ اللهِ كِتَابًا مُؤَجَّلا﴾ ١٤٥ – آل عمران، واتە: هیچ نەفسێك بۆی نییە بمرێ بە ئیزنـی خودا نەبێ!، نوسراوێکە و کاتێکی دیاریکراوی بۆ دانراوە، ئینسان زۆرجار حەز دەکات بمرێ بەڵام مردن بەدەستی خوایە، زۆر نەخۆش حەز دەکـەن بمـرن بـەڵام ئەجەلیان نەهاتووە!، زۆر کەس لە شەڕدا چەندین گوللـەی بەردەکـەوێ نـاشمرێ لەبەرئەوەی ئەجەلی نەهاتووە!، زۆر ئینسانی نـەخۆش هەیـە دەچـێ سـەفەری حەج دەکات دەڵێ: ان شـاء اللە لـەوێ دوای تەوبـەکردن دەمـرم بـەڵام نـەخێر ئەجەل بەدەستی خوایە، هی وا هەیە لەوێ دەمرێ یاخود لە ڕێگا دەمـرێ هـی واش هەیە دەگەڕێتەوە ماڵەوە ئینجا دەمرێ!، هی وا هەیـە بـە پـیری دەمـرێ هی وا هەیە بە گەنجی دەمرێ، هی وا هەیە خوا هۆکاری بـۆ دروسـت دەکـات سەیارەی وەردەگەرێ، لە ئاودا دەخنکێ، کارەبـا دەیگـرێ..، هـی واش هەیـە هیچ هۆکاری دیار نین، دەبینی کەسێك دوێنێ ساغ بـوو کەچـی ئـەمڕۆ دەڵـێن فلانە کەس مردووە!، ئەرێ نەخۆش بوو؟ نەخێر ساغ و سەلامەت بوو!، دوێنـێ کرێکار و جوتیار بوو، لە ئیش و کەسابەتدا بوو کەچی ئەمڕۆ دەڵێن مـردووە!، دوێنێ ناوی لە قائیمەی زیندووان بوو بەڵام ئەمڕۆ ناوی لە قائیمەی مردووانە!، دوێنێ لەسەر ئەرز بوو بەڵام ئـەمڕۆ لـەژێر ئـەرزە!، جـاری وا هەیـە ئینـسان

---

[٩٨] تأريخ دمشق، باب: عمر عبدالعزيز، جزء ٤٥، صفحة ٢١٠

هۆکاری رووکەشی بۆ دروست نابێ خوای گەورە ئەگەر ئەجەلی هێنا ئیتر کاتی تەواوبوو، ئەو لوقمە نانەی کە ئەجەلی پێ هاتبوو تـەواو، ئـەو هەوایـە و ئـەو ئاوە و...، بەشەکەی وی لە دونیا تـەواوبوو!، بۆیـە خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَلَن يُؤَخِّرَ اللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَاء أَجَلُهَا﴾ ١١- المنافقون، (لن) لە زمانی عـەرەبی واتا (هەرگیز نابێ)، هەرگیز خوای پەروەردگار ئەجەلی هیچ کەسـێ دواناخـات کاتێك کە ئەجەلی هات!، ﴿قُل لا أَمْلِكُ لِنَفْسِي ضَرًّا وَلا نَفْعًا إِلا مَـا شَـاء اللّـهُ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَـلٌ إِذَا جَـاء أَجَلُهُـمْ فَـلا يَـسْتَأْخِرُونَ سَـاعَةً وَلا يَـسْتَقْدِمُونَ﴾ ٤٩- یونس، هەموو ئوممەتێك ئەجـەلێکی هەیـە، وە هـەموو کەسـێك ئەجـەلێك و کـاتێکی تایبـەتی بـۆ مردنـی دیـاریکراوە نـە سـەعاتێك دوا دەکـەوێ و نەسەعاتێکیش پێش دەکەوێ ئەجەلی!، (سـاعة) یـانی ماوەیـەك، نەماوەیـەك پێش دەکەوێ و نە ماوەیەکیش دوا دەکـەوێ!، نـە دەقیقەیـەك خـوا مۆڵـەتی دەدات دوای ئەجەلی نە دەقیقەیەکیش دێتە پێشیش، بۆیە کاتـێ بـە ئیمـامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەفەرموون: خوا عومرت درێژ بکات، زۆر پێی ناخۆش دەبێ و توڕە دەبێ!، ئەفەرموێ: (ذالك شَيء مَفروغ مِنـه) ئـەوە شـتێکە خـوا بڕیویەتییەوە عومر درێژ نابێت!، ئەو دوعایە قەبووڵ نابێ تۆ بە یەکێك بڵێـی: خوا عومرت درێژ بکات!، دەکرێ بڵێی: خوا عومرت پڕ لە بەرەکـەت بکـات، خوا عومرت پان و بەرین و فراوان بکات، بەڵام عومر درێژ نابێ، عـومری پـڕ لە بەرەکەت ئەوەیە ئینسان لە عومری کەمیدا خزمەتی زۆر بکات و زۆری بـە عومریەوە دیاربێ، زانای پایەبـەرزی واهـەبووە لەتەمـەنی (٣٠) سـی سـاڵیی چەندین تـەئلیفاتی کـردووە و چـەندین کتـێبی نوسـیوە!، خزمـەتی زۆری بـە میللەتەکەی کردووە، هەر لە تەمەنی سی ساڵیدا وەفاتیشی کردووە!، هی واش هەیە تەمەنی (٥٠) پەنجا ساڵە و هیچی بە عومریەوە دیـار نییـە!، بەرەکـەت

ئەوەیە ئینسان زۆر ئیش بكات و ئیشی زۆری دیار بێ لــە تەمەنیــدا ئەگــەرنا تەمەن درێژ نابێت!.

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَـدْرِي نَفْـسٌ مَّـاذَا تَكْـسِبُ غَـدًا﴾ ٣٤- لقمـان، واتە: هیچ كەسێ نازانێ بەیانی چ كارێك دەكـات، زۆر ئینـسان هەیـە ئــەمڕۆ بڕیــار ئــەدات بــەیانی ئــەو كــارە ئــەكات كەچــی دوایــی شــەو لێــی هەڵدەوەشێــتەوە، یاخود بەیانی وەزعێكی دێتە پــێش و لێــی هەڵدەوەشــێتەوە لەبەرئەوەی خوا دەزانێ بەیانی ئێمە لە چ وەزعێكدا دەبین، ﴿وَمَا تَـدْرِي نَفْـسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ ٣٤- لقمـان، واتە: هیچ نەفسێك نازانــێ لە كوێ دەمرێ!، بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فــەرمووی: (إذا قَـضَى اللهُ لِعَبدٍ أن يَموتَ بِأرضٍ جَعَـلَ لَـه إلَيهـا حاجَـةً)[99]، واتــە: ئەگــەر خــودا ویــستی عەبدێكی خۆی لە شوێنێك بمرێ وا دەكا ئیشێكی ئەو عەبــدەی بكەوێتــە ئــەو شوێنە و دەبێ بچێ و لەوێ بمرێ!، زۆرجار كە یەكێك سەیارەی لێ وەردەگــەرێ و خزمێكی دەمرێ یان ماڵی دەسوتێ، لە فلان شوێنە بەردەبێتــەوە و دەكــەوێ و دەمرێ، یان دیواری بەسەردا دەڕوخێ یان لە ئاودا دەخنكێ..، دەڵــێ ئەگــەر وای نەكردبا وا نەدەبوو!، ئەوە تەنها دەرگا كردنــەوەی شــەیتانە بــۆ بابەتەكــە چونكە پێغەمبەر فەرمووی: (فلا تَقُل لَو أني فعلت كـانَ كَـذا وكَـذا ولكِـن قُـل قَدر اللهِ وَما شاءَ فَعَل فإن لَوتَفتَحُ عَمَلَ الشَّيطانِ)[100] واتــە: مــەڵێ ئەگــەر وام

---

[99] ((حدثنا أحمد بن منيع وعلي بن حجر المعنى واحد قالا حدثنا إسماعيل بن إبراهيم عن أيوب عن أبي المليح بن أسامة عن أبي عزة قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم إذا قضى الله لعبد أن يموت بأرض جعل له إليها حاجة أو قال بها حاجة))، سنن الترمذي، كتاب القدر، باب: أن النفس يموت حيثما كتب لها، رقم الحديث ٢١٤٧.

[100] ((حدثنا أبو بكر بن أبي شيبة وابن نمير قالا حدثنا عبد الله بن إدريس عن ربيعة بن عثمان عن محمد بن يحيى بن حبان عن الاعرج عن أبي هريرة قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم المؤمن القوي خير وأحب إلي الله من المؤمن الضعيف وفي كل خير احرص على ما ينفعك واستعن

کردبا وا دەبوو، چونکە (ئەگەر) کردەوەی شەیتان دەکاتەوە!، ئەوە قسەی ئیمان لاواز و موونافیقەکانە کە کاتی خۆی ئەوانەی دەچونە جەنگ دەیانگوت: ﴿لَّوْ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ﴾ ١٥٦- آل عمران، واتە: ئەگەر لەگەڵ ئێمە بان و نەچووبانە جەنگ لەگەڵ موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) نەدەمردن و نەدەکوژران، بەڵام خوا دەفەرموێ: ﴿قُل لَّوْ كُنتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ الَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقَتْلُ إِلَى مَضَاجِعِهِمْ﴾ ١٥٤- آل عمران، ئەگەر لە ماڵی خۆشتان بوونایە مردنتان لە مەیدانی جیهاد و لە مەیدانی شەڕ هاتبا حەتمەن دەبوایە بێنە ئەوێ بەڵام دیارە ئەجەلتان لەوێ نەهاتبوو بۆیە نەهاتنە ئەوێ!!، ئینسان ناتوانێ پێچەوانەی ئەجەلی بجولێتەوە.

**خۆشەویستەکانم، خاڵی سێیەم و کۆتایی:** ئایا خۆشاردنەوە و راکردن لە مردن ئەجەل دوا دەخات؟، بێگومان نەخێر! چونکە ئەو ئایەتانەی کە پێشتر خوێندمانەوە گوتمان ئەجەل وەختێکی تایبەتی بۆ دانراوە نەپێش دەکەوێ نە دواش دەکەوێ، نمونەمان زۆرن لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە بۆمان دەگێڕێتەوە کە زۆر کەس ویستوویەتی خۆی لە مردن بشارێتەوە و لە مردن را بکات بەڵام کەڵکی نەبووە!، کاتی خۆی صەحابەکان داوایانکرد جیهاد فەرز بکرێ خوا فەرزیکرد بەڵام کە فەرزکرا گوتیان: خوایە بۆچی کەمێك لەسەرمان رانەدەوەستای دوایی فەرزت کردبا؟! ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ النَّاس كَخَشْيَةِ اللّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً وَقَالُواْ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا الْقِتَالَ لَوْلا أَخَّرْتَنَا إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ﴾ ٧٧- النساء، واتە: وەختێ کە جەنگیان لەسەر فەرزکرا گوتیان: پەروەردگارا بۆچی جەنگت لەسەر فەرزکردین؟ خۆزگە برێکی

= باللە ولا تعجز وإن أصابك شيء فلا تقل لو أني فعلت كان كذا وكذا ولكن قل قدر اللە وما شاء فعل فإن لوتفتح عمل الشيطان»، صحيح مسلم، كتاب القدر، باب: في الامر بالقوة وترك العجز، رقم الحديث ٢٦٦٤.

دیكەت دوادەخستین!، دیارە هەموویان ئەو خۆزگەیان نەبوو بەڵكو خەڵكێكیان وایانگوتووە، خوا فەرمووی: ﴿قُلْ مَتَاعُ الدَّنْيَا قَلِيلٌ وَالآخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ اتَّقَى﴾ ٧٧- النساء، ئەی موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) پێیان بڵێ: ئەگەر ئەوان لە ترسی مردنیانە و لە ترسی ئەوەیە كە ژیانی دونیایان لە دەستدەچێ ژیانی دونیا خۆشگوزەرانییەكی كەمە، قیامەت باشترە بۆ ئەو كەسانەی كە لە خوا ئەترسن!، ئەوانەی كە مسوڵمانی راستەقینەن و لە دونیا بەرەو لیقای خوا سەفەری خۆیان دەكەن نەك بەرەو شوێنێكی ناخۆش!، دەچنە لای خۆشەویستی خۆیان كە (رب ا لعالمين)ە، دەچنە لای خۆشەویستی خۆیان كە موحەممەدە ﷺ، خوای گەورە دەزانێ ئەو دوڕووانە چیان لە دڵدایە و لە مرن دەترسن بۆیە فەرمووی: ﴿أَيْنَمَا تَكُونُواْ يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ﴾ ٧٨- النساء، واتە: لە هەر كوێیەك بن مردن دەتانگاتێ با لە كۆشك و تەلاری پتەویش دابن!، ((بورج)) یانی قەلا، یانی شوێن و بالاخانە و بینایەی بەرز، ئینسان لە هەر كوێ بێت ئەگەر مردنی لەسەر نوسرابێ لە كات و شوێنێكدا بەچ شێوەیەك كە خوا بۆی داناوە حەتمەن دەبێ بچێتە ئەو شوێنە و بەوشێوەش كە خوای پەروەردگار دیاریكردووە بمرێ.

لە جەنگی ئەحزاب هەندێ لە دڵ نەخۆشەكان گوتیان: ﴿إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ﴾ ١٣- الاحزاب، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر ئیجازەمان بدەی بچینەوە ماڵێ بەڕاستی ماڵمان هەمووی لەو گۆڕەیە و بەرەڵایە و كەسی لەلا نییە و خێزانمان بە تەنهایە و دەترسین و...، خوا فەرمووی: ﴿وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ إِن يُرِيدُونَ إِلا فِرَارًا﴾ واتە: درۆ دەكەن ئەوانە ماڵیان لەو گۆڕە نییە، ئەوانە تەنها دەیانەوێ فیرار بكەن لە جەنگ لە ترسی مردن!، خوا فەرمووی: ﴿قُل لَّن يَنفَعَكُمُ الْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ الْمَوْتِ أَوِ الْقَتْلِ﴾ ١٦- الاحزاب، واتە: ئەی موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) پێیان بڵێ: ئەو فیراركردنەتان هیچ سوودی نییە

ئەگەر ئێوە لە ترسی مردن یان لە ترسی کوشتن را بکەن!، ﴿وَإِذًا لا تُمَتَّعُونَ إِلا قَلِيلا﴾ ١٦- الاحزاب، جا کەوابوو ئەگەر ئینسان فیرار بکات و خۆ بشارێتەوە لە مردنی ناتوانێ، خوا ئەفەرموێ: (لَّن يَنفَعَكُم) واتە: هەرگیز ئەو خۆشاردنەوەیە سوودتان پێناگەیەنێ، جا هی وا هەیە سەفەر دەکات لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر یان لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر لە ترسی مردن، هی وا هەیە ئەمڕۆ لەو گوندە دانانیشێ دەچێتە ئەو گوندە لە ترسی مردن و لە ترسی کێشە، هی وا هەیە ناچێتە جەنگ لە ترسی مردن کەچی نازانێ مردنی لە شوێنێك بۆ نوسراوە کە ئەو بۆخۆی هەست ناکات!، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار بڕیویەتییەوە.

عالمێك دەفەرموێ: (إنَّ الجُبْنَ لا يؤَخِّرُ الاجَلْ كَما أنَّ الشَجَاعَة لا يعَجِّلُ الاجَل) واتە: ترسنۆکی ئەجەل دواناخات هەروەکو چۆن جورئەت و ئازایەتی و لێهاتوویی ئەجەلی ناهێنێتە پێش!!، یانی نە بە ترسنۆکی ئەجەل دوا دەکەوێ وە نە بە غیرەت و ئازایەتی و شەهامەتیش ئەجەل پێشدەکەوێ، ئەوانەی کە لە جەنگدان و ئەوانەی کە لە ماڵەوەن ئەگەر بڵێ لەوێ زیاتر مردن نزیکە ئەجەلیان لە کوێ هاتبێ هەر لەوێ دەمرێ، بۆیە خوای پەروەردگار فەرمووی: ﴿قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلاقِيكُمْ﴾ ٨- الجمعة، واتە: ئەو مردنەی کە ئێوە لەبەری را دەکەن حەتمەن دێتە پێشتان و یەختان دەگرێ!.

لە کۆتاییدا ئەو ئایەتەی خوای پەروەردگار عەرز دەکەین کە خوای پەروەردگار لە سورەتی (الزُّمَر) دەفەرموێ: أعوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطان الرَجيم ﴿وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لا تُنصَرُونَ﴾ ٥٤- الزمر، واتە: ئەی ئیماندارینە ئێوە بگەڕێنەوە لای خوا، وە تەسلیمی ئەمری خوا بن، مسوڵمان بن و خۆتان یەکلابکەنەوە تەنها بۆ خوا (جل جلا لە)، پێش

ئه‌وه‌ی له‌ناكاو عه‌زابێكتان بۆ بێت پاشان كه‌س ناتوانێ سه‌رتانخات!، ئه‌گه‌ر عه‌زاب هات ته‌ڕ و وشك به‌یه‌كه‌وه ده‌گرێته‌وه! با له‌و عه‌زابه بترسین كه خوای گه‌وره وه‌كو ده‌رده‌سه‌ریی‌ه‌ك لێمانده‌گرێ چ به‌هۆی گوناهی خۆمان كه ته‌وبه‌مان لێی نه‌كردووه، وه چ به هۆی گوناهی خه‌ڵكێك كه له ناوی دانیشتووین و نه‌هی له خه‌راپه (مُنكر) ناكه‌ین!، چونكه كاتێك ته‌ڕ و وشك به‌یه‌كه‌وه ده‌سووتێ كه گوناه و تاوان ببینرێ و نه‌هی لێ نه‌كرێ، وه‌كو له پێشدا وتراوه: (إِنَّ اللهَ لا يُعَذِّبُ العَامَّةَ بِذَنبِ الخاصَّة وَلكِن إذا عمل المُنكر جهاراً كلهم)[١٠١] واته: خوای گه‌وره خه‌ڵكی به‌گشتی به گوناهی چه‌ند كه‌سێكی ناسوتێنێ و عه‌زاب نادات هه‌تا وای لێ دێ هه‌موویان گوناهو خراپه‌ی به ئاشكرا ده‌كه‌ن و چاوپۆشی لێ ده‌كرێ! وه‌ختێ كه گوناه زۆر بینرا له‌ناو خه‌ڵك و چاوپۆشی لێكرا ئه‌و كاته با هه‌موو خه‌ڵك بترسێ تووشی عه‌زابی خوای گه‌وره ببێ!!، چونكه خوا فه‌رمووی: ﴿وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ ٢٥ – الانفال، واته: له فیتنه‌یه‌ك خۆتان بپارێزن كه ته‌نها تووشی زاڵمه‌كانتان نابێ، ئه‌گه‌ر بێ ئێوه‌ش ده‌گرێته‌وه!.

جا با له مردن بترسین كه موسیبه‌تێكه و دێت، كاتێكی دیاریكراوی بۆ دانراوه ئێمه نایزانین، با هه‌موومان بتوانین له‌سه‌ر رێگای خودا (جل جلاله) به‌رده‌وام بین و ئیستیقامه‌مان ببێ صه‌برمان له‌سه‌ر به‌لاّ و موسیبه‌ته‌كان و ناخۆشییه‌كان ژیانی دونیا ببێ بۆ ئه‌وه‌ی كاتێ كه مردن هات به موسوڵمانی بمرین، ئینسانیش نازانێ له كوێ ده‌مرێ و چۆن ده‌مرێ و به‌چی ده‌مرێ!!.

---

[١٠١] ((وحدثني مالك عن إسماعيل بن أبي حكيم انه سمع عمر بن عبد العزيز يقول كان يقال ان الله تبارك وتعالى لا يعذب العامة بذنب الخاصة ولكن إذا عمل المنكر جهارا كلهم))، الموطأ، كتاب الكلام، باب: ما جاء في عذاب العامة بعذاب الخاصة، رقم ١٧٩٩

لە خوای پەروەردگار دەپاڕێینەوە و دەڵێین: یاڕەببی خوایە لە كاتێكدا مردنمان بۆ بێنی كە مسوڵمانین، خوایە بە مسوڵمانی بمانژیێنی، بە مسوڵمانی بمانمرێنی یارب العالمین، یاڕەببی خوایە عاقیبەتی عومرمان خێر بكەی، یاڕەببی خوایە خاتیمەی كردەوەكانمان خێر بكەی، یاڕەببی خوایە لە سەرەمەرگدا بە مسوڵمانی بمانمرێنی، یاڕەببی خوایە لە سەرەمەرگدا هاوكارییمان بكەی بۆ ئەوەی بتوانین بە مسوڵمانی بمرین، خوایە لە سەرەمەرگدا بمانپارێزی لە زەللەی شەیتان و شەیتان فێڵمان لێ نەكات یارب العالمین، یاڕەببی خودایە راگیربوون (تَثبِیت) بە قسەكانمان ببەخشی لە سەرەمەرگدا وە لەناو قەبردا بۆ ئەوەی بتوانین وەڵامی مەلائیكەتەكان بدەینەوە، یاڕەببی خوایە لە خۆمان و ماڵ و منداڵمان خۆشبیت، یاڕەببی خوایە لە مردووەكانمان خۆشبیت، خوایە شیفای نەخۆشییەكانمان بۆ بهێنی، یاڕەببی خوایە هاوكاریمان بكەی و دڵ و دەروونمان ساغ بكەیەوە بۆ ئەوەی بتوانین بە دڵێكی پڕ لە ئیمان و ئیخلاصەوە پێشوازی مانگی رەمەزانی پیرۆز بكەین، یاڕەببی خوایە لێت دەپاڕێینەوە كە مانگی رەمەزانی ئەمساڵمان بۆ بكەی بە ئاشتی و خۆشگوزەرانی بۆ هەموو مسوڵمانانی دونیا، یاڕەببی خوایە دەردەسەری و زوڵم و تەحەددای زاڵمان و ستەمكاران و بێباوەڕان لە هەركوێیەك هەیە لە دونیا لە مانگی رەمەزاندا لەسەر مسوڵمانان هەڵگری، خوایە مانگی رەمەزانمان بۆ بكەی بە دەرگای خێر و بەرەكەت بۆ هەموو مسوڵمانانی دونیا.

ئامین

أَقولُ قَولِي هَذا وَأَستَغفِرُاللهَ لِي وَ لَكُم وَلِسائِرِالمُسلِمين فَاسْتَغفِروهُ إِنَّهُ كانَ غَفَّاراً، أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم

(رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) آمين

# ژیانی نێو گۆڕ

قال رسول الله ﷺ:

(القَبرُ إمَّا روضَةٌ مِن رياضِ الجَنَّة أو حُفرَةٌ مِن حُفَرِ النِّيران)

رواه الترمذي

# بسم الله الرحمن الرحيم

إنَ الحَمدَ للهِ نَحمـدُهُ وَنَـستَعينُهُ وَنَـستَغفِره، وَنَعـوذُ بِـاللهِ مِـن شُـرُورِ أنفُـسِنا و سيئاتِ أعمالِنا، من يَهدِهِ اللهُ فَلا مضِلَ لَه، وَمن يضلِل فَلا هَـادي لَـه، نَـشهَدُ أن لا الـهَ ألا اللهُ وحـدَهُ لاشَـرِيكَ لَـه، وَنَـشهَدُ أنَّ سـيدَنا وَنَبيَّنـا مُحَمَّـداً عَبـدُهُ ورسولُه، اللهُمَ صَلي وَسَلِم وَزِد وَبارِك عَلَى سيِدنا محَمَدٍ وَعَلـى ألـه وَأصحَابِه، صَلاةً وسَلاماً الى يومِ الدِّين، أما بَعد ياعِبادَ اللهِ، أُوصيكُم بِتَقُوى اللهِ وَطاعَتِه وَلُزومِ أوامِرِهِ وَكَثرَةِ مخافته، فَأنَّ التَّقُوى شعار المُؤمِنينَ، ودِثارُ المُـتَّقِين، وَ وَصِـيةُ اللهِ في وَفيكُم وَفي النَّاسِ أجمعين.

أعوذُبالله منَ الشَيطانِ الرَجِيم: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّـهَ حَقَّ تُقَاتِـهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ ١٠٢ – آل عمران.

بەڕێزان و خۆشەویستان: ئەمڕۆش خوای گەورە مۆڵەتی داین ڕۆژێکی تـر بـە چاوی خۆمان لە ژیانی دونیا ببینین و هەستی پێ بکەین، شوکر و سـوپاس بـۆ خوای پەروەردگار کە لە خزمەتی مـانگی ڕەمـەزانی پـیرۆزدا بـەڕۆژوین و لـە ماڵی خوا ئامادەین، لە وتاری ئەمڕۆماندا باسی قۆناغەکانی ژیانی ئینـسان و سەرەتای دەستپێکردنی ژیانی ئینسان هەر لە ناو سکی دایکییەوە تـا دەگاتـە خزمەت خودا (جل جلاله) بەپێی توانا قسەی لەسەر دەکەین، ئەمڕۆ بە پشتیوانی خوای گەورە دەچینە سەر ژیانی ((بەرزەخ))، ژیانی گۆڕستان...

دوای ئەوەی ئینسانەکان لە دونیادا ئەو دونیایەی کە کۆمـەڵێک کارەسـات و بەسەرهاتی زۆرگەورەی تێـدا دەبینـێ، ئـەو ئینـسانەی ژیـان بەسـەردەبا لـەو

دونیایە بە چەند رۆژێك یان چەند مانگێك یا چەند ساڵێك و دوایی بەجێی دێڵێ و کۆچ دەکات!، بەڵام بەرەو کوێ؟!!، بەرەو شارێکی تر، بەرەو ژیانێکی تر، بەرەو ئاوەدانیەکی تر..

خۆشەویستان: لە ژیانی خۆماندا دەبینین زۆر شوێن کە بەلایدا تێدەپەڕین دەڵێین ((ئەوە گۆڕستانە))!!

((ئەوانە هەمووی قەبرن))!، لەناو ئەو گۆڕستانەدا دەیانبینین، زۆرمان پێناخۆش و زۆرمان پێ سەیر و عەجایبە کە لەناو ئەو گۆڕستانەدا بمێنین و ماوەیەك دابنیشین!.. بیر بکەینەوە لەلای ئەو مردووانە، لەلای ئەو شارە هەندێك ئیسراحەت بکەین، یان بیرێك لە حاڵی خۆمان و ئەو مردوانە وە ئەو شارە کەپێی دەگوترێ ((گۆڕستان)) بکەینەوە!، رۆژانە و مانگانە دەیان کەس و سەدان کەس بە دەستی خۆمان بەرێ دەکەین بۆ ئەو شوێنە کە پێی دەڵێن ((گۆڕستان))!!، بەڵام بیر لەوە ناکەینەوە کە رۆژێك دێت خەڵکێکیش ئێمە بەرێ دەکات بۆ ئەو شوێنە!، ئەوە پێی دەگوترێ ((گۆڕستان))! شارێکە، ئاوەدانیەکە، عالەمێکە بێجگە لەو شار و ئاوەدانیەی ئێمە!، رۆژێك دێت ئێمەش ئەو گۆڕستانە دەبینین خۆشەویستان!.

پێغەمبەر ﷺ کە زیارەتی قەبرستانی دەکرد دەیفەرموو: (السَلامُ عَلَيكُم دارَ قَومِ المؤمِنين، أنتُمَ السَّابِقونَ وَنَحنُ اللاحِقُون، وَنَحنُ إن شاءَ اللهُ بِكُم لاحِقُون، نسألُ اللهَ لَنا وَلَكُم العافِية)، فەرمووی: سەلامی خواتان لێبێت ئەی ئاوەدانی ئیمانداران!، ئەی شاری ئیمانداران، ئێوە رۆیشتوون و ئێمەش بە دواتانەوەین، خوا حەز بکات رۆژێك دێت ئێمەش بتانگەینەوە ئێوە، وە داوای لێخۆشبوون و سەلامەتی بۆ ئێوەو خۆمان دەکەین لە خوای گەورە (جل جلاله).

رۆژێك دێت ئێمەش بەرێ دەکرێین بۆ ئەو گۆڕستانە کە ئێستا بە ترسەوە تەماشای دەکەین!، شەو زۆر کەس ناتوانێ لەوێ بمێنێتەوە!، بە جێگای خۆمانی

نازانین!، خواردنی لێ ناخۆین!، قسەی خۆشمان بۆ نایێ لەسەر ئەو قەبرەستانە!، خۆمان وا دەزانین غەریبین لەسەر ئەو گۆڕستانە!، گۆڕستان بە شتێکی نامۆ لەناو ئاوەدانیدا تەماشا دەکرێ!، وە زۆرجاریش بەداخەوە بەبێ رێزی تەماشا دەکرێ..! لەگەڵ ئەوەشدا عالەمێکە و ئاوەدانیەکە و شارێکی سەربەخۆیە!!.. سەدان و هەزاران ئینسانی بەڕێزی تێدا نێژراوە و پێویستە رێزی بگیرێ.

ئەو ژیانەی ئێمە لەگەڵ ئەوژیانەدا چەندە فەرقی هەیە!، بەرزەخ بەو مانایە هاتووە وەکو زانایان دەفەرموون (حاجِز)، یانی پەردە، ژیانی بەرزەخ، ژیانی قەبر، پەردەیەکە لە بەینی ژیانی دونیا و ژیانی دوارۆژ، جا دەبێ ئێمە بەوێدا هەر تێپەڕ ببین کاتێك دەچین بۆ خزمەت خودا (جل جلالـه)، بۆیە با هەڵوەستەیەك بکەین، با تۆزێك دیقەت دەین، بە روحێکی پڕ لە ئیمان و ئیسلامەوە با بچینە ناو قەبرەکان، با بچینە ناو گۆڕستان، بزانین ئیمانداران چۆن پێشوازییان لێ دەکرێ و دوژمنانی ئیسلامیش چۆن پێشوازیان لێ دەکرێ؟!، بزانین پاداشتی ئیمانداران چییە؟، بزانین سزا و نارەحەتیەك کە بۆ بێ باوەڕانیش دانراوە لە گۆڕساتاندا چییە؟!.

## بەڕێزان خۆشەویستان: ژیانی گۆڕستان لەگەڵ ژیانی ئێمەدا زۆر فەرقی هەیە!:

- ژیانی ئێمە لەسەر زەوییە، بەڵام ژیانی ئەوانە لەژێر خاکە.!
- ژیانی ئێمە فراوانە، خانوێکمان هەبێ زۆر فراوانە و تێیدا هاتوچۆ دەکەین، بەڵام قەبری تەنگ زۆر زۆر نارەحەتە و ناتوانی خۆتی تێدا وەرگێری بەو زاهیرەی کە ئینسان بۆ خۆی تەماشای دەکا!،
- ژیانی خۆمان کارەبای هەیە و روناکی تێدایە، بەڵام ئەوێ ئەگەر خوا بۆمان روناك نەکاتەوە تاریکە!.

- ژیانی ئێرەمان بە ئامادەبوونی خزم و کەس و خۆشەویستانە، بەڵام ئەوێ تەنیایە!.
- ژیانی ئێرەمان بە خۆپاراستنە لە دڕندە و لە مار و دووپشك و لە هەموو گیانلەبەرە دڕندەکان و زەرەرمەندەکان، کەچی لەوێ گۆشتمان دەخرێتە بەردەستی دوپشك و مار و جیرانمانن لەوێ ئەگەر خوا (جل جلالە) نەمانپارێزێ!.
- ژیانی ئێرە پڕە لە ئاوەدانیی زیندوو و کار و کاسبی و قسە و گفتوگۆ و هاتوچۆ و سەردان، بەڵام ئەوێ ئەوە نەماوە!، لەگەڵ خزم و کەست دابڕاوی، بە تەنها ماویتەوە!.
- ژیانی ئێرە بۆ زستان صۆبا و بەتانی و دۆشەکت هەیە بەڵام لەوێ لە زستانیشدا هەر خاك و خۆڵ رادەخەی!. وە لە هاوینیشدا نە موبەڕیدە و نە پانکەت هەیە و لەوێ هەروا بەوشێوەیەی کە دەیبینی جلێکی سپی بۆت دەکرێ و دەتخەنە خوارێ بۆ ناو ئەو گۆڕە!!، بۆ ناو ئەو قەبرە، تەماشا دەکەی تەنها خاکێکی رەق و روت و دوو مەتر خۆڵت لەسەر سینگی دەکەن، کە نازانی عاقیبەتت بەرەو کوێیە و خزمەکانت بە پەلەن هەتا دەگەڕێنەوە لەوێ و دەگەڕێنەوە سەر کار و کاسبی خۆیان و هەرتا چەند رۆژێکی کەم ئینسان مردووەکەی وەبیرە!، ئەگەر ئینسانێك لەکاتی مردندا لە هەموو رۆژنامە و بڵاوکراوەکانی عالەم ناوی بنوسرێ، بەڵام هەر چەند رۆژێکە و دوایی دەسڕێتەوە و کەسیش باسی ناکات!، جا با بۆ خۆمان حیسابێك بکەین کە دەچین بۆ ئەو شوێنە!.

خۆشەویستان: باسمانکرد لە وتارێکدا گوتمان ئینسان کە روح تەسلیم دەکا مەلائیکەت دێت (مَلَكُ المَوت) روحی ئینسان دەکێشێ، چۆن ئینسان لەو حاڵەتەدا شەیتان دەیەوێ زەفەری پێبیات؟، باسمانکرد کە شەیتان خۆی دێنێتە سەر شکڵی دایکی و باوکی، بەڵام خوای گەورە ئەوانەی کە مسوڵمانن

قسەکەیان رادەگرێ، ئاخیر وشەیان (لا اله الاالله) دەبێ کـە لەسـەری دەمـرن!، خوا هاوکاریان دەکات (جل جلاله)، وە دوای ئەوەی کە ئەو مەلائیکەتانە دێن بـۆ روحکێشانی ئینسان، ئەوانەی ئیماندارن مەلائیکەتی جوان و بەسەر و سـیمای جوان و بۆنی خۆشەوە دێن بۆ روحکێشانی!، ئەوەی کە مـسوڵمان بـێ، ئـەوەی کە ئیماندار بێ، مەلائیکەتی نورانی دێن بۆ روحکێشانی، کفنی سپیان پێیە و بۆنی خۆشیان پێیە، بەڵام بە پێچەوانەوە ئینسانی بێ دین، ئینسانی بێ ئیمـان و گوناهبار وەختێك روحـی دەکێـشن بـۆ خـۆی زۆر روحەکـەی بـە نارەحـەتی تەسلیم دەکات!، زۆر ئازاری پێوە دەبینێ!، لەگەڵ ئەوەشدا مەلائیکـەتی رەش و مەلائیکەتی ناشیرین لەبەرچاوی ئەو ئینسانە دێن کاتێك کە بۆنی ناخۆشـیان پێیە کە روحی ئەو ئینسانە دەکێشن.

وەختێك کە ئینسان دەمرێ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (وەختێك کە دەیبەن بۆ گۆڕستان سێ شتی دوا دەکەوێت، وەکو دەفەرموێت (يَتْبَعُ المَيتَ ثَلاثـاً: فَيَرجَـع اثنانِ وَيَبقى مَعَه واحِد، يَتبَعه أهلُه ومالُهُ و عَمَلُـه فَيَرجِـعُ أهلُـه وَمالُـه وَيَبقـى عَمَلُهُ)[١٠٢]، دەفەرموێ وەختێك کە ئینسان دەمـرێ بـۆ سـەر گۆڕسـتان بـەڕێی دەکەن و خەڵك لەگەڵی دەڕوات، سێ شت لەگەڵی دەڕۆن: ماڵی لەگەڵی دەڕوا، خزم و کەسی لەگەڵ دەڕوا، کـار و کـردەوەی خۆشـی لەگـەڵی دەڕوا، دوانیـان دەگەڕێنەوە یەکیان لەگەڵی دەمێنێتەوە، ئەوەی لەگەڵی دەمێنێتەوە تەنها کار و کردەوەی خۆیەتی جا خۆیی و کردەوەی خۆی، ئەگەر خـوا رەحمـی پێنـەکات دەبـێ بـە کـردەوەی خـۆی محاسـەبە بکـرێ مـاڵ و خـزم و کەسـی هـەمووی

[١٠٢] ((حدثنا الحميدي حدثنا سفيان حدثنا عبد الله بن أبي بكر بن عمرو بن حزم سمع أنس بن مالك يقول قال رسول الله صلى الله عليه وسلم يتبع الميت ثلاثة فيرجع اثنان ويبقى معه واحد يتبعه أهله وماله وعمله فيرجع أهله وماله ويبقى عمله))، صحيح البخاري، كتاب الرقاق، باب سكرات الموت، رقم الحديث ٦١٤٩.

دەگەڕێتەوە، ئــەوەی بــە ســەیارە هــاتووە لەگەڵێـدا ئەگــەر بــەتانی و لێفـە و دۆشەکی هاتوە لەگەڵیدا، ئەگەر دار جەنازەکەیە لەگەڵی هاتووە، ئەگـەر هـەر وەسیلەیەکی ماددیە لەگەڵی هاتووە، یان ئەوەتە خزم و کەس و خۆشەویستانی لەگەڵی هاتوون لەسەر گۆڕسـتان دەگەڕێنـەوە بـەرەو مـاڵی خۆیـان و خـۆی و کردەوەکەی بەجێ دەمێنێ لەو شوێنە!.

ئەو کاتەی کە ئـەو جەنازەیـە بـەرێ دەکـرێ بـۆ سـەر گۆڕسـتان پێغەمبـەر دەفەرموێ (علیه الصلاة والسلام): ئەو جەنازەیە هـاوار دەکـاو بـانگ دەکـات بـێ ئەوەی ئینسانەکان بیبیستن و ئـەوان لەسـەر شـانی خۆیـان دانـاوە، ئـەو - مردووەی- کە ئیمانداربێ و مسوڵمان بـێ دەڵێـت: (قَـدِّمُوني.. قَـدِّمُوني)[١٠٣]: نزیکم بکەنەوە و ببـەن، ببـەن..، چـونکە دەزانـێ بـۆ شـوێنێکی زۆر خـۆش دەچێت!، ئەو کاتەی کە مەلائیکەت روحییان کێشاوە دەزانـێ بـۆ شـوێنێکی خۆش دەچێ، موژدەیان پێداوە، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر ئینسانی تاوانبـار و گوناهبار بوو هاوار دەکا و دەڵێ: (أَينَ تَذهَبُونَ بِها ؟): بۆ کوێم دەبەن بـۆ کـوێم دەبەن؟، هاوار دەکات!!.

لەو حاڵەتەدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەگەر ئینسانەکان ئەوانەی جەنازەیان هـەڵگرتووە، بیانبیـستبایە ئـەو هـاوار و دەنگـەی ئـەو مـردووە، هـەموویان جەنازەکەیان فڕێدەدا لەسەر شانی خۆیان و بڵاو دەبون و کەس نەیدەزانی کێـوە دەچن؟!، بەڵام هەموو زیندەوەرێك گوێی لە هاتوهاواری ئەو مردووەیـە تـەنها ئینسانەکان لەگەڵ جنۆکە نەبێ ئەویتر هـەمووی گـوێی لـە هاتوهـاواری ئـەو مردوەیە کە لەسەر شانی خۆیانیان داناوە، لەماڵی خۆی دەیبەنـە دەرەوە و بـۆ سەر قەبرانی دەبەن، خۆشەویستان: لەگەڵ ئەوەی کە ئەو ئینـسانانە مردووەکـە

[١٠٣] صحيح البخاري، كتاب الجنائز، باب: كلام الميت على الجنازة، رقم الحديث ١٣١٤.

بەجێدێڵن لەسەر گۆڕستان مەلائیکەتی (نَکیر و مُنکر) دێنەسەری، بۆ ئەوەی پرسیاری لێ بکەن، ئەو کاتەی کە ئەو مەلائیکەتە دێن پرسیاری لێ دەکەن ئەگەر ئیماندار بێ ئەو مردووە زۆر چاك دەتوانێ وەڵام بداتەوە، ئەگەر ئیمانداریش نەبێ بەڕاستی خۆی نازانێ چ دەڵێ و توشی سزا و نارەحەتییەکانی سەختی بەرزەخ دەبێ!، وەختێك کە پرسیاری لێ دەکەن یەکەم پرسیاریان ئەوەیە، لێی دەپرسن (مَن رَبُّكَ؟): پەروەردگارت کێ بوو؟، کێت دەپەرست لە دونیا؟ کڕنوشت بۆ کێ دەبرد؟، ئەوەی کە ئیماندارە دەڵێ: پەروەردگارم (الله) بوو، سەجدەم بۆ ئەو دەبرد، کڕنۆشم بۆ ئەو دەبرد، عیبادەتی ئەوم دەکرد، ئەهلی مزگەوت بووم، ئەوەی کە بەچاکی زانیوە و ئەوەی کە لە دونیادا چاکەی کردووە، هەمووی لە خەیاڵە و دێتەپێش چاوی خوای گەورە وا دەکات وەڵامی مەلائیکەتەکان دەداتەوە، لێی دەپرسن (مَا دینُكَ؟): دینەکەت چ بوو؟، ئەویش دەڵێ: دینم ئیسلام بوو، لێی دەپرسن ئەو پیاوەی کە هاتبوو بۆ لای ئێوە کە موحەممەد بوو ﷺ چۆن هەڵسوکەوتت لەگەڵ کرد؟، ئەویش دەفەرموێ ئەوە پێغەمبەرە و پێشەوام بوو نموونە و ئیمامم بوو، بەدوای سوننەت و ڕێنمونییەکانی کەوتم.

بەڵام دیارە ئەوەی کە پیاوی گوناهبار و بێباوەڕ و کافر و مولحید بێ، موشریك بێ، کە مەلائیکەتەکان پرسیاری لێ دەکەن زۆر بە نارەحەتی وەڵام دەدەنەوە و نازانن وەڵامی بۆ دابنێن، وەختێك کە لێیان دەپرسن خودات کێ بوو؟، هەر دەڵێت نازانم!، وەختێك کە لێی دەپرسن دینەکەت چ بوو؟، هەر دەڵێ نازانم!، وەختێك کە لێی دەپرسن ئەو پیاوەی کە بۆلات نێررابوو لە دونیا کە بە پێغەمبەر هاتبوو (علیه الصلاة والسلام) چۆن هەڵسوکەوتت لەگەڵ کرد؟ بەچیت زانی، ڕات چۆن بوو لەسەری؟، ئەویش هەر دەڵێ نازانم!، ئەو کاتە دیارە سزای تایبەتی بۆ دادەنێن دوای ئەوەی کە خوای پەروەردگار ئەمر دەکات بە مەلائیکەتەکان.

خۆشەویستان: بەڕاستی تاقیكردنەوەی بەرزەخ، تاقیكردنەوەی ناو قەبر زۆر زۆر سەختە!، ئەگەر لە تاقیكردنەوەی دونیادا ئێمە لە قاعەی ئیمتیحاندا دادەنیشین خەڵكمان لە دەوروبەرە، ئازادییەكمان هەیە بیر دەكەینەوە، یا پرسیارێكمان هەیە تەركی دەكەین، بەڵام لە ڕاستیدا لەوێ ئەوە نییە، لەوێ بەبێ ئەوەی كە تەركی تێدابێ دەبێ وەڵامی پرسیارەكان بدەیەوە، بەو شێوەی كە پرسیارت لێ دەكەن بەپێی پێویست وە بەپەلەش دەبێ پرسیارەكان وەڵام بدەیەوە، جا ئەگەر خوا زوبانمان سەلامەت نەكا لەوێ بەڕاستی زۆر زۆر خەتەرە!، بۆیە ئیمامی عوسمان (خوا لێی ڕازیبێ) ڕۆژێكیان لەسەر قەبرەستان لەسەر قەبرێك ڕاوەستابوو زۆر گریا ریشی سپی هەمووی تەڕ بوو، غولامێكی هەبوو ناوی (هانیء) بوو لێی پرسی گوتی: یا ئیمام بۆچی ئەوەندە لەسەر قەبرەستان دەگری؟!، بۆ وەختێك كە ئایەتەكانی بەهەشت و جەهەننەم دەخوێندرێتەوە بەسەرتدا لەماڵەوە ئەوەندە ناگری؟!، بەڵام لەسەر قەبرەستان ئەوەندە دەگری!، فەرمووی لەبەر ئەوەی كە گوێم لێ بوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (إنَّ القَبر أوَّلُ منازِل الاخِرَة، فَإن نَجا مِنه فَما بَعد اَيسَرُ وَاِن لَم يَنجوا فَما بَعدُ اَشَدُّ)[104] فەرمووی: لەبەر ئەوەی گوێم لە پێغەمبەر بوو ﷺ فەرمووی: قەبر یەكەمین مەنزڵگای دوارۆژە، جا ئەگەر لەوێ ئینسان نەجاتی بوو لەو ئیمتیحانە لە دوای ئەوە هەرچی دێتەپێشی لە دوارۆژ و لە حیساباتی قیامەت ئەوە ئاسانترە!، بەڵام ئەگەر لەوێ ناجیح نەبوو ئەوەی لە دوای ئەو دێ زۆر

[104] ((حدثنا هناد حدثنا يحيى بن معين حدثنا هشام بن يوسف حدثني عبد الله بن بحير أنه سمع هانئا مولى عثمان قال ثم كان عثمان إذا وقف على قبر بكى حتى يبل لحيته فقيل له تذكر الجنة والنار فلا تبكي وتبكي من هذا فقال إن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال إن القبر أول منازل الاخرة فإن نجا منه فما بعده أيسر منه وإن لم ينج منه فما بعده أشد منه قال وقال رسول الله صلى الله عليه وسلم ما رأيت منظرا قط إلا القبر أفظع منه))، سنن الترمذي، كتاب الزهد، باب: ذكر الموت، رقم الحديث ٢٣٠٨.

ناخۆشتر و نارِەحەتترە!، جا لەڕاستیدا ئیمتیحانێکی قورسە بۆیە ئیمامی عوسمان (خوای لێی رازیبێ) لەو حاڵەتەدا گریاوە چونکە دەزانێ حەقیقەتی عەزابی قەبر و حەقیقەتی ئەو شوێنە و ئیمتیحانەکەی چۆنە، بۆیە ئەوەندە بۆی گریاوە!، بەڵام ئێمە بیر ناکەینەوە لەوەی کە ئەو شوێنە چاوەڕێمان دەکات!، نازانین لە کوێ دەمرین؟، بەچی دەمرین؟، چۆن دەمرین؟، چۆن دەمانبەن بۆ گۆڕستان؟!، هەر یەکێکمان لە چ گۆڕستانێك دەنێژرێین؟!، دیارە ئەوە نازانین!، بیریشی لێناکەینەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڕۆن زیارەتی قەبرەستان بکەن بیربکەنەوە بۆ ئەوەی مردنتان بێتەوە یاد، لەسەر قەبرەستان دانیشن دوعا بۆ مردووەکان بکەن، بیر بکەنەوە لە خۆتان کە دێن بۆ ئەوێ، دیارە ئەگەر ئیمامی عوسمان یەکێکی ئاوا، زاتێکی پڕ لە حەیا و ئەدەب و شەرم ئاوا بترسێ و بگرییێ کە یەکێکە لە (عَشَرَةُ الْمُبَشَّرَةِ)، خوای پەروەردگار هەر لە دونیا وەعدی بەهەشتی پێداوە!، ئەو عوسمانەی کە ڕۆژێکیان ویستی بچێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، وەختێك کە عائیشە دەگێڕێتەوە (خوا لێی رازیبێ) دەفەرموێ: بینیم ئەبووبەکری صدیق ئیجازەی وەرگرت لە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) پێغەمبەر دانیشتبوو جلیم بۆ شوشتبوو، تۆزێك لە رانی دیاربوو بە رووتی، -دەفەرموێ- ئیجازەی ئەبووبەکری داو هاتە ژوورەوە شوێنەکەی دانەپۆشتەوە، دوایی ئیمامی عومەر دوای کرد بێتە ژوورەوە ئیجازەی وەرگرت ئەویشیان چویە ژوورەوە هەر شوێنەکەی دانەپۆشتەوە، دەفەرموێ ئیمامی عوسمان لە دەرگەیدا یەکسەر شوێنەکەی داپۆشتەوە و فەرمووی وەرە ژوورەوە یا عوسمان!، عائیشە دەفەرموێ زۆر سەرم سوڕما: بۆ دەبێ بۆ ئیمامی عوسمان ئەو شوێنە دابداتەوە کە سەرچۆکیەتی بۆ ئەوانیتری دانەداوە؟!، وەختێك کە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، پێغەمبەر فەرمووی: (أَلا أَستَحِي مِن رَجُلٍ تَستَحِي مِنهُ

المَلائِكَة؟)[١٠٥] فەرمووی: چۆن شەرم نەکەم لـە کەسـێك کـە مەلائیکـەتی خـوا شەرمی لێ دەکەن؟!!.

ئەو عوسمانە کە مەلائیکەتی خوا شەرمی لێکردووە، ئەوەندە بە حـەیا و بـە ئەدەب بووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بـە حـەیاترین کـەس لـە ئوممـەتی مـن ئیمامی عوسمانـە!، فـەرمووی ئەگـەر دامنـەداباوە نەدەهاتـە ژوورەوە!، ئـەو عوسمانە ئاوا دەگریێ لەسەر قەبر لەبەرئەوەی کە دەزانێ چ ئیمتیحانێك هەیـە، دەزانێ چ عـەزابێکی لە دوایە ئەو قەبرە!.

بەڵێ خۆشەویستان: کابرای زاڵم وەختێ کە پرسیارەکانی لێ دەکرێ هـەر بـە (لا أدرِي) وەڵام ئەداتەوە لەناو قەبر، نازانێ چـۆن وەڵامێـك بـۆ پرسـیارەکانی دابنێ؟!، چونکە لە دونیادا بیری لێ نەکردۆتەوە بڵێ خوام (اللە)یە و دەیپەرستم و کڕنۆشی بۆ دەبەم و قورئانێك کـە ناردویـەتی دەسـتورێکە و دەیخوێنمـەوە و عـەمەلی پێ دەکەم، بۆیە لەوکاتەشەوە نایەتە خەیاڵی، خوای گەورە (جـل جلالـه) دەفەرموێ: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ﴾ ٢٧- إبراهيم، واتە: خـوا ئیمانـداران

[١٠٥] ((حدثنا يحيى بن يحيى ويحيى بن أيوب وقتيبة وابن حجر قال يحيى بن يحيى أخبرنا وقال الاخرون حدثنا إسماعيل يعنون ابن جعفر عن محمد بن أبي حرملة عن عطاء وسليمان ابني يسار وأبي سلمة بن عبدالرحمن أن عائشة قالت ثم كان رسول الله صلى الله عليه وسلم مضطجعا في بيتي كاشفا عن فخذيه أو ساقيه فاستأذن أبو بكر فأذن له وهو على تلك الحال فتحدث ثم استأذن عمر فأذن له وهو كذلك فتحدث ثم استأذن عثمان والحاصل رسول الله صلى الله عليه وسلم وسوى ثيابه قال محمد ولا أقول ذلك في يوم واحد فدخل فتحدث فلما خرج قالت عائشة دخل أبو بكر فلم تهتش له ولم تباله ثم دخل عمر فلم تهتش له ولم تباله ثم دخل عثمان فجلست وسويت ثيابك فقال ألا أستحي من رجل تستحي منه الملائكة))، صحيح مسلم، كتاب فضائل الصحابة، باب: من فضائل عثمان بن عفان (رضي الله عنه).

دامەزراو دەکا بە وتەی چەسپاو کە {لا الە الا اللّٰە}یە لە ژیانی دنیاو دوارۆژدا ، وەستەمکارانیش گومڕا دەکات.

خۆشەویستان: هەموو ئینسانێکیش کە دەچێتە ناو گۆڕ بێگومـان گۆڕەوشـار دەدرێ، گۆڕەوشار ئەوەیە کـە قەبرەکـە وێـك دەکەوێتـەوە و پەراسوی چـەپی دەچـێتە لای راسـت و لای راسـتی دەچـێتە لای چـەپ، وەکـو پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: تەنها شەهید نەبێ کە ئینسانی شەهید لە پێناوی خوادا جەنگا بێت لە پێناوی ئیسلامدا شەهید بووبێ و کوژرابێ ئەوە گۆڕەوشاری لەسـەر نییـە!، وەختێك کە لە پێغەمبەریان پرسیارکرد ﷺ بۆچی شەهید گۆڕەوشـاری لەسـەر نییـە؟ فـەرمووی: (كَفَـى بِبارِقَـةِ الـسُّيُوفِ عَلَـى رَأْسِـهِ فِتنَـةً)[١٠٦] فـەرمووی: بریسکەی شمشێرانی لەسەر سەری بەس بووە بۆ ئازاری، ئەو هـاتنی بریـسکەی شمشێران لەسەری کە لـە مەیـدانی جیهـاد و قیتالـدا هـەبووە ئـەوە لـەجیاتی گۆڕەوشارەکەیەتی و خوا ڕێزی لێدەنێ.

ئەو کاتەی کە ئەو ئینسانە دەچێ بۆ گۆڕستان دیارە وەختێ کـە ئینـسانەکان دەگەڕێنەوە مەلائیکەتەکان پرسیاری لێ دەکەن و وردە وردە دەیانـەوێ بـەرزی بکەنەوە بۆ خزمەت خـوا (جل جلالـه)، دەیانـەوێ روحەکـەی ببـەن بـۆ ئاسمـان، مەلائیکەتەکان روحی ئەو ئینسانە هەڵدەگرن ئەگـەر ئیمانـدار بـوو وردە وردە دەڕوا بۆ پێشەوە مەلائیکەتەکان دەزانن کە ئەوە روحێکی ئیمانداره و هـاتووە بۆ لایان، هەر کاتێك لە ئاسمانەکان بەسەر دەکەوێ دوعای بۆ دەکرێ و ئاسمانی بۆ دەکرێتەوە!، بەڵام کاتێك کە دەگاتە ئەو شوێنەی خوا مەبەسـتییەتی خـوای

[١٠٦] أخبرنا إبراهيم بن الحسن قالا حدثنا حجاج عن ليث بن سعد عن معاوية بن صالح أن صفوان بن عمرو حدثه عن راشد بن سعد عن رجل من أصحاب النبـي صلى الله عليه وسلم ثم أن رجلا قال يا رسول الله ما بال المؤمنين يفتنون في قبورهم إلا الشهيد قال كفى ببارقة السيوف على رأسه فتنة. سنن النساني، كتاب الجنائز، باب الشهيد، رقم الحديث ٢٠٥٣

پەروەردگار ئیستیقبالی دەكا و بە مەلائیكەتەكانی دەفەرموێ: ئەو عەبدەی من ببەنەوە بۆ شوێنی خۆی چونكە وەعدم داوە هەر لەوێوە دروستیان بكەمەوە وەختێك كە قیامەت دادێت، بەڵام شوێنێكی زۆر خۆشی بۆ ئامادە بكەن، قەبرەكەی زۆر بۆ فراوان (واسع) كەن و رابخەن، وە لە هەموو ناز و نیعمەتێك بۆی برازێننەوە!، دیارە وەكو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (القَبر إمّا روضَةٌ مِن رياضِ الجَنَة، أو حُفرةٌ مِن حُفرِ النِّيران) فەرمووی: قەبر یان باغێكە لە باغەكانی بەهەشت یان شیوێكە لە شیوەكانی جەهەننەم، ((خوا بمانپارێزێ))، پێغەمبەر ﷺ كاتێك كە ئەو فەرموودەی فەرمووە دیارە بۆ ئەوەیە كە ئینسان عیبرەتی لێ وەربگرێ، یەعنی عەزابی جەهەننەم لە قەبریشدا ئینسان دەیچێژێ!، وە خۆشی بەهەشتیش ئینسان لە قەبریشدا دەیبینێ و دەیچێژێ!.

ئەگەر بەهەشتی بوو ئەوە بەشێك لە نیعمەتەكانی بەهەشت دەبینێ، رۆژانە بەیانیان و ئێواران ئینسان لە قەبردا ئەگەر ئیماندار بوو بەهەشت دەبینێ، شوێنی خۆی دەبینێ و لەزەتیش لە ناز و نیعمەتی دەكا، بەڵام ئەگەر ئینسانی كافر بوو ئەویش بە پێچەوانەوە هەموو عەزابەكانی دۆزەخ دەبینێ، شوێنی خۆیشی لە دۆزەخ دەبینێ هەموو رۆژێك، پاشانیش سزایەكان ئازاری پێ دەگەیەنێ!، دیارە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەو قەبرە بۆ ئینسانی مسوڵمان بەرین دەبێ بە قەدەر ئەوەی كە چاو دەبینێ!!!.

ئەو هەموو سزا و ئازارەی كە ئینسانی گوناهبار لە قەبردا پێی دەگات و دەیبینێ هەموو گیانلەبەرێك دەیبیستێ، تەنانەت ئەو كاتەی كە مەلائیكەتەكان پرسیاری لێ دەكەن نازانێ وەڵام بداتەوە لە حەدیسێكدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ كە گورزێكی لێ دەدەن، كە ئەزیەتێكی پێ دەگەیەنن هەموو زیندەوەرەكانی سەر رووی زەوی دەیبیستن تەنها ئینسان و جنۆكە نەبێ!!، هەموو حەیواناتیش گوێی لە دەنگی هەموو ئەو عەزابەی ناو قەبرە

هەیە تەنها جنۆکە و ئینسانِ ئاگای لـێ نییـە و نازانـێ، دەنـا پێغەمبـەر ﷺ ڕۆژێکیان لەسەر قەبرێك راوەستا بوو قسەی دەکردن، ئیمامی عومەر (خـوا لێـی رازیبێ) فـەرمووی: (یـا رسـول اللّٰه) ئایـا گوێیـان لێیـە ئەوانـە؟ ئـەدی ئەوانـە نەمردوون؟، فەرمووی: ئەی عومەر ئەوانە زیاتر لە تۆ گوێیـان لێیـە، یـەعنی ئەوەندەی کە ئەوان گوێیان لێیە ئەوەندە تۆ گوێت لێ نییە، بەڵام ئەوانە نازانن و ناتوانن وەڵام بدەنەوە لەبەرئەوەی مردوون، تەنانەت مردووەکـان گوێیـان لـە دەنگی نەعلی ئینسانی زیندووە کە بەسەریاندا تێدەپەرێ و هاتوچۆ دەکات.

خۆشەویـستان: ئـەبوو هـورەیرە دەگێڕێتـەوە (خـوا لێـی رازیبـێ) پێغەمبـەر ﷺ ڕۆژێکیان لەسەر قەبرێك راوەستا بوو فەرمووی: (مايَأتي عَلَى هَذا القَبرِ يَومٌ إلا وهو يُنادي بِصوتِ ذَلقٍ طَلَق يابَني أدَمَ نَسيتَني، يابَني أدَمَ أَلَم تَعلَم أَنِّي بيت الوَحدَة وَبَيتُ الغُربَة وَبَيت الوَحشَةِ وَبَيتُ الدُّودِ وبيتُ الضَّيق، إلا من وسعَني اللّٰهُ لَـهُ)[١٠٧] پێغەمبـەر (علیـه الـصلاة والـسلام) کـە لەسـەر قەبرەکـە راوەسـتا بـوو فەرمووی: هەموو ڕۆژێك کە بەسەر ئەو قەبرەدا دێت -دیارە مەبەستی هەموو قەبرێکە-، ئەو قەبرە هاوار دەکات لەو ڕۆژەدا، دەڵێ: ئەی بەنی ئادەم منت لە یاد چووە، ئەی بەنی ئادەم ئایا نەتزانی ئەمن ماڵی تۆمە کە مـاڵی تـەنهام!؟، کە تۆ بە تەنها دێی بۆ ئێرە، بە تەنها لەناو مندا دەبی، ئایا تۆ نـەتزانیوە کـە من ماڵی غەریبی و غوربەتی تۆمە و ڕۆژێك دێ تۆ دێی بۆ ئێـرە؟!، نـەتزانی کە من ماڵێکی پڕ ترس و کرمم بـۆ تـۆ؟!، بـیری لێناکەیـەوە دێـی بـۆ ئێـرە، نەتزانیوە کە ماڵێکی تەنگی تۆمە و ڕۆژێك دێی بـۆ ئێـرە و ماڵـە فراوانەکـەت بەجێ دێڵی، مەگەر ئەو کەسە نەبێت کـە خـوای گـەورە رەحمـی پێـدەکا و ئـەو

---

[١٠٧] سنن الترمذي، كتاب صفة القيامة والرقائق والورع صفة أواني الحوض، باب السنة، رقم الحديث٢٤٦٠

ماڵەی بۆ بەرین دەکات، ئەگەرنا ماڵەکە بەڕاستی تەنگە!، ئەو قەبرە هاوار دەکا هەموو رۆژێك بۆ ئەو ئینسانانەی کە لەسەر روی زەویدا لەسەر ئەو خاکە دەژیێن، بەڵام دیارە ئینسانەکان گوێیان لێ نییە و هەر بە خەیاڵیشیاندا نایە!!.

رۆژێکی تر پێغەمبەر ﷺ لەسەر قەبرێك وەستا بوو دەنگێکی لە قەبرەکە بیست و پرسیاری کرد ئەو قەبرە هی کێیە و چۆن مردووە؟، گوتیان ئەوە لە زەمەنی جاهیلیەتدا مردووە، بە مسوڵمانی نەمردووە، فەرمووی (لَولا أن لا تَدافَنُوا لَدَعَوت اللهَ عَزَّ وَجَلَّ أن يَسمَعَكُم مِن عَذاب القَبرِ)[١٠٨]، فەرمووی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە هەر مردوو ناشارنەوە، دوعام دەکرد و لە خوا دەپاڕامەوە کە گوێتان لە عەزابی کەسانی ناو قەبر ببوایە!، بەڵام ئەگەر گوێتان لە عەزابی کەسانی ناو قەبر ببوایە کەس مردووی نەدەشاردەوە و کەس نەدەوێرا بچێتە لای گۆڕستان!، لە راستیدا بۆیە ئینسان نازانێ عەزابی ناو قەبر چۆنە؟!، حیساب و کیتاب و ئیمتیحان چۆنە؟، بۆ ئەوەی لێرەوە حیسابی بۆ بکات و تاقیکردنەوەکە گرنگی بێنێ!، ئەگەر ئینسان بزانێ لەناو قەبر چ روودەدات؟، ئەو کاتە تاقیکردنەوەکە ئیجابی نابێت و زۆر گرنگی بۆ دانانێین لە دونیا!، هونەر ئەوەیە تۆ نەتبینیوە کاری بۆ بکەیت نەك کە بینیت ئەو کاتە

---

[١٠٨] ((أبي سعيد الخدري عن زيد بن ثابت قال أبو سعيد ولم أشهده من النبي صلى الله عليه وسلم ولكن حدثنيه زيد بن ثابت قال ثم بينما النبي صلى الله عليه وسلم لبني النجار على بغلة له ونحن معه إذ حادت به فكادت تلقيه وإذا أقبر ستة أو خمسة أو أربعة قال كذا كان يقول الجريري فقال من يعرف أصحاب هذه الاقبر فقال رجل أنا قال فمتى مات هؤلاء قال ماتوا في الاشراك فقال إن هذه الامة تبتلى في قبورها فلولا أن لا تدافنوا لدعوت الله أن يسمعكم من عذاب القبر الذي أسمع منه ثم أقبل علينا بوجهه فقال تعوذوا بالله من عذاب النار قالوا نعوذ بالله من عذاب النار فقال تعوذوا بالله من عذاب القبر قالوا نعوذ بالله من عذاب القبر قال تعوذوا بالله من الفتن ما ظهر منها وما بطن قالوا نعوذ بالله من الفتن ما ظهر منها وما بطن قال تعوذوا بالله من فتنة الدجال قالوا نعوذ بالله من فتنة الدجال))، صحيح مسلم، كتاب الجنة وصفة نعيمهما، باب: عرض مقعد الميت الجنة أوالنار، رقم الحديث ٢٨٦٨.

بە چاوی ناچار حیسابی بۆ بکەیت!، خۆشەویستانم: دیارە عەزابی گۆڕیش یەکێکە لە عەزابەکانی جەهەننەم، وە بەشێکە لەو عەزابە بۆیە پێویستە زۆر وریا بین و خۆمان بپارێزین بۆ ئەوەی کە ئەو عەزابانەی کە لە قەبریشدا (گوناهباران و تاوانباران)ی مردووەکان دەیبیستن، ئێمە هەر لە ئێستاوە لە ژیانی خۆماندا خۆیانی لێ بپارێزین...

## ئەو عەزابانەی کە زیاتر مردوو پێیەوە ناڕەحەت دەبێت:

یەکێکیان، کە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: خۆ پاك نەکردنەوەیە لە میز، پاشان ئەوەیە کە وەکو فەرمووی: قسە هێنان و بردن لە بەینی ئەو کەس و ئەو کەس یا ئەو کۆمەڵ و ئەو کۆمەڵ بۆ تێکبەردانی خەڵکی، یان بۆ ناڕەحەتکردن و ناشرینکردنی خەڵکی، غەیبەت و درۆ و بوهتان، ئەوانە بەڕاستی زۆرترینی عەزابی قەبرن!، کە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لەسەر قەبرێك راوەستا بوو فەرمووی[١٠٩]: ئەو مردووە بە دوو سیفەتان عەزاب دەدرێت کە گرنگی پێ نەداوە، یەکێکیان خۆ نەپاراستنە لە پشکە میز و لە تارەتگرتن زۆر گرنگی نەداوە، ئەویتریشیان لە قسە هێنان و بردن، جا وەکو گوتمان عەزابی قەبر بەشێکە لە عەزابی جەهەننەم، کاتێك کە پێغەمبەر

[١٠٩] ((حدثنا عثمان قال حدثنا جرير عن منصور عن مجاهد عن بن عباس قال ثم مر النبي صلى الله عليه وسلم بحائط من حيطان المدينة أو مكة إنسانين يعذبان في قبورهما فقال النبي صلى الله عليه وسلم يعذبان وما يعذبان في كبير ثم قال بلى كان أحدهما لا يستتر من بوله وكان الاخر يمشي بالنميمة ثم دعا بجريدة فكسرها كسرتين فوضع على كل قبر منهما كسرة فقيل له يا رسول الله لم فعلت هذا قال لعله أن يخفف عنهما ما لم تيبسا أو إلى أن ييبسا باب ما جاء في غسل البول وقال النبي صلى الله عليه وسلم لصاحب القبر كان لا يستتر من بوله ولم يذكر سوى بول الناس))، صحيح البخاري، كتاب الوضوء، باب: من الكبائر أن لا يستتر من بوله، رقم الحديث ٢١٣.

(علیه الصلاة والسلام) لە شەوی ئیسرادا بەهەشت و جەهەننەمی بینی، (دەفەرموێ) کەسانێکی بینی لە جەهەننەمدا لەناو رووباری خوێندا مەلەیان دەکرد!، ئەو ئینسانە لەناو رووبارەکەدا خۆی نقوم دەکرد و دەهاتە دەرەوە، رووبارەکەش هەمووی خوێن بوو!، کەسێکیش لە دەرەوەی رووبارەکە راوەستا بوو، بەردی خڕ و گەورەی بە دەستەوە بوو جارجار بۆی دەهاویشت و دەیهاویشتە ناو گەرووی ئەو ئینسانە و قوتی دەدا، پرسیاری کرد و فەرمووی: ئەوانە کێن و چ کەسن؟، ئەو مەلائیکەتەی کە لەگەڵیدا بوو فەرمووی: ئەوانە ئەو کەسانەن کە ریبایان خواردووە لە دونیا، حاڵیان ئەوەیە کە لە دوارۆژدا وە لە ناو قەبریشدا ئەو سزایە بە چاوی خۆیان دەبینن و هەستی پێ دەکەن، کەسانێکی تری بینی مەلائیکەتی عەزاب لە جەهەننەمدا قولابیان پێیە لەناو دەمیان دەکەن و دەمەکەیان رادەکێشن بۆ پشتەوە و هەڵی دەزرێنن و شەقی دەکەن!، لەولاشەوە بۆ لای راست و لەولاشەوە بۆ لای چەپ!!، پرسیاری کرد ئەوانە چین؟، فەرموی: ئەوانە ئەو کەسانەن کە درۆ و بوهتان و غەیبەتیان کردووە!، ئەوانەی کە زوبانیان لە خێر نەگێڕاوە، ئەوە بەدەمی خۆیان ئەو سزایە دەبیننەوە، جا خوا بمانپارێزێ!.

ئەوانە بەڕاستی عەزابێکن بۆ کەسانێك کە کردەوەی خراپ دەکەن کە ئێمە خۆشمان دەزانین حەرامن، دەزانین ریا حەرامە، دەزانین درۆ حەرامە، غەیبەت حەرامە، قسە هێنان و بردن حەرامە، جاسوسی حەرامە، دەزانین نەزەر و بەرەڵایی ئافرەت حەرامە، دەزانین ئەگەر ئینسان ئاگاداربێ کە لەماڵیدا خەراپە و بێئەخلاقی هەیە، یا کچی یان خوشکی یان برای یان کوڕی بێئەدەب و بێئەخلاقە و نەسیحەتی ناکات، ئەوە حەرامەو دەبێتە (دَیُّوس)، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دَیُّوس ناچێتە بەهەشت، فەرموویان دَیُّوس کێیە؟، فەرمووی ئەو کەسەیە کە بزانێ لە ماڵەکەیدا فاحیشە و بێ شەرعی دەکرێ

بەڵام ئەویش چاوپۆشی لیٚ بكات، بەڕاستی پێویستە ئێمە زۆر وریا بین، ئەوەی كە بۆ مردووش دەچێت دوای مردنی وەكو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سیٚ شت ئینسان ئیستیفادەی لیٚ دەكات، (إذا ماتَ الانسان انقَطَعَ عَمَلُهُ إلا مِن ثَلاثة، إلا مِن صَدَقَة جارية، أوِ عِلمٌ يُنتَفَعُ بِهِ، أو وَلَدٌ صَالِحٌ يَدعو لَـهُ)[1] فەرمووی: ئینسان كە مرد تەنها سیٚ شت سوودی پیٚ دەگەیەنێت: (صَدَقَةٌ جَارِيةٌ) واتە خێرێكی كردبیٚ، ئەو خێرە بەردەوام خەڵك ئیستیفادەی لیٚ بكات لە شوێنێك كە بەجێی هێشتووە، ئەگەر مزگەوتێكی كردووە، ئەگەر فەرشی لە مزگەوت راخستووە؛ ئەگەر سەد دیناری بە ئالەتێك داوە كە خزمەتی مسوڵمانانی پیٚ دەكرێت، وە فەرمووی ئەویتریان ئەوەیە كە منداڵی صاڵحی لە پاش بەجێمابێت، ئەگەر كوڕ بێت ئەگەر كچ بێت، وە هەروەها خزم و كەس وە هەموو مسوڵمانانیش (دیارە بەقیاس لەوەدا كە زانایان دەفەرموون) كە دوعا بۆ مردوو دەكەن ئەوەشیان پیٚ دەگات، ئەویتریشیان فەرمووی: ئەگەر عیلمێكی بەجێهێشتبێت و خەڵك ئیستیفادەی لیٚ بكات، ئەگەر كیتاب و نوسراوێكە، ئەگەر موحازەرەیەكە، ئەگەر قسەیەكی خێرە، لە دوای ئەو هەرچەند خەڵك ئیستیفادەی لیٚ بكات، ئەو هەموو خێرانە بۆ وی دەگەڕێنەوە بەبیٚ ئەوەی خێر لەو كەسانەی كە دەیكەن كەم بكرێتەوە!!، جا پێویستە خۆمان زۆر ئاگاداربین ئەو رۆژەمان لەپێش چاو بیٚ، كە رۆژێك دێت دەمانخەنە ناو تابوتەوە، دەمانخەنە ناو دارەبازدوە، دەمانبەن بۆ ناو گۆڕستان و لەوێش بە

---

[1] ((حدثنا يحيى بن أيوب وقتيبة يعني بن سعيد وابن حجر قالوا حدثنا إسماعيل هو بن جعفر عن العلاء عن أبيه عن أبي هريرة أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال إذا مات الانسان انقطع عنه عمله إلا من ثلاثة إلا من صدقة جارية أو علم ينتفع به أو ولد صالح يدعو له))، مسند إمام أحمد، جزء ٢، صفحة ٣٧٢، رقم الحديث ٨٨٣١.

تەنها جێمان دەهێڵن، جا خۆمـان و کـردەوەی خۆمـان ئەگـەر خـوای گـەورە ڕەحمان پێ نەکات بەڕاستی دەفەوتێین.

ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لَن يُدخِلَ أَحَدٌ عَمَلُهُ الجَنَّـةَ)[111]، واتە: هیچ کەسێك کردەوەکـەی نایباتـە بەهەشـت!، یـەکێك لـە صـەحابیەکان هەڵـساوە فەرمووی: (وَلا أَنتَ يَا رَسُـولَ اللهِ؟!)، فەرمووی: ئەتۆش ئەی پێغەمبەری خـوا؟!، فەرمووی (وَلا أَنا إِلا أَنْ يَتَغَمَّدني اللهُ بِرحمَـةٍ) واتـە: منـیش بـە کـردەوەی خـۆم ناچمە بەهەشت مەگەر خوای گەورە بە ڕەحمەتی خۆی داپۆشـێ!، مانـای وایـە ئینسان دەبێ هەموو تەماح و چاوەڕوانییەکی ڕەحمەتی لە خـوای پـەروەردگارەوە بێ کە خوا ڕەحمی پێ بکات، ئەگەرنا عەمەلی ئینسان هەرچەندە زۆر بێـت هـەر کەمە!، چونکە ئینسان هەر چەندە کار بکا و ماندوو ببێـت هـەر قـەرزاری (ربُ العالَمين)ە.

لە خوای پەروەردگار دەپاڕێینەوە و دەڵێین: یاڕەببی خوایە ئاخیری عومرمـان خێرکەیت، یاڕەببی خوایە گۆڕستانمان بۆ ڕوناك بکەیت، خوایە قـەبرەکانمان بـۆ فراوان و ڕووناك بکەیت، خوایە وەڵامی پرسیاری مەلائیکەتەکانمان بـۆ ئاسـان بکەیت، خوایە زوبانمان چەسپاو (ثابت) بکەیت لەو کاتەدا، خوایە تۆمان لە یاد نەچێت لەو کاتەدا و وەبیرمان بیت (یا ربَ العـالَمين)، خوایە هیدایـەتی مـاڵ و منداڵمان بدەیت، یاڕەببی خوایە شیفای نەخۆشی مسوڵمانەکان بـێنی، خوایـە لە گوناهی هەموو لایەکمان خۆشبیت، خوایە گیراوی مـسوڵمانەکان بەرهەڵـدا بکەیت، خوایە بزربووی مسوڵمانان بگێڕیەوە، خوایـە مـسوڵمانان لـە هـەموو شوێنێك سەرخەی، خوایە مسوڵمانان سـەرخەی بەسـەر دوژمنانیانـدا، خوایـە

[111] صحيح مسلم، كتاب صفات المنافقين، باب: لن يدخل أحد الجنة بعمله، رقم الحديث ٢٨١٦.

دوژمنانیان بتۆقێنی، زەلزەلەی زەویان لەژێر پێ بکەیت یارەببی، یارەببی خوایە هەموو مسوڵمانان لە دونیا لە هەموو ناخۆشی و نارەحەتیەك بپارێزی و سەریان بخەی (یا ربَ العالَمین).

أقُول قَولي هذا وأستغفِرُ اللهَ لكم وَ لسائر المُسلِمين، اَعوذُ بِاللهِ من الشَّيطان الرَّجيم

(رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)

آمين

# بەهەشت و نیعمەتەکانی

﴿وَسَارِعُواْ إِلَى مَغْفِرَةٍ من رَّبِّكُمْ وجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَات وَالأَرْض
أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ﴾ ١٣٣- آل عمران

## بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحمدَ للهِ نَحمَدُهُ وَنَستَعينُهُ وَنَشكُرُهُ وَنَستَهديه، وَنَعوذُ بِاللهِ مِن شُرورِ أنفُسنا و سيئاتِ أعمالِنا، مَن يَهدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَ لَه، وَمَن يضلِل فَلا هَادِي لَـه، وَنَشهَدُ أن لا الهَ ألا اللهُ وَحدَهُ لاشَرِيكَ لَه، شَهادَةً تُنجِي قائِلَها يَوم لايَنفَعُ مالٌ وَلا بَنون إلا مَن أتى اللهَ بِقَلبٍ سَلِيم، وَنَشهَدُ أنَّ سيدَنا وَنَبِيَّنا مُحمَداً عَبدُهُ وَرَسُولُه، هَذا الرَسُولُ الذِي بَلَّغَ الرِّسَالةَ وَأدَى الامانَةَ وَنَصَحَ الامةَ وَجَاهَدَ فِي اللهِ حَقَ جِهَادِهِ وَتَركَنا عَلى المحجَةِ البَيضاء، لَيلُها كَنَهارِها، لايَزيغُ عَنها الا هَالِك، صَلَواةُ الله وسلامُهُ عَلَيهِ وَعَلى آلِهِ وَأصحابِه، أمَّا بَعدُ ياعِبادَ اللهِ، أُوصِيكُم وَنَفسِي بِتَقُوى اللهِ وَطاعَتِه، فَأنَّ اللهَ مَعَ الَذين اتَّقَوا وَالَّذينَ هُم مُحسِنون، قالَ اللهُ سُبحانَه وَتعالَى فِي كِتابِهِ الحَكيم، بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيم ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ ١- النساء.

ئیماندارانی بەڕێز، شوێنکەوتوانی پێغەمبەری پێشەوامان موحەممەد ﷺ، سەلام و رەحمەتی خوای پەروەردگار برژێ بەسەر ئێوە و هەموو مسوڵمانانی دونیا، لە خوای پەروەردگار دەپاڕێینەوە لەم رۆژە پیرۆزەدا و دەڵێین: یارەببی خوایە رۆژووەکانمان لێ قەبوڵ بکەی، یارەببی خوایە نوێژەکانمان لێ قەبوڵ بکەی، یارەببی خوایە هەموو عیبادەتەکانمان لێ قەبوڵ بکەی، خوایە گەڕانەوە و تەوبەی مانگی رەمەزانمان لێ قەبوڵ بکەی.

خۆشەویستەکانم، یەکێك لە نیشانەکانی گەورەیی مانگی رەمەزان وەك پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: (إذا جاءَ رَمَضانُ فُتِحَت أبوابُ

الجَنَّة)[112] واتە: ئەگەر رەمەزان هات دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە و دەخرێنە سەر پشت، بۆ کێ؟، بۆ عەبدەکانی خوا، بۆ ئەوەی بەردو خوا بێن و لە مانگی رەمەزاندا پەشیمان ببنەوە لە گوناهەکان و تەوبە بکەن، تەماشای بەهەشت بکەن و نازونیعمەتی بەهەشت بهێننە بەرچاوی خۆیان، هەروەکو چۆن دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن!، هەروەکو چۆن دەرگاکانی ئاسمانەکان دەکرێنەوە، جا بەهەشت چۆنە و نازونیعمەتەکانی چین و چۆنن؟، وە بەهەشتیەکان چۆنن و چ دەکەن؟، با لە وتاری ئەمڕۆ بچینە خزمەتی ئەو بەهەشتەی خوای پەروەردگار، لەژێر رۆشنایی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، وە لەژێر رۆشنایی فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو خوای پەروەردگار خۆشەویستی خۆی وە خۆشەویستی ئەو بەهەشتە بخاتە ناو دڵەکانمان، زیاتر وامان لی بکات بەرەو نازونیعمەتی ئەو بەهەشتە هەوڵ بدەین، ئەو خۆشییە هەتا هەتاییە لە قیس خۆمان نەدەین، ئەو ژیانەی دونیا هەڵمان نەفریوێنێ و فێڵمان لێ نەکات، ئەو نیعمەتە گەورەیەمان لە دەست بدات!، پێنج و دوو رۆژێکی دونیا ژیانێکی هەتا هەتاییمان لە دەست نەدات!!.

## خۆشەویستەکانم، بەهەشت چۆنە؟:

ئەگەر کەسێك لە دونیادا بە هەموو هەوڵ و توانایەوە، بە هەموو شێوازێکی هەندەسییەوە، باشترین بینایە دروست بکات!، وە باشترین باخچە و مێوەجات لە دەوروبەری ئەو بینایە دروست بکات!، باشترین زراعەت و باشترین کانیاو و باشترین رووباری سەرزەوی و باشترین خزمەت و خزمەتکار و جوانترین ئافرەت و باشترین دەستەڵات و چاکترین پارە و سامانی لەژێر دەستدا بێت!!، ئەو

[112] الكتاب المصنف في الاحاديث والاثار، كتاب الصيام، باب: ماذكر في فضل الصحابة وثوابه، صفحة ٢٧١، رقم الحديث ٨٨٦٩

شوێنە رازاوەیە لە دونیادا دروست بكات!، ئینجا ناتوانێ بڵێ: شوێنێكم دروست كردووە كەمێك وە بەهەشت دەچێ!!!، دیارە بەهەشتی بەرین نایەتە حیساب و بەراورد (مُقارَنة)ی دونیا!، بەهەشتی بەرین بەهەشتی خوایە، خوای پەروەردگار نازونیعمەتی وای داناوە لە بەهەشتدا وەكو فەرمووی: (مالا عَينٌ رَأت وَلا أُذُنٌ سمِعَت وَلا خَطَرَ عَلى قَلبِ بشَر) واتە: نەچاو بینیویەتی!، نە گوێچكە بیستویەتی!، نە بە خەیاڵ و خەونیش بەسەر دڵی هیچ كەسێكدا هاتووە!!، خۆشەویستەكانم، خوای پەروەردگار لە سورەتی (الزُّمَر)دا دەفەرموێ: ﴿وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ﴾ ٧٣- الزمر، دەفەرموێ: لە مەیدانی مەحشەر دوای ئەوەی حیساب لەگەڵ عەبدەكان كرا، ئەوانەی مسوڵمان و خواپەرست بوون شەهادە و كتێبەكەیان بەدەستی راست وەرگرتەوە، ئەوانەی كە كافر بوون و (ساقِط) بوون كتێبەكەیان بە دەستە چەپ وەرگرتەوە، دوای ئەوەی كە جەهەننەمییەكان بەرەو دۆزەخ بەرێكران. وە بەهەشتییەكان بەرەو بەهەشت بەرێخران، دوای ئەوەی هەموو ئینسانەكان و جنۆكەكان بەسەر پردی (صِراط)دا رەت بوون، ئەوەی جەهەننەمی بوو كەوتە خوارەوە و ئەوەی بەهەشتی بوو پەڕیەوە ئەوبەر، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَرًا﴾ ئا لەوێ ئەوانەی خواپەرست و لە خواترس و پارێزكاربوون وەكو وەفد بەرێدەكرێن بەرەو بەهەشت، بەرلەوەی بگەنە لای دەرگاكانی بەهەشت دەرگاكانیان بۆ كراونەتەوە: ﴿وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا﴾، وەختێك كە دەگەنە ئەو شوێنە مەلائیكەتەكان پێشوازییان دەكەن: ﴿وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلامٌ عَلَيْكُمْ﴾: (مەلائیكەتەكان و دەرگاوانەكانی بەهەشت) پێیان دەڵێن: سلامٌ عَلَيْكُمْ سەلامی خواتان لێبیت، بەخێربێن!، بۆ (دارُالسَّلام) هاتوون چونكە بەهەشت (دارُالسَّلام: خانووی ئاشتی)یە، خانووێك كە هەرگیز شەڕی تێدا

نییە!، ئەو سەلامەی مەلائیکەتەکانیان ئاراستە دەکرێت، پاش ئەوەی دەچنە ژوورەوە ئینجا سەلامی خوای پەروەردگاریان ئاراستە دەکرێ: ﴿سَلامٌ قَوْلاً مِن رَّبٍّ رَّحِيمٍ﴾ ٥٨- يس، واتە: سەلام فەرموودەیەکە لەلایەن خواوە، خوا پێیان دەفەرموێ سەلامتان لێبێت بەخێربێن، وە پاش ئەوەی دێن بۆ خۆشیان لەناو بەهەشتدا هەر هەموویان سڵاو (تَحِيةٌ)و چاکوچۆنییەکەیان هەر سەلامە: ﴿تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلامٌ﴾ ٢٣- إبراهيم، سەلام لە بەهەشتدا لە یەکتری دەکەن و: ﴿لا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلا تَأْثِيمًا إِلا قِيلاً سَلامًا سَلامًا﴾ ٢٥، ٢٦- الواقعة، هیچ قسەی پڕوپووچ (لَغْو)ی تێدا نییە و نایبیستن، هەمووی هەر سەلام لە یەکتر کردنە و خۆشەویستییە!.

بەڵێ ئینجا ئەو کاتەی کە بەهەشتییەکان چونە بەهەشت وە دۆزەخییەکان چونە دۆزەخ خوای پەروەردگار ئەمر دەکات دەفەرموێ مردن بهێنن!، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ئەو مردنە لە نێوانی بەهەشت و دۆزەخدا سەری دەبڕن!، مردن سەر دەبڕدرێ یانی مردن نەما و ڕۆیشت!، مەلائیکەتەکان دەفەرموون (خُلودٌ بِلا مَوت، حَياةٌ بِلا مَوت)[113]: ئەی بەهەشتییەکان ئەوە ژیانە بەسەری بەرن بەبێ مردن، وە بە دۆزەخییەکانیش دەڵێن (خُلودٌ وحَياةٌ بِلا مَوت): ئەوەش ژیانێکی خۆتانە بەبێ مردن هەتا هەتایە، خوای گەورە دەربارەی ئینسانی کافر ئەفەرموێ: ﴿لا يَمُوتُ فِيهَا وَلا يَحْيَى﴾ ٧٤- طه، واتە: نە دەمرن و کۆتاییان پێ بێ، نە زیندووشن تێیدا واتە لەبەر ئازار و سزای دۆزەخ هەرچەندە زیندوون بەڵام تام و چێژ لە زیندووبوون ناکەن و وەك زیندوو نەبن وان!، ﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ ٦٥- الاحزاب: بە ئەبەدی تێیدا دەمێننەوە، جا خۆشەویستەکانم:

[113] حلية الاولياء، جزء ٨، صفحة ٨٤ للمؤلف أبو نعيم أحمد بن عبدالله الاصبهاني، دار الكتاب العربي- بيروت، الطبعة الرابعة، ١٤٠٥ هجري.

**ناوەکـانی بەهەشـت:** (دارُالـسَّلام[١١٤]، جَنَّـاتُ النَّعِـيم[١١٥]، فِـردَوس[١١٦] دارُالمَقام[١١٧]، المَقامُ الامين[١١٨]، مَقعدُ صِدق[١١٩]، جَنَّاتُ الخُلـد[١٢٠]، جَنّـاتُ عَـدن[١٢١]) ئەوانە هەمووی ناوەکانی بەهەشتن.

خۆشەویستەکانم، دیارە ئێمە نـاتوانین بەهەشـت وەسـف بکـەین وەك ئـەوەی عەقڵ و هەست و شعوری خۆمان بیهێنێتە بەرچاوی خۆی بەڵام هەندێك لـەژێر رۆشـــنایی ئایەتـــەکان و فـــەرموودەکانی پێغەمبـــەر ﷺ کـــەمێك لـــە نازونیعمەتەکانی بهێنینە بەرچاوی خۆمان بۆ ئـەوەی ئێمـە ئاگـاداربین و ئـەو نیعمەتانەمان لەبەرچاو بێت.

**بەهەشت چەند دەرگای هەیە؟:** پێغەمبـەر ﷺ ئەفـەرموێ: (إنَّ لِلجَنَّـة ثَمانِيَةُ أبْواب)[١٢٢] واتە: بەهەشت هەشت دەرگای هەیـە، دۆزەخ حـەوت دەرگـای هەیە بـەڵام بەهەشـت هەشـت دەرگـای هەیـە، دەرگاکـانی چـەندە گـەورەن؟ پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ لە فەرموودەیەکدا: (مابَينَ مِصراعَينِ في الجَنَّـة كمَـسيرَةَ أربَعينَ سَنة)[١٢٣] دەفەرموێ: لە نێوانی هەر لاچێوەیەکی دەرگایەکی بەهەشت بۆ

---

[١١٤] ((لَهُمْ دَارُ السَّلامِ عِندَ رَبِّهِمْ وَهُوَ وَلِيُّهُمْ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ)) ١٢٧- الانعام.

((إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ جَنَّاتُ النَّعِيمِ)) ٨- لقمان.

[١١٦] ((الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ)) ١١- المؤمنون.

[١١٧] ((الَّذِي أَحَلَّنَا دَارَ الْمُقَامَةِ مِن فَضْلِهِ لا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ)) ٣٥- فاطر.

[١١٨] ((إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ)) ٥١- الدخان.

[١١٩] ((فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ)) ٥٥- القمر.

[١٢٠] ((قُلْ أَذَلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ الْخُلْدِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ كَانَتْ لَهُمْ جَزَاء وَمَصِيرًا)) ١٥- الفرقان.

[١٢١] ((جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الانْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ جَزَاء مَن تَزَكَّى)) ٧٦- طه.

[١٢٢] مسند إمام أحمد، جزء ٤، صفحة ٣٨٦، رقم الحديث ١٩٤٥٦.

[١٢٣] ((وعن رسول الله صلى الله عليه وسلم انه قال ما بـين مصراعين في الجنة كمسيرة أربعين سنة)) مسند إمام أحمد، جزء٤، صفحة ١٧٤، رقم الحديث ١٧٦١١.

ئەویتریان (فراوانی دەرگاكان) ڕێگای چل ساڵ ڕێیە!، ئەوەندە دەرگاكانی بەهەشت گەورەن چونكە بەهەشتەكە زۆر گەورەیە!، هەشت دەرگای هەیە!، بەڵێ خۆشەویستەكانم ئەوە دەرگاكانی بەهەشتە.

**ئەو بەهەشتە چەندە گەورەیە؟!:** جێگای چەندەها كەسی تێدا دەبێتەوە هەر لە ئادەمەوە هەتا خاتەم وە هەتا كۆتاهەمین كەس كە لەسەر ئەو دونیایەدا دەژی..!، جارێ پێش هەموو شتێك با بزانین كە یەكەم كەس كە دەرگای بەهەشت دەكاتەوە پێغەمبەمان موحەممەدە ﷺ!، وەكو دەفەرموێ: (أنَا أوَّلُ مَن يَقرَعُ بَابَ الجَنَّة)[١٢٤] واتە: من یەكەم كەسم لە دەرگای بەهەشت دەدەم!، (أما إنك يا أبابَكر أوَّلُ من يَدخُل الجَنَّةَ مِن أُمَّتي)[١٢٥] ئەفەرموێ: ئەی ئەبوبەكر تۆ یەكەم كەسی لە ئومەتی من لە دەرگای بەهەشت دەچیتە ژوورەوە دوای پێغەمبەران!، ئەوە نازونیعمەتی دەرگاكانی بەهەشتە جارێ هێشتا نەچوینە ژوورەوە!، با لەدەرگای بەهەشت بچینە ژوورەوە تەماشا بكەین بەڵام بەرلەوەی كە ئێمە تەماشای نازونیعمەتەكان بكەین بائەود بزانین كە ئایا كلیلی دەرگای بەهەشت چییە؟، وەكو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مِفتاح الجَنَّةِ شَهادَةُ أن لاإلَه

---

[١٢٤] ((وحدثنا أبو كريب محمد بن العلاء حدثنا معاوية بن هشام عن سفيان عن مختار بن فلفل عن أنس بن مالك قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم أنا أكثر الانبياء تبعا يوم القيامة وأنا أول من يقرع باب الجنة))، صحيح مسلم، كتاب الايمان، باب: قول النبي أنا أول الناس يشفع في الجنة، صفحة ١٤١، رقم الحديث ٣٣١.

[١٢٥] ((حدثنا هناد بن السري عن عبد الرحمن بن محمد المحاربي عن عبد السلام بن حرب عن أبي خالد الدالاني عن أبي خالد مولى آل جعدة عن أبي هريرة قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم أتاني جبريل فأخذ بيدي فأراني باب الجنة الذي تدخل منه أمتي فقال أبو بكر يا رسول الله وددت أني كنت معك حتى أنظر إليه فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم أما إنك يا أبا بكر أول من يدخل الجنة من أمتي))، سنن أبي داود، كتاب السنة، باب: في الخلفاء، رقم الحديث٤٦٥٢، صفحة ٦٩٨

إلا الله)[١٢٦] واتە: کلیلی دەرگای بەهەشت بریتییە لە شاهێدیدان کە هیچ پەرستراو نین شایەنی پەرستن بێ جگە لە (الله)، وتنی (لاإلـە إلا الله) کلیلی بەهەشتە، ئەوانەی کە لە دونیادا گوتویانە (لاإلـە إلا الله) ئەوانە دەچن بۆ بەهەشت، ئەوانەی کە قەناعەتیان بە (لا إلـە إلا الله) هەبووە، ئەوانەی لە پێناویدا ژیاون و مردوون، ئەوانەی بۆ خزمەتی (لا إلـە إلا الله) هەوڵیانداوە، ئەوانەی کە زمانیان بە ویردی (لا إلـە إلا الله) پاراوبووە، ئەوانەی کە لەکاتی ساغی و نەخۆشی و دەوڵەمەندی و فەقیریدا (لا إلە إلا الله)یان لەبیر نەچووە، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە (لا إلـە إلا الله) دەرگای بەهەشت دەکاتەوە و ئەوانەی کە نەیانگوتووە (لا إلە إلا الله)، وە ئیعتیقادیان پێی نەبووە، خزمەتی دینیان نەکردووە ئەوانە ناتوانن بچنە ئەو بەهەشتە چونکە ئەو کلیلەیان پێ نەبێت ناتوانن بچنە ژوورەوە!، بەڵێ خۆشەویستەکانم ئەو بەهەشتە چەندە گەورەیە!، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَسَارِعُواْ إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأرْضُ﴾ ١٣٣- آل عمران، واتە: تاڵۆکە بکەن بۆ لێخۆشبوونی (مغْفرَةٍ) لای خوا وە بەهەشتێك کە بەرینایيەکەی بە قەدەر ئاسمانەکان و زەوییە!، ئێمە لە وتارێکی رابردوودا باسی بەرینایی ئاسمانەکانمان کرد، ئەو ئاسمانانەی کە وەکو زانایان ئێستا بۆیان روون بۆتەوە[١٢٧]، دەڵێن: پێنج سەد

---

[١٢٦] صحيح البخاري، كتاب الجنائز، باب: في الجنائز ومن كان أخر كلامه لا اله الا الله.

[١٢٧] زانایانی گەردوونناس دەڵێن: لانی کەم بەسەدان ملیۆن کەهکەشان کە رێژەکەی لە سەرووی ٢٠٠ ملیۆنەوە دادەنێن لەم بونەوەرەدا هەیە، تیرەی چەقی کەهکەشانیش بە نزیککراوەیی دەکاتە ١٠ (ملیۆن ملیۆن ملیۆن) کم، بۆ وێنە سەدیی (المرأة المتسلسلة) نزیکەی ٢٠٠٠٠٠٠ (دوو ملیۆن) ساڵی رووناکی لە کەهکەشانی ئێمەوە دوورە، لە کاتێکدا کە یەك ساڵی رووناکی دەکاتە ٦ ملیۆن ملیۆن میل، وە کەهکەشانی خۆشمان ٣٠ ملیار ئەستێرەی تێدایە!، وە بە رێژەیەکی وا فراوانە کە دووسەد ملیۆن ساڵی رووناکی دەوێت تا بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە!، کۆمەڵەی خۆر کە خۆ.رو نۆ هەسارەکەی و مانگەکانی دەگرێتەوە بەشێکە لەم کەهکەشانە گەورەیە و تیرەکەی (دوانزە هەزار ملیۆن) کم دەبیت و ٣٠ هەزار ساڵی رووناکی لە=

هەزار مەجەڕڕە (كەهكەشان) لـە ئاسمانەكانـدا هەیـە!، هـەر مـەجەڕەیـەك بـە مەلایین و ملیار ئەسـتێرەی تێـدا هەیـە!، ئەسـتێرەی وا هەیـە چـەندجار لـەو زەوییەی ئێمە گەورەترە!، ئەستێرەی ڕەونەقداری وا هەیە تیشكی بەڕێوەیە كـە لەو كاتەوەی خوا دروستیكردووە هەتا ئێـستاش تیـشكەكەی نەگەیـشتووە بـە ئێمە!!!، ئەوە هەر ئاسمانی دونیایە ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّـا الـسَّمَاءَ الـدُّنْيَا بِمَـصَابِيحَ﴾ ٥- الملك، ئەی هەر حەوت ئاسمانەكان؟!!، جا بەرینایی بەهەشت بە قەدەر هـەموو ئاسمانەكان و زەوییە دەبێ درێژاییەكەی چۆن بێ؟!!.

بەڵێ ئەوە گەورەیی بەهەشت، ئینجا حەزرەتی موسا پرسیاری كرد لە خـوای پەروەردگار و فەرمووی: یاڕەببی گەورەترین شـوێنی بەهەشـت و نازونیعمـەتی بەهەشت كامەیە؟، وە نزمترین شوێنی بەهەشـت یـاخود لـە خـوارترین پلـەی بەهەشـت كامـەیـە؟، خـوای پـەروەردگار وەڵامـی دایـەوە كـە لـە بەهەشـتدا نازونیعمەت و شوێنی وا ئامادەكراوە كە كـەس نـەیبینیوە!، چـاو نـەیبینیوە، گوێـچكە نەیبیـستووە، بەخـەون و خـەیاڵیش بەسـەر دڵـی هـیچ كەسـێكدا نەهاتووە، خوا لە قورئاندا دەفەرمووێ: ﴿فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾ ١٧- السجدة، واتـە: هـیچ نەفـسێك نازانـێ چـی بـۆ ئامـادەكراوە!، ئەوەندە نازونیعمەتی گەورە ئامادەكراوە هیچ كەسێ نازانێ!، ئینجا فەرمووی: (أعدَدتُ لِعِبادِي الصَّالِحين مالا عَينٌ رَأت وَلا أُذُنٌ سمِعَت وَلا خَطَر عَلى قَلبِ بَشَر): ئامادەمكردووە بۆ عەبدە صاڵحەكانی خۆم نازونیعمـەتی وا كـە نەچـاو بینیویەتی!، وە نەگوێ بیستوویەتی!، نـە بـە دڵـی هـیچ كەسیـشدا هـاتووە!،

---

= چەقی كەهكەشانەكەوە دوورە، خۆریش ١٥٠ (سەدو پەنجا ملیۆن) كم لەم زەویەی كە تێیدا دەژین دوورە.

بڕوانە: - (خواناسیی ئاین ئیمان) م. علی باپیر لا ١٣٣ و١٣٤ و ١٤١.

- (داستانی ئیمان) شێخ ندیم الجسر لا ٣٢٣ و ٣٣٤.

- (السماء في القران الكريم) زغلول النجار/ نجم المجرات، ص ٢٨٦.

فـەرمووی ئـەدی نزمترینیـان كوێیـە؟، فـەرمووی: نزمترینیـان -وەكـو لـە فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺ هاتووە كە ئیمامی موسلیم ریوایەتی دەكـات-: كۆتاهەمین كەس كە لە جەهەننەم دێتە دەردوە، دیارە ئـەوەی كـە ئیمانـداربێ بەڵام گوناهی كردبێ دەچێتە جەهەننەم ئەگەر خوا رەحمی پێنەكات و عـەفووی نەكات، بە ئەندازەی گوناهەكانی لە جەهەننەمدا دەسوتێ ئینجا دێتـە دەرێ و دەچێتە بەهەشت، وەكو پێغەمبەر دەفەرموێ: (أخرِجوا مِن النَّار مَن قالَ لا إلهَ إلا اللهُ وَكانَ في قَلبِه مِن الخَيرِ مَا يـزن ذَرَّةً)[١٢٨] واتە: لە ئاگری جەهەننەمێ دێتە دەرێ كەسێك كە باوەڕی بە خوا هەبووبێ بە قـەدەر میـسقاڵە زەرەیـەك!، جـا چەند ساڵ لە جەهەننەمێدا دەمێنێتەوە ئەوە خوا دەزانـێ!، بـەڵام ئـاخیر جـار دێتە دەرێ مـادام كـافر نـەبووە چـونكە كـافر بـە ئەبـەدی لـە جەهەننـەمێ دەمێنێتەوە، بەڵام ئیماندار دێتە دەرێ رۆژێك لە رۆژان، كۆتاهەمین كـەس لـە ئەهلی بەهەشت كە لە جەهننەم دێتە دەردوە بەردو بەهەشت دەڕوا[١٢٩] هـەموو

[١٢٨] ((حدثنا محمود بن غيلان حدثنا أبو داود حدثنا شعبة وهشام عن قتادة عن أنس أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال يخرج من النار وقال شعبة اخرجوا من النار من قال لا إله إلا الله وكان في قلبه من الخير ما يزن شعيرة أخرجوا من النار من قال لا إله إلا الله وكان في قلبه من الخير ما يزن برة أخرجوا من النار من قال لا إله إلا الله وكان في قلبه من الخير ما يزن ذرة وقال شعبة ما يزن ذرة مخففة وفي الباب عن جابر وأبي سعيد وعمران بن حصين))، سنن الترمذي، كتاب البر والصلة، باب: ماجاء في الكبر، رقم الحديث ١٩٩٩

[١٢٩] ((حدثنا عثمان بن أبي شيبة وإسحاق بن إبراهيم الحنظلي كلاهما عن جرير قال عثمان حدثنا جرير عن منصور عن إبراهيم عن عبيدة عن عبد الله بن مسعود قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم إني لاعلم آخر أهل النار خروجا منها وآخر أهل الجنة دخولا الجنة رجل يخرج من النار حبوا يقول الله تبارك وتعالى له اذهب فادخل الجنة فيأتيها فيخيل إليه أنها ملأى فيرجع فيقول يا رب وجدتها ملأى فيقول الله تبارك وتعالى له اذهب فادخل الجنة قال فيأتيها فيخيل إليه أنها ملأى فيرجع فيقول يا رب وجدتها ملأى فيقول الله له اذهب فادخل الجنة فإن لك مثل الدنيا وعشرة أمثالها أو إن لك عشرة أمثال الدنيا قال فيقول أتسخر بي أو أتضحك بي وأنت الملك قال لقد رأيت رسول الله صلى الله عليه وسلم ضحك حتى بدت نواجذه قال فكان يقال ذاك أدنى أهل الجنة منزلة))، صحيح مسلم، كتاب الايمان، باب: أدنى أهل الجنة منزلة، رقم الحديث ٣١١، صفحة ١٣٥.

لاشـەی رزیـوە و رەش بـووە، خـوای گـەورە کانیـاوێکی پیـشان دەدات، ئـەو ئینسانە دەڵێت: یارەببی ئیجازەم بدە لەو کانیاوە ئاو بخۆمەوە و خۆم بـشۆم..، خوا دەفەرمویٚ: ئایا ئەگەر بێیە ئەو شوێنە داوای شوێنی تر ناکـەی؟، ئـەویش دەفەرمویٚ یارەببی وەعد بێت داوای هیچ شوێنی تر ناکـەم!، دێتـە سـەر ئـەو کانیاوە ئاو دەخواتەوە و خۆی دەشوات لاشەی چاك دەبێتـەوە، ئـەوجار خـوای گەورە دارێکی سەوز و بە سێبەری پیشان دەدات ئەو کەسە دەفەرمویٚ: خوایـە گیان ئیجـازەم بـدە بـێم لـەژێر سـێبەری ئـەو دارە ئیـسراحەت بکـەم!، خـوا دەفەرمویٚ: ئەی عەبدی من ئەی وەعدت نەدابوو؟! داوای شوێنێکی تر ناکـەی بتهێنمە ئەویٚ؟، دەڵیٚ: یارەببی وەعدبیٚ داوای هیچ شوێنی تر ناکەم بەس بمبـە ژێر ئەو دارە!، دەچێتە ژێر ئەو دارە دوایی ئیسراحەت دەکات و خـوای گـەورە باخچەیەکی نیشان دەدات مێوەجاتی هەیە!، ئـەو کەسـە دەڵـیٚ: ئـەی خوایـە رێگام بدە زۆر برسیمە بچمە ناو ئەو باخچەیە، خوای گـەورە دەفـەرمویٚ: ئایـا داوای شوێنێکی تر ناکەی ئەگەر بچیتە ئەویٚ؟، ئەویش دەڵیٚ: نەخێر یارەببی!، ئینجا خوای گەورە بەهەشتی نیشان دەدات ئەویش دەڵیٚ: خوایە گیان بمخە ناو بەهەشـت!، ئـەو ئینـسانە خۆزگـە و ئـاوات (طُمـوح)ی هەیـە و خـوای پەروەردگاریش تەبیعـەتی عەبـدی خـۆی دەناسـیٚ، پـێش ئـەودی بـچێتە نـاو بەهەشت خوا پێی دەفەرمویٚ: ئـەی عەبـدی مـن دونیـا چـەندە گـەورە بـوو!! ناتەویٚ بە قـەدەر دونیـاو دوو ئەوەنـدەش لـە بەهەشـتدا بتـدەمیٚ؟!، ئـەویش دەفـەرمویٚ (یـارَبِّي أَتَـستَهزيءُ بِـي؟): ئـەی خوایـەگیان گاڵتـەم پێدەکـەی؟!، وائەزانیٚ بەشی ئەو لە بەهەشت نەماوە و هەمووی تەوزیع کراوە!، ئینجا خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ: وەرە ئەوەندەی دونیا و دوو ئەوەندی دونیـا بـا بـۆ تـۆ بێت!، ئەوە نازونیعمەتی خوایە بۆ کۆتاهەمین کـەس کـە دیٚ بـۆ بەهەشـت!!، دەبیٚ ئەوانەی کە لەسەرەتادا چوون بۆ بەهەشت نازونیعمەتەکەیان چۆن بـیٚ؟!!، جا ئەوە گەورەیی بەهەشـتە کـە گوتمـان بەقـەدەر ئاسمانـەکان و زەوییـە بۆیـە

عەجایب نییە کە گچکەترین شوێنی بە قەدەر ئەوە بێ کە دەیداتە ئەو عەبدەی خۆی!.

## خۆشەویستەکانی خۆم، با تەماشای بەهەشت بکەین!، خاکەکەی بەهەشت:

وەکو پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئەفەرموێ: خاکەکەی بەهەشت لە میسکە!، ئیمامی بوخاری ریوایەت دەکات لە فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من چووم بۆ بەهەشت تەماشام کرد خاك و خۆڵەکەی میسکە (وَإِذا تُرابُها مسكٌ)[130]، کەواتە ئەرزی بەهەشت لە میسکە کە بۆنی لە هەموو شتێك خۆشترە و میسکی بەهەشتیش لەگەڵ میسکی دونیا قیاس ناکرێ لە بۆن و پاکیدا!.

بەڵێ خۆشەویستەکانم، رووبارەکانی بەهەشت: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿مثلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِد الْمُتَّقُون﴾ ١٥- محمد: ئەو بەهەشتەی کە وەعد دراوە بە لە خوا ترسان، ﴿فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاء غَيْرِ آسِنٍ﴾ ١٥- محمد: چەند رووبارێکی تێدایە لە ئاو کە ئاوەکە خراپ و ناخۆش نییە و ئاوێکی صاف و سازگار!!، ﴿وَأَنْهَارٌ مِن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ﴾ ١٥- محمد: چەند رووبارێك لە شیر کە تامی نەگۆڕاوە و ناگۆڕێ، شیری سپی و سازگار و پاك و خاوێن!!، ﴿وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ﴾ ١٥- محمد: چەند رووبار لە خەمری پاکی بەلەزەت بۆ بەهەشتییەکان، لەو ﴿شَرَابًا طَهُورًا﴾[131]ی کە خوای پەروەردگار ئامادەیکردووە نەك وەك ئەو شەرابە پیسەی کە لە دونیادا ئینسان دروستی دەکات!، دەبێ

---

[130] الابانة لابن بطة، إبانة عن شريعة الفرقة الناجية ومجانبة الفرق المذمومة، تحقيق دكتور عثمان عبدالله أدم، جزء ٣، صفحة ٨٢، دار الراية- الرياض، الطبعة الثانية، ١٤١٨ هجري.

[131] وەکو خوای پەروەردگار (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: «وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا» ٢١- الانسان.

ئەو ﴿شَرَابًا طَهُورًا﴾ی كە خوای پەروەردگار دروستیكردووە لە بەهەشتدا چۆن بێ؟!!، جا نەك رووبارێك (وَأَنْهَارٌ): چەند رووبار!!، ﴿وَأَنْهَارٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى﴾ ١٥- محمد: -چوارەمین جۆری رووبار- چەند رووبارێك لە هەنگوینە!، هەنگوینی پاككراوە، هەنگوینێك كە هەنگوینی صافە..، ئەوەی كە ئینسان لە دونیادا خواردوویەتی نموونەی هەنگوینە بەلاّم هەنگوینی بەهەشت زۆر بەلەزەتترە و خۆشیەكەی بە خەیاڵی ئینساندا نایە؟!!.

**خۆشەویستەكانم، رووباری كەوسەر:** هەموومان رووبار و كانیاوی كەوسەرمان بیستووە!، خوای پەروەردگار ئەفەرموێ ﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ﴾ ١- الكوثر: ئێمە كەوسەرمان داوە بە تۆ ئەی موحەممەد ﷺ، دەبێ چۆن بێ؟: پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (الكَوثَرُ نَهر فِي الجَنَّة، حَافَتَاهُ مِن ذَهَب، وَمَجراهُ على الدُّرِّ وَاليَاقُوت، تُربَتُهُ أَطيَبُ مِنَ المِسك، وَمَاؤُهُ أَحلَى مِنَ العَسَل وَأَبيَضُ مِنَ الثَّلج)[١٣٢] ئیمامی (تُرمذي) ریوایەتی كردووە ئەو فەرموودەیە، ئەفەرموێ: كەوسەر روبارێكە لە بەهەشت لێوارەكانی لە زێڕن!، ناوەڕاستەكەی لە یاقوت و مەرجانە لە مرواریییە!، خۆڵەكەی ئەو رووبارە بۆنخۆشتر و پاكترە لە میسك!، ئاوەكەی شیرینترە لە هەنگوین!، سپی ترە لە بەفر!، جا دەبێ ئەو رووبارە چۆن بێ!!، ئەو رووبارەی كە پێغەمبەر ﷺ لەسەر سەروچاوەكەی دائەنیشێ، ئوممەتەكەی ریز دەبن و دێن ئاوی لێ دەخۆنەوە، هەیانە بە دەستی خۆی ئاو دەخواتەوە، هەیانە بەدەستی پێغەمبەر ﷺ ئاو دەخواتەوە!، یاڕەببی خوایە لەو كەسانەمان حیساب بكەی كە بە دەستی پێغەمبەر ﷺ ئاو دەخۆنەوە لەسەر حەوزی كەوسەر (یارَبَّ العالَمين).

---

[١٣٢] ((حدثنا هناد حدثنا محمد بن فضيل عن عطاء بن السائب عن محارب بن دثار عن عبد الله بن عمر قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم الكوثر نهر في الجنة حافتاه من ذهب ومجراه على الدر والياقوت تربته أطيب من المسك وماؤه أحلى من العسل وأبيض من الثلج قال هذا حديث حسن))، سنن الترمذي، كتاب تفسير القرآن، باب: سورة الكوثر، رقم الحديث ٣٣٦١.

**درەخت و باغەكانی بەهەشت:** خوای پەروەردگار دەفەرموێ ﴿وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ﴾ ٢٧- الواقعة، ئەفەرموێ: هاوەڵان و برادەرانی دەستە راست، ئەوانەی كە بەدەستە راستەوە كتێبیان وەرگرتۆتەوە و بە دەستە راستەوە بەڕێكراون بۆ بەهەشت، (أَصْحَابُ الْيَمِينِ) كێن؟، هاوەڵانی دەستە راست دێن بۆ بەهەشت: ﴿فِي سِدْرٍ مَّخْضُودٍ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ﴾ ٢٨، ٣٠- الواقعة، ئەفەرموێ: دێن لەژێر سێبەری داری بێ دڕكاوی و نەرمونیان، داری جوان و قەشەنگ و رازاوە ئیسراحەت ئەكەن!، لەژێر سێبەری دارمۆزی بەهێشوو!، نەك ئەو مۆزەی كە ئێمە لە دونیا دەیخۆین بەڵكو مۆزی تایبەت، ﴿وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ﴾: كە هێشوویان هاتۆتە خوارەوە!، خوای پەروەردگار ئامادەیكردووە، ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ﴾: وە سێبەری بەردەوام!، هەرگیز سێبەری بەهەشت نابڕێت!!، لە فەرموودەیەكدا هاتووە كە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: خوای گەورە داری وای ئامادەكردووە لە بەهەشتدا ئەگەر سەد ساڵ سوار لەژێر سێبەری بڕوات هێشتا تەواو نابێ!!، بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أُكُلُهَا دَآئِمٌ وِظِلُّهَا﴾ ٣٥- الرعد: خواردنەكەی هەمیشە بەردەوامە و سێبەرەكەشی هەمیشە بەردەوامە.

**بەڵێ خۆشەویستەكانم، میوەی بەهەشت:** میوەكانی بەهەشت بەیەكدەچن بەڵام هەموویان تامیان جیاوازە!، خوای پەروەردگار دەفەرموێ ﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقاً قَالُواْ هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ وَأُتُواْ بِهِ مُتَشَابِهاً﴾ ٢٥- البقرة، واتە: هەركاتێ كە بەهەشتییەكان میوەیەكیان بۆ هات دەڵێن: ئەو میوەیە ئەوە بوو كە پێش ئێستا خواردمان، وەختێك كە تەماشای دەكەن هەر ئەوەیە كە تازە خواردوویانە بەڵام كە تامی دەكەن دەزانن كە ئەوە میوەیەكی ترە!، ئەوەی كە خوای گەورە ئامادەیكردووە لە میوەكانی بەهەشت لە ژمار نایەن!!، ﴿وَفَاكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ﴾ ٢٠- الواقعة: ئەو میوەجاتەی كە

خۆیان هەڵیدەبژێرن لەوەی کە حەزیان لێی بێت، ﴿وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ﴾ ٢١- الواقعة: گۆشتی تەیر لەوەی ئیشتیهای دەکەن!، لە دونیـادا ئینسان زۆر حەزی لە گۆشتی تەیرە!!، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار بـە تـەنها لـە قورئـانی پیرۆز باسی گۆشـتی تـەیری کـردووە لـە بەهەشـت!، (وَلَحْمِ طَيْرٍ): ئینجـا چ تەیرێکیش؟ (مِّمَّا يَشْتَهونَ): لەو تەیرانەی کە خۆیان حەزیان لێیەتی!.

**بـەڵێ خۆشەویـستەکانم، ئینجـا قەسـرەکانی بەهەشـت:** خـوای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی (عليه الصلاة والسلام) باسی بینایەی بەهەشـتمان بـۆ دەکەن، خوا لە قورئان دەفەرموێ: ﴿غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ﴾ ٢٠- الزمر: غورفە لەسەر غورفە، واتە بینایەی چەند قات لەسەر یـەك!!، پێغەمبـەر (عليه الصلاة والسلام) ئەفـەرموێ: (يـرَى مِـن ظَاهِرِهـا باطِنها ومـن باطِنِهـا ظَاهِرهـا) ئەفەرموێ: لە ژووری بی دەرێت لێ دیارە وە لە دەرێ بیت ژوورێت لێ دیـارە!، ئاوایە.. وەنەبێ لەناو ژوورەکە دانیشتبیت و هەتا نێیتە دەرەوە دەرێت لێ دیار نەبێ، لە ژوورەوە دەرێت لێ دیارە وە لە دەرەوە ناو ژوورەکەت لێ دیارە، ئەوە نازونیعمەتی بەهەشتە!!.

**خۆشەویـستەکانم: چـەند رووبـار کـە لـەژێر قەسـرەکانەوە دێـت:** ﴿جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الانْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ ٥٧- النساء، رووبار بەلای قەسرەکانەوە و لەژێر باخـچەکاندا!، بـە شـێوەیەکی بـەرز خـوای پـەروەردگار رازاندوویەتییەوە، ﴿فِي جَنَّةٍ عَالِيَـةٍ﴾ ٢٢- الحاقـة: بەهەشـتەکان زۆر بـەرزن!!، ﴿قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ﴾ ٢٣- الحاقة: مێوەجاتەکە بۆ خۆی دێتە بەردەست، پێویـست بەوە ناکات حەبل لە خۆت ببەستی و بچیتە سەر دارەکە، یاخود پلیکانەی بـۆ دابنێیت و بچیە سەر دارەکە، بـەڵکو هـەر کاتـێ ئیـشتیهات کـرد: ﴿قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ﴾ ٢٣- الحاقة: مێوە جاتەکە بۆ خۆی دێتـە بەردەسـت و نزیکـە دەسـتن،

ئینجا مەلائیکەتەکانیش دەفەرموون: ﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الأيَّامِ الْخَالِيَةِ﴾ ٢٤- الحاقة، واتە: بخۆن و بخۆنەوە عافیێتی گیانتان بیّ، ئەوە پاداشتی ئەو کردەوە و ماندووبونەیە کە لە دونیا کردووتانە.

**حۆرییەکانی بەهەشت:** خوا ئەفەرمویّ: ﴿وَحُورٌ عِينٌ كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ﴾ ٢٢، ٢٣- الواقعة، واتە: حۆری چاوگەش وەکو مرواری ناو سەدەف وایە، شاراوە!!، کەس نەیبینیون هێشتا ﴿حُورٌ مَّقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ﴾ ٧٢- الرحمن، واتە: ئەو حۆرییانە لەناو خێمەکان و شوێنی تایبەتی دان نەزەری هیچ کەسیان نەکردووە و هیچ کەس چاوی پیّ نەکەوتوون!، ﴿لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنس قَبْلَهُمْ وَلا جَانٌّ﴾ ٧٤- الرحمن: ئەو حۆرییانەی کە دێن بۆ لایان نەکەس چاوی پێیان کەوتووە، نەکەس نەزەری ئەوانەی کردووە و نەکەسیش دەستی لێداون نە ئینس و نە جن!، بەڵیّ خۆشەویستەکانم: پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمویّ: (لِلرَّجُلِ مِن أهلِ الجَنَّة زَوجَتانِ من حُورِالعين)[١٣٣] واتە: هەر پیاوێك کە دەچێتە بەهەشت دوو حۆری دەدرێنیّ (عَلَى كلِّ واحِدَةٍ سبعونَ حُلَّة) واتە: ئەو حۆرییە چاو گەشانە هەر یەکێکیان حەفتا جلی لەبەردایە!، (يرى مُخُّ ساقِهِما مِن وراءِ الثِّياب) واتە: لەسەر ئەو حەفتا جلە ناوەڕۆکی ئێسکی قاچەکانیان تێدا دیارە!، یانی ئەو جلانە نەبونەتە مانیعی ئەوەی کە ناوەڕۆکی ئەو ئافرەتەی تێدا دیاربیّ!، ئەو حۆرییە جوان و چاوگەشانەی کە خوای پەروەردگار ئامادەی کردوون بۆ مێردەکانیان پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) ئاوا وەسفیان دەکات!!.

**خزمەتکارەکانی بەهەشت:** ﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ﴾ ١٧، ١٨- الواقعة، هەر کەسیّ بێجگە لە قەسر و

---

[١٣٣] ((عن محمد بن سيرين عن أبي هريرة عن النبي صلى الله عليه وسلم قال للرجل من أهل الجنة زوجتان من حور العين على كل واحدة سبعون حلة يرى مخ ساقها من وراء الثياب))، مسند إمام أحمد، جزء ٢، صفحة ٣٤٥، رقم الحديث ٨٥٢٣.

بـاغ و رووبارەکـان، بێجگـە لـە نازونیعمەتـەکان بەگـشتی، بێجگـە لـە خواردەمەنییەکان و حۆرییەکان و ئافرەتانی تر...، خزمەتکارانی زۆریان لـەژێر دەستن، ئەو منداڵانەی کە خزمەتیان دەکەن لە بەهەشتدا، ﴿وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ﴾: ئەو منداڵانەی کە هەمیشە دەمێنن و نامرن و لـەوێ بـە ئەبـەدی خزمـەتیان دەکەن!، لە خزمـەتی ئـەو بەهەشـتییانە دان، ﴿بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ﴾: خزمەتیان دەکەن بە هەموو خواردنەوە و خواردنێك، (كَأْس)یان پێیـە و بـەردەوام لـە دەوروبـەریان دەگـەڕێن و دێـن و دەچـن، لـە کاتێکـدا کـە بەهەشتییەکان: ﴿مُتَّكِئِينَ عَلَى رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ﴾[١٣٤] ٧٦- الرحمن.

بەڵێ دوای ئـەوەی کـە بـە هـەموو نیعمەتـەکان شـاد دەبـن خـوای گـەورە دەفەرموێ: ئەی عەبدەکانی من، ئـەی بەهەشـتییەکان چـی دیکـەتان دەوێ؟! ئەوان دەڵێن: یارەببی جا چ مـاوە بماندەیتێ؟!! لـەو هـەموو نیعمەتـە زیـاتر چیتر؟!!، چاومان تێربوو، هەموو شتمان وەرگرتووە، قەسرمان دەوێ! خواردن و خواردنـەوەمان دەوێ! رووبـار و کانیمـان دەوێ! باخـچە و بێـستانمان دەوێ! مێوەجاتمـان دەوێ! حۆریـان دەوێ! ئـافرەتی ترمـان دەوێ! خزمـەتکارمان دەوێ!..هەمووشتمان هەیە!!، چ ماوە بماندەیتێ یارب العالمین.

**ئینجا خوای پەروەردگار پەردەی نێـوانی خـۆی و عەبـدەکانی لائـەدات و هەموو عەبدەکان تەماشـای ربُ العـالمین دەکـەن!!**، پێغەمبـەر (علیه الصلاة والسلام) ئەفەرموێ: کە ئەو حیجابە لـە نێـوان خـودا و عەبـدەکان لادەچـێ لـە بەهەشتدا ئەو عەبدانە تەماشای ربُ العالمین دەکەن هـەرگیز لێـی تێـر نـابن و چاوی لێ وەرناگێڕن!، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ ٢٢، ٢٣- القیامـة، واتـە: لـە رۆژی قیامەتـدا هێنـدێك

---

[١٣٤] واتە: شانیان داداوە لەسەر پشتی سەوزباوی جوان و دۆشەکی نایاب و ڕازاوە.

دەموچاوی گەشدار و رازاوە هەن تەماشای ئەو خوایەی خۆیان دەکەن لە بەهەشتدا، وەکو پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (إِنَّكُم سَتَرَونَ رَبَّكُم في الجَنَّةِ كَما تَرَونَ هذا القَمَر)[135] ئاماژەی بۆ مانگی چواردە کرد و فەرمووی: ئێوە هەمووتان خوا دەبینن لە بەهەشتدا وەکو سەیری مانگی چواردە دەکەن!.

**بەڵێ خۆشەویستەکانم، دوای ئەوە با بزانین بەهەشتییەکان چۆنن و چ دەکەن؟**: پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە وەسفی بەهەشتییەکان لە فەرموودەیەکدا ئەفەرموێ: (أَبناءُ ثَلاثٍ وَثَلاثينَ هُم عَلى خَلقِ آدَم)[136] واتە: ئەوانە لە تەمەنی سی و سێ ساڵی دان!، وە ئەوانە لەسەر شێوازی حەزرەتی (ئادەم)ن، (سِتُّونَ ذِراعًا): حەزرەتی ئادەم شەست باسك درێژە!، حەزرەتی ئادەم کە چۆن خوای پەروەردگار خەڵقی کردووە و کاتی خۆی لەسەر دونیای داناوە، هەموو ئینسانەکان دەگەڕێنەوە سەر ئەو شێواز و تەمەنە بە پیاو و ئافرەتەوە!، (في عرضِ سبعَةَ أَذرُع): حەوت باسکیش ئەو ئینسانە ئەستوور و پانە!، دەبێ ئەو ئینسانە چۆن بێ لە بەهەشتدا؟!!، وە ئەو بەهەشتە نیعمەتەکانی چەندە

[135] ((حدثنا الحميدي قال حدثنا مروان بن معاوية قال حدثنا إسماعيل عن قيس عن جرير قال ثم كنا ثم النبي صلى الله عليه وسلم فنظر إلى القمر ليلة يعني البدر فقال إنكم سترون ربكم كما ترون هذا القمر لا تضامون في رؤيته فإن استطعتم أن لا تغلبوا على صلاة قبل طلوع الشمس وقبل غروبها فافعلوا ثم قرأ وسبح بحمد ربك قبل طلوع الشمس وقبل الغروب قال إسماعيل افعلوا لا تفوتنكم))، صحيح البخاري، كتاب مواقيت الصلاة، باب: فضل صلاة الفجر، رقم الحديث ٥٤٧.

[136] ((حدثنا محمد بن طاهر بن خالد بن ابي الدميك قال حدثنا عبيدالله بن محمد ابن عائشة التيمي قال حدثنا حماد بن سلمة عن علي بن زيد عن سعيد بن المسيب عن ابي هريرة قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم يدخل اهل الجنة الجنة جردا بيضا جعادا كحلا مكحلين ابناء ثلاث وثلاثين وهم على خلق آدم صلى الله عليه وسلم ستون ذراعا في سبع اذرع))، معجم الاوسط، جزء ٥، صفحة ٣١٨، رقم الحديث ٥٤٢٢.

گەورە بن؟!!، ئەگەر ئینسان وا گەورەبێ دەبێ قەسرەكەی چەندە گـەورەبێ؟! وە دەبێ نازونیعمەتەكانی دیكەی چەندە گەورەبن؟!!.

**بەڵێ خۆشەویستەكانم، جوانی ئەو پیاوانە:** كـە هەمیـشە گـەنجن، هەمیشە لە تەمەنی سی و سێ ساڵی دان و هـەرگیز پـیر نـابن!، پێغەمبـەر فەرمووی (لا تُطفِيءُ شَبابُهُ): گەنجایەتییان هەرگیز ناڕوات!، بەڵێ ئافرەتـانیش هەمیشە كچن، چەندە ئەو پیاوە لەگەڵ ئەو ئافرەتـەی كـۆ ببێتـەوە هەمیـشە كچە!، وەكو خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَاء﴾ **٣٥- الواقعة،** واتە: ئێمە ئەوانەمان دروستكردووە بە دروستكردن، ﴿فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَارًا﴾ **٣٦- الواقعة،** واتە: ئەوانەمان كردووە بـە كـچ!، چـەندە ئـەو ئافرەتـە و ئـەو پیـاوە رائەبوێرن ئەو ئافرەتە هەر كچە!.

بـەڵێ خۆشەویـستەكانم، پێغەمبـەر (علیـه الـصلاة والـسلام) لـە وەسـفی پیـاوانی بەهەشتدا ئەفەرموێ: (لَو أَنَّ رجـلا مـن أهـلِ الجَنَّـة يتحقّـق فَبَـدا سـوارُهُ لَطَمَـس ضَوءهُ ضَوْءَ الشَّمسِ كَما تَطمُس الشَّمس ضَوءَ النُّجـومِ)[١٣٧] ئەو حەدیسە ئیمامی تەبەرانی ریوایەتی كردووە، ئەفەرموێ: ئەگەر یەك پیـاوی بەهەشـت بێـت خـۆی پێشانی دونیای بدات و یەك بازنەی -كە دیارە پیاوانیش لە بەهەشـتدا بازنـەیان هەیە-، ئەو بازنەی كە لـە دەسـتی دایـە پێـشانی دونیـا بـدات ئـەوا روونـاكی تیشكی خـۆر دەكوژێنێتـەوە هـەروەكو چـۆن خـۆر روونـاكی ئەسـتێرەكانی تـر دەكوژێنێتەوە!!، ئەوە فەرموودەی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام)!!.

[١٣٧] ((حدثنا عبد الله حدثني أبي ثنا حسن ثنا بن لهيعة ثنا يزيد بن أبي حبيب عن داود بن عامر بن سعد بن أبي وقاص عن أبيه عن جده عن النبـي صلى الله عليه وسلم قال لو أن ما يقل ظفر ما في الجنة بدا لتزخرفت له ما بين خوافق السماوات والارض ولو أن رجلا من أهل الجنة يتحقق فبدا سواره لطمس ضوءه ضوء الشمس كما تطمس الشمس ضوء النجوم))، مسند إمام أحمد، جزء ١، صفحة ١٦٩، رقم الحديث ١٤٤٩

**ئافرەتەكانی چۆنن؟**: دوایی پێغەمبەر دەفەرموێ: (لَوأنَّ إمـرَأةً مِـن أهـلِ الجَنَّةِ اطَّلَعَت الى أهلِ الارضِ لاضاءَت ما بَينَهمـا) واتە: ئەگـەر ئافرەتێـك لـە ئەهلی بەهەشت بێت خۆی پێشانی دونیـا بـدات ئـەوا هـەموو دونیـا روونـاك دەكاتەوە لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا!!، (وَلَنَصيفُها عَلى رَأسِها خَيرٌ مِـنَ الـدُّنيا وَما فِيها) واتە: ئەو چارۆك (سەرپۆش)ەی كـە بەسـەرییەتی لـە بەهەشـتدا لـە دونیا و هەرچی تێدایە باشترە!!، جا بـە خوشـكانی بـەرێزم دەڵـێم: موژدەتـان لێبێت ئەی خوشكانی بەرێز كەوا ئێـوە لەبـەر خـاتری خـوا، وە پاشـان لەبـەر خاتری بەهەشت، لەبـەر خـاتری گەیـشتن بـەو نیعمەتـە گەورانـە سەرپۆشـتان پۆشیوە، حەیا و حیـشمەتی خۆتـان پاراسـتووە، تـەقواتان پەیـداكردووە و بـە مسوڵمانی ژیاون و بە مسوڵمانی مردوون.

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەوانە بە ئەبەدی بـەو شـێوەیە لـە بەهەشـتدا دەمێننەوە، ﴿خَالدينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ ٦٥- الاحزاب، ئەو ئینـسانە لـە بەهەشـتدا ئەگەر پیاو بێ یان ژن قەت پیر نابێ!، هەمیـشە جوانـە رووخۆشـە، هەمیـشە ئەوانە لە خۆڕازاندنەوە دان، موویان لێنایە، نینۆكیـان نایـە، هـەرگیز میـز و پیسایی ناكەن، هـەرگیز تـف ناكەنـە سـەر زەوی و بەڵغـەمیان نییـە، ئەوانـە هەرگیز نەخۆش نابن، ماندو نابن، هەرگیز توشی سەرئێشە و سك ئێشە نـابن، گوێچكە و چاویان زەعیف نابێ، دەسـتیان نالـەرزێ، ناشـیرین نـابن، هـەرگیز پێویستییان بە دكتۆر و دەرمان نییە، وە هەرگیز زەعیف نابن، برسی و تینـوو نابن، غەمبار نابن، تێر نابن لە بەهەشتدا، وە رۆژ بە رۆژ جوانتر دەبن!!.

**پێغەمبەر** (علیـه الـصلاة والـسلام) **ئەفـەرموێ: بەهەشـتییەكان دێـن یـەكتری دەبینن**، بازاڕێك هەیە لە بەهەشتدا كە بەهەشتییەكان هەموو رۆژانی جومعە، واتە رۆژێك لە رۆژەكانی بەهەشتدا، دێن لە بازاڕی بەهەشتدا یەكتری دەبینن و

چاك و چۆنی دەکەن، باوك كوڕ دەبینێ و كوڕ باوك دەبیبنێ، ئەحواڵی یەکتری دەپرسن، نازونیعمەتی یەکتری بۆ یەکتر باس دەکەن، بەڵێ خۆشەویستەکانم بەهەمان شێوە ئافرەتانیش دێن لەگەڵ ئافرەتانی تر تێکەڵاو دەبن، دوایی کە دەگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆیان پیاوەکان تەماشا ئەکەن ژنەکانیان هەر جوان بوون!، ژنەکان تەماشا ئەکەن پیاوەکانیان زیاتر جوان بوون کە گەڕانەوە لە بازاڕەکەدا، جا بەردەوام رۆژ بەڕۆژ ئەوانە جوانتر دەبن، وە هەرگیز دڵیان لە یەکتری نائێشێ چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَانًا﴾ ٤٧ – الحجر، هەموو حیقد و بوغز و حەسەدمان لە دڵدا دەرهێناون، إخوانًا: ئەوانە وەکو برا دەژین.

ئا لەوێ لەو نازونیعمەتانە بە خۆشی و بە ئەبەدی تێیدا بەختەوەر دەبن، لەوکاتەدا کە هەموویان لە بەهەشتدا رائەبوێرن هی وا هەیە بیردەکاتەوە و دەڵێ: ئای ئەمن برادەرێکم هەبوو لە دونیادا لە خەراپە دەگەڕا بزانم حاڵ و وەزعی چۆنە، خوای پەروەردگار لەبەرئەوەی کە وەعدی داوە هەرچی بتانەوێ لە بەهەشتدا بۆتانی دەکەین، ئەو ئینسانە داوا دەکات و دەڵێ: خوایە گیان رێگام بدە با برادەرەکەی خۆم ببینم لە جەهەننەم بزانم وەزعی چۆنە؟، ئایا لە کوێی جەهەننەمە؟، خوای پەروەردگار پیشانی ئەدات، ﴿فَاطَّلَعَ فَرَآهُ فِي سَوَاءِ الْجَحِيمِ﴾ ٥٥– الصافات، یەکسەر جەهەننەمی پێشان ئەدات، تەماشا ئەکات برادەرەکەی وا لە ناوەڕاستی جەهەننەمدایە!، کە تەماشای دەکات ئەو کەسەی کە لە جەهەننەمە هاواری بۆ دەکات و دەڵێ: ﴿وَنَادَى أَصْحَابُ النَّارِ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ أَنْ أَفِيضُوا عَلَيْنَا مِنَ الْمَاءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ﴾ ٥٠– الاعراف، واتە: دەڵێن ئەی بەهەشتییەکان توخوا لەو ئاوەی لەلاتانە هەندێکمان بۆ بنێرن، لەو رزقەی کە لەلاتانە هەندێکمان بۆ بنێرن، هاوکاریمان بکەن..، ئەوانیش وەڵامیان ئەوەیە دەڵێن: ﴿قَالُوا إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى الْكَافِرِينَ﴾: دەڵێن خوای

گەورە ئەوانەی حەرام كردووە لەسەر كافرەكان، ئەوە ئێوە نەتاندەزانی؟، نەتاندەزانی ئێمە دێینە ئەو نازونیعمەتە؟، خوای پەروەردگار ئەو نیعمەتەمان پێ دەبەخشێ؟، خوای گەورە ئەو نازونیعمەتەی بە ئێمە بەخشی وەعدی خۆی راست بوو لەگەڵ ئێمە، ئایا خوای گەورە ئەو وەعدەی بە ئێوەی دابوو راستی كرد لەگەڵتان؟، یەكێكیش لە جەهەننەمییەكان راست دەبێتەوە و دەڵێ: بەڵێ، ئەوەی كە خوا وەعدی بە ئێمەدا بوو لە جەهەننەم هاتە دی!، ئا لەوێ لەعنەت لە زاڵمەكان دەكەن.

**بەڵێ خۆشەویستەكانم، ئا ئەو بەهەشتە بۆ كێیە؟، ﴿نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الارْضِ وَلا فَسَادًا﴾ ٨٣- القصص**، دەفەرموێ: ئەو بەهەشتە دەیدەینە كەسانێك كە لە زەویدا (خۆ بەزلزان نین: تَكَبُّر)یان نەبووە، خۆیان بە زل نەزانیوە، لە بەرامبەر خوا (تَكَبُّر)یان لێنەداوە، لە بەرامبەر دین، لە بەرامبەر مسوڵمانان، وە خۆیان بە رێبوار و موسافیر هاتۆتە بەرچاو، وَلا فَسَادًا: وە فەسادیان بڵاونەكردۆتەوە، دەستیان پیس نەبووە، چاو و دەم و لاقیان پیس نەبووە، هەوا و ئارەزوویان لە دڵدا پیس نەبووە، ئەهلی فەساد نەبوون و ئەهلی صەلاح بوون، بەڵێ بەهەشت بۆ ئەوانەیە **﴿وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ ٨٣- القصص**، سەرەنجام و عاقیبەتی چاك بۆ لە خوا ترسانە، **﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ﴾ ٣٥- الرعد**، ئەو بەهەشتە وەعد دراوە بە كێ؟، وُعِدَ الْمُتَّقُونَ: بە لە خواترسان و پارێزكاران.

جا لە خوای پەروەردگار دەپاڕێینەوە بە حورمەتی مانگی رەمەزانی پیرۆز، دەڵێین یارەببی خودایە ئەو بەهەشتەمان بە نسیب بكەی، یارەببی خوایە خۆمان و ماڵ و منداڵمان بەو بەهەشتە شاد بكەی، خۆمان و دایك و باوكمان بەو بەهەشتە شاد بكەی، خۆمان و دەرودراوسێمان بەو بەهەشتە شاد بكەی، خۆمان و هەموو هاوەڵ و برادەرەكانمان بەو بەهەشتە شاد بكەی، خوایە خۆمان

و هەموو مسوڵمانانی دونیا بەو بەهەشتە شاد بکەی، یاڕەببی خوایە لە حەوزی کەوسەر ئاومان بدەیتێ، یاڕەببی خوایە بەدەستی پێغەمبەر ﷺ ئاومان بدەیتێ، خوایە لەگەڵ پێغەمبەر موحەممەد ﷺ حەشرمان بکەی، خوایە لەگەڵ پێغەمبەراندا کۆمان بکەیەوە، یاڕەببی خوایە داوای فیردەوست لێ دەکەین یا رب العالمین، یاڕەببی خوایە هەروەکو چۆن پێغەمبەر ﷺ فەرمووی[١٣٨]: ئەگەر داوای بەهەشتتان کرد داوای فیردەوس بکەن!، یاڕەببی خوایە بۆ حورمەتی ناوە پیرۆزەکانی خۆت لێت دەپاڕێینەوە لەو رۆژە پیرۆزەدا و دەڵێین: یاڕەببی خوایە بەهەشتی فیردەوسمان بەنسیب بکەی، یاڕەببی خوایە فیردەوسمان بە نسیب بکەی، یاڕەببی خوایە (فِردَوس الاعلی)مان بە نسیب بکەی، یاڕەببی خوایە لە خۆمان و لە هەموو مسوڵمانان خۆشبیت، یاڕەببی خوایە شیفای نەخۆشییەکانمان بهێنی، خوایە لە مردووەکانمان خۆشبیت، یاڕەببی خوایە حاڵی ئێمە و هەموو مسوڵمانانی دونیا چارەسەر بکەی، یاڕەببی خوایە میللەتە مسوڵمانەکەمان لە دەرد و بەلا و ناڕەحەتیی بپارێزی، یاڕەببی خوایە لە فیتنە و ئاشووبی زەمانە بمانپارێزی، یاڕەببی خوایە ئێمەی مسوڵمان و هەموو مسوڵمانانی دونیا لەو کەسانە حیساب بکەی کە لە رۆژی قیامەتدا و لە بەهەشتی بەریندا مەلائیکەتەکان پێیان دەڵێن: ﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الأيَّامِ الْخَالِيَةِ﴾ ٢٤- الحاقة: بخۆن و بخۆنەوە نۆشی گیانتان بێ، ئەو

[١٣٨] ((حدثنا إبراهيم بن المنذر حدثني محمد بن فليح قال حدثني أبي حدثني هلال عن عطاء بن يسار عن أبي هريرة عن النبي صلى الله عليه وسلم قال ثم من آمن بالله ورسوله وأقام الصلاة وصام رمضان كان حقا على الله أن يدخله الجنة هاجر في سبيل الله أو جلس في أرضه التي ولد فيها قالوا يا رسول الله أفلا ننبىء الناس بذلك قال إن في الجنة مائة درجة أعدها الله للمجاهدين في سبيله كل درجتين ما بينهما كما بين السماء والارض فإذا سألتم الله فسلوه الفردوس فإنه أوسط الجنة وأعلى الجنة وفوقه عرش الرحمن ومنه تفجر أنهار الجنة))، صحيح البخاري، كتاب الجهاد والسير، باب: درجات المجاهدين في سبيل الله، رقم الحديث ٢٦٣٧.

پاداشته بەهۆی ماندووبونەکەتانه له دونیا، یـارەببی خوایـه لـەو کەسـانەمان حیساب بکەی کە ئەوەیان پێ دەگوترێ، یارەببی خوایه عـاقیبـەتی عـومرمـان خێر بکەی، به مسوڵمانی بمانژیێنی و بـه مـسوڵمانی بمـانمرێنی، بـه خەراپـەی خۆمان نەکەی، خوایه بەڕەحمی خۆت لەگەڵمان بکەی.

ئامین

أقولُ قَولِي هَذا وَأستَغفِرُاللهَ لِي وَ لَكُم وَلِسائِرِالمُسلِمِينَ فَاستَغفِروهُ إنَّهُ كانَ غَفَّاراً، أعُوذُ بِااللهِ منَ الشَّيطانِ الرَّجيم

(رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)

آمين

# دۆزەخ و ناخۆشییەکانی

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ الْعَذَابَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ ٥٦- النساء

# بسم الله الرحمن الرحيم

إنَ الحَمدَ لِلـهِ نَحمـدُهُ ونَـستَعينه وَنَـستَغفِره، ونعـوذ بِـاللهِ مـن شُـرورِ أنفُـسَنا وَسَيئات اَعمَالِنا، من يَهدِه اللهُ فَلا مـضِل لَـه، وَمـن يُـضلِل فَـلا هـادِي لَـهُ..، وَنَشهَدُ أن لا الهَ الا اللهُ وحدَهُ لاشَريكَ لَهُ، وَنشهَدُ اَن سيدَنا وَنَبينَا مُحمَداً عَبـدُه ورسولهُ.. هَذا الرَسولُ الذِي بَلَغَ الرِّسَالةَ وَأدَى الامانَةَ وَنَصحَ الامَةَ وَكَشَفَ الغُمَّـة وجَاهَدَ فِي اللهِ حَقَ جِهَادِهِ وَتَرَكَنا عَلى البَيضاء، لَيلُها كَنَهارِهـا، لايَزيـغ عَنهـا الا هَالِك، صلى اللهُ عَلَيهِ وَعلى آله وَأصحابِه، صـلاةً وسـلاماً الى يـومِ الـدِّين، اَمَا بعدُ يا عبادَ اللهِ أُوصِيكُم وَنَفسِي أولاً بِتَقـوَى اللهِ وَطاعَتـه، ولُـزومِ أوامـرِهِ وَكَثرَةِ مخافتـه، فَـأنَّ التَّقْـوى شـعارُ المُـؤمنينَ، وَدِثـارُ المُـتَّقين، و وَصِـيةُ الله فـيَّ وَفيكُم وَفِي النَّاسِ أجمعين. أعوذُبِالله منَ الشَيطانِ الرَجِيم: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُـوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إلا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾ ١٠٢- آل عمران.

مـسوڵمانانی بەڕێز و خۆشەویست، ئەی شـوێنکەوتوانی موحەممـەدی پێـشەوا ﷺ، لە وتارێکی رابردوودا وەعدی ئەوەمان بـە جەنابتانـدا کـە لـە وتـارێکی داهاتوودا باسی ژیانی دۆزەخ بکەین، هەندێك لە دیمەنەکانی بـەرزەخ و هـاتنی قیامەتمان پێشتر باسکرد بوو...، باسکردنی دۆزەخ مابوو بۆ ئێوەی بـەڕێز کـە ئەمڕۆ لە خزمـەت بەڕێزتانـدا دەچـینە خزمـەتی قورئـانی پـیرۆز بـۆ بینـینی هەندێك مەشهەد لە مەشاهیدی ژیانی دۆزەخییـەکان و حـاڵ و حیـسابی ئـەو کەسانەی کە لە رۆژی قیامەت بڕیاری دۆزەخیـان بـۆ دەردەکرێـت، بـۆ ئـەوەی بزانین ئەو دۆزەخ (جهنم)ەی کە خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ ئـەو کەسـانەی

سەرپێچی دەکەن لە دونیا چۆنە و چ سزایەکی ئامادە کردووە، وە بۆ ئەوەی بزانین حاڵی ئەو دۆزەخییانەی کە لە رۆژی قیامەت دوای ئەوەی کە بڕیاریان بۆ ئەدرێت کە بچن بۆ دۆزەخ چۆنە و هاوار هاواریان بۆ مەلائیکەتەکان و دەرگاوانەکانی دۆزەخ چۆنەو چ دەکەن؟!.

خۆشەویستەکانم، بۆیە پێویستە ئێمە دۆزەخ بهێنینە بەرچاوی خۆمان چونکە هەر کەسێك لەو ژیانەی دونیادا بەپێی فەرموودە پیرۆزەکانی (ربُ العالمین) و فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ هەڵسوکەوت نەنوێنێ، وە پەیڕەوی لە فەرموودەکانی خوا و پێغەمبەر نەکات، دیارە شوێنی ئەو دۆزەخەیە کە لە قورئانی پیرۆزدا بە تەئکید وەعدەی بە گوناهباران و کافرەکان و مونافیقەکان و زاڵمەکان دراوە...!، پێویستە ئێمە ئەو دۆزەخە بهێنینە بەرچاوی خۆمان بۆ ئەوەی هەر لە دونیادا خۆمانی لێ بپارێزین، نەوەکو خوا نەخواستە لە رۆژی قیامەت بەر ئەو حیساب و قائیمە و لیستە بکەوین کە خوای پەروەردگار بەهۆی مەلائیکەتەکانەوە کۆمەڵ کۆمەڵ بەرێیان دەکەن بەرەو دۆزەخ!، خوا بمانپارێزێ لەو رۆژەدا، وە خەجاڵەت نەبین لە مەیدانی مەحشەر، وە بەرێ نەکرێین بۆ دۆزەخ، خوای گەورە لەو تاقمەمان حیساب بکات کە بەرێدەکرێن بۆ بەهەشتی بەرین، وە خوای گەورە بمانپارێزێ لەو تاقمانەی کە بەرێدەکرێن بۆ دۆزەخ.

خۆشەویستەکانم، هەر لەوکاتەوە کە لە مەیدانی مەحشەر خەڵکێك بۆ بەهەشت بەرێ دەکرێ خەڵکێکیش بۆ دۆزەخ بەرێدەکرێ، ئەوەی کە بۆ بەهەشت بەرێدەکرێ مەلائیکەتەکان پێشوازییان لێ دەکەن هەروەکو لە خوتبەیەکی رابردوودا باسمان کرد، بەهەمان شێوە ئەوانەی کە کیتابەکەیان و شەهادەکەیان بە دەستەچەپەوە یان لە پشتەوە وەردەگرنەوە، ئەوانە تاقم تاقم،

کۆمەڵ کۆمەڵ بەرەو دۆزەخ بەڕێدەکرێن، وە مەلائیکەتەکان و دەرگاوانەکانی دۆزەخ پێشوازییان لێ دەکەن بەڵام چ پێشوازییەك!!، گوێبگرن لە فەرموودەی خوا (جل جلاله) لە کۆتایی سورەتی (الزُمر) دەفەرموێ: ﴿وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاء يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا بَلَى وَلَكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ * قِيلَ ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ﴾ ٧١، ٧٢- الزمر، بەڵێ لەو ڕۆژەدا دوای ئەوەی شەهادەکە وەردەگرنەوە، کافرەکان کۆمەڵ کۆمەڵ بەرەو دۆزەخ بەڕێدەکرێن!، خوا (جل جلاله) ئەفەرموێ (وسِيقَ الَّذِينَ كَفَروا): ئەوانەی کە بێبڕوان بەڕێدەکرێن و دەبردرێن (إِلَى جَهَنَّمَ زمراً): بە کۆمەڵ دەبردرێن بۆ دۆزەخ، هەر بەلای چەپەوە، ئەوانەی کە کافر بوون بە خوا، ئەوانەی کە شوێنکەوتەی دینی خوا نەبوون لە دونیا، ئەوانەی کە دینی خوایان بە ڕاست نەزانیوە، ئەوانەی کە ناحەزایەتی دینی خوایان کردووە، ئەوانەی کە دینی خوایان پاشگوێ خستووە... ئەوانە بەڕێدەکرێن بۆ دۆزەخ!، (حَتَّى إِذَا جَاؤوهَا): هەتا کە دەگەنە بەر دەرگای دۆزەخ (فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا): ڕاستەوخۆ و کتوپڕ دەرگاکانی دۆزەخ دەکرێنەوە!، کە دەرگای دۆزەخیان لێ دەکرێتەوە زۆر سەرسام و ناڕەحەت دەبن، قورئانخوێنە بەڕێزەکان: ئەگەر سەرنجتاندابێ لە قورئانێدا پێش ئەو ئایەتە باسی ئەو کەسانە دەکات کە بەرەو بەهەشت بەڕێدەکرێن!، کە خوا ئەفەرموێ: ﴿وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا﴾ ٧٣- الزمر، واتە: ئەوانەی بەهەشتین پۆل پۆل بەرەو بەهەشتێ بەڕێدەکرێن، هەتا کە دەگەنە لای دەرگاکانی بەهەشت دەرگایان لێکراوەتەوە، بەڵام لە بارەی ئەوانەی دۆزەخ دەفەرموێ: کە دەگەنە لای دەرگای دۆزەخێ یەکسەر دەرگاکانیان لێ دەکرێتەوە!، جیاوازییەکە لێرەدا (واو)ێکە، لە بارەی

بەهەشتییەکان دەفەرموێ: (وَفُتِحَتْ أَبوابُهَـا) لە بارەی دۆزەخییـان دەفـەرموێ: (فُتِحَتْ أَبوابُهَـا) بەبێ واو!، مانای ئەوەیە ئەوانەی کە دەچن بۆ بەهەشـت هـەر لە دوورەوە دەرگایان بۆ کراوەتەوە (وَفُتِحَتْ) یانی کراوەتـەوە لـە پێـشتر، هـەر لەوکاتەی کە بەرەو بەهەشت بەرێدەکرێن دەرگاکانیان لێ کراوەتەوە و هـەر لـە دوورەوە بەهەشت دەبینن بۆ ئەوەی لە دوورەوە خۆشـحاڵ بـن، بـەڵام ئەوانـەی دۆزەخ نـازانن کـە بەسـەر شـتێکی زۆر زۆر ترسـناکدا دەکـەون، تـا دەگەنـە بەردەرگای دۆزەخ راستەوخۆ دەرگای دۆزەخیان لێ دەکرێتەوە بۆ ئەوەی ترسیان زۆربێ!، بۆ ئەوەی راستەوخۆ بەسەر ترسێکدا بکەون لەوێش ئازار و ئەشـکەنجە ببینن هەر لەوکاتەوە کە شەهادەکەیان پێ دراوە ئازار و ئەشکەنجەیان دەستپێ دەکات هەتا دەگەنە ناو دۆزەخ!!.

بەڵێ خۆشەویستەکانم، (حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا فُتِحَتْ أَبوَابُهَا) ناشفەرموێ: (فُتِحَـتْ بابُها)، بەڵکو دەفەرموێ (أَبوَابُهَا)، (أبواب): جەمعی (بـاب)ە، یانی دەرگاکـانی دۆزەخ دەکرێنەوە، خوای گەورە لە قورئان دەفەرموێ: ﴿لَها سـَبْعَةُ أَبـوَابٍ لِّكُـلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ﴾ ٤٤- الحجر، واتە: بۆ دۆزەخ حەوت دەرگا هەیـە، وە هـەر دەرگایـەك لـەو دەرگایانـەی دۆزەخ کۆمـەڵێکی تایبـەت تێیـدا دەچـنە ژوورەوە!، (مُنـافقین) لەو دەرگایە دەچنە ژوورەوە، کافرەکان لەو دەرگایە دەچنە ژوورەوە، ئەوانەی ریابازن لەو دەرگایە دەچنە ژوورەوە، ئەوانەی کـە خۆبـەزلزان (مُتَكَبِّر)ن لەو دەرگایە دەچنە ژوورەوە، ئەوانـەی کـە سـتەمکار (ظـالِم)ن لـەو دەرگایەی دەچنە ژوورەوە، ئەوانەی حەرامخۆر و ریباخۆر و مـاڵی یـەتیم خـۆرن لەو دەرگایە دەچنە ژوورەوە... هتد، ئا لەوکاتەدا کـە دەگەنـە دەرگـای دۆزەخ دەرگەوانـەکان پێـشوازییان لـێ دەکـەن بـەڵام چ پێـشوازییەك!!، کۆمـەڵێك مەلائیکەت راوەستاون، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿عَلَيْهَـا تِـسْعَةَ عَـشَرَ﴾ ٣٠- المـدثر، واتـە: نـۆزدە مەلائیکـەت بەسـەر دۆزەخـەوە ڕاوەسـتاون، بـەڵام چ

مەلائیکەتێك؟!!!، ﴿غِلاظٌ شِدَادٌ﴾ ٦- التحريم، واتە: زۆر بەهێز و توند!!، ئەو مەلائیکەتانە راوەستاون کە خوای پەروەردگار پێیان دەفەرموێ (زبانیة)، ئەوانەی کە خەڵکی لێدەخورن و پاڵدەدەن بۆ دۆزەخ، وە ئەوانەش کە بۆ دۆزەخێ بەرێ دەکرێن وەکو ماڵاتێ وەپێش خۆ دەخرێن و بەرێ دەکرێن!، بەڵام ئەوانەی بەهەشتێ وەکو وەفدا، ئەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَنِ وَفْدًا﴾ ٨٥- مريم، ئەوانەی کە ئەهلی بەهەشتن وەکو وەفد دەچنە خزمەتی خوا، (إِلَى الرَّحْمَنِ وَفْدًا) وەفد جلوبەرگی پاکی لەبەردایە کە دەچێتە لای کۆمەڵێك پیاو یان سەرۆك (رئيس)ێك چۆن بە ئیحتیرامەوە پێشوازی لێدەکرێ و ئەو وەفدە خۆی بۆنخۆش دەکات کە بەرێکوپێکی بەرێگادا دەروات ئەوانیش پێشوازی لێدەکەن، ئاوا ئەو وەفدەی کە دەروات بۆ بەهەشت پێشوازی لێدەکرێ!، (الْمُتَّقِينَ: پارێزکاران) دەچن بۆ لای پەروەردگاری خۆیان بە وەفد، وەکو وەفد رێزیان لێدەگیرێ (إِلَى الرَّحْمَنِ وَفْدًا)، بەڵام ﴿وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَى جَهَنَّمَ وِرْدًا﴾ ٨٦- مريم: ئەوانەی کە دۆزەخین واتە کافر و موجریم بوون و لە دونیادا تاوانیان کردووە بەهۆی مەلائیکەتەکانەوە لێ دەخوڕدرێن، وە پێشخۆ دەدرێن، پاڵیان پێوەدەنێن بە تینوێتی و برسێتی، بە ناخۆشحاڵیی و ئێشوئازارەوە لێ دەخوڕدرێن بەرەو دۆزەخ، کە دەگەنە دەرگای دۆزەخ مەلائیکەتەکان پێیاندەڵێن: ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا بَلَى وَلَكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ ٧١- الزمر، ئایا پێغەمبەرانتان بۆ نەهاتن لە خۆتان لە دونیا؟، کە ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێندنەوە، دینی خواتان پێ نەگەیشت و بۆتان روون نەکرایەوە؟، پێغەمبەرانتان بۆ نەهاتن ئایاتی خواتان بۆ بخوێننەوە؟، لە دینی خوا حاڵییتان بکەن، لەم رۆژە ترسناکەش بتانترسێنن، بۆیان روون نەکردنەوە؟، ئەوانیش دەڵێن ﴿قَالُوا بَلَى﴾: بەڵێ.. مامۆستا و پێغەمبەرمان بۆمان هاتن و دینی خوامان بۆ روونکرایەوە، بەڵام بڕیاری خوا لەسەر ئەو

كەسانەی كە كافرن هاتەجیٚ كە خوا لە دونیا وەعدی بە كافرەكان دابوو، وەعدی بە دوژمنانی دینی خوٚی دابوو كە دەبیٚ ئێوە سزاتان دوٚزەخ بێت، ئەوە سزاكەیە و ئێستا هاتەدی!!!.

خوای گەورە لە ئایەتێكی تر لە سورەتی (المُلك) دەفەرمویٚ: ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ﴾ ٨- الملك، دەرگەوانەكان پێیان دەڵێن ئایا ترسێنەرتان بوٚ نەهات لە دونیا تا بتانترسێنیٚ لەم روٚژە؟، ﴿قَالُوا بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلا فِي ضَلالٍ كَبِيرٍ﴾ ٩- الملك، واتە: گوتیان بەڵیٚ ترسێنەرمان بوٚ هات بەڵام گوتمان ئێوە راست ناكەن، خوا ئەوەی نەناردووە كە ئێوە دەیلێن!، ئەوەی ئێوە دەیلێن دینێك نییە كە خوا دەیەویٚ، ئێوە لە زوبانی خوٚتان هەڵتانبەستووە، ئاوا وەڵامی پێغەمبەرانیان -كە ماموستایانن- داوەتەوە، یاخود وەڵامی شوێنكەوتووانی پێغەمبەرانیان داوەتەوە، وەك چوٚن ئێستا خەڵكێك هەیە دەڵیٚ: كاكە ئەوەی ئێوە هێناوتانە دینێكی نوێیە!، یان برایەك.. ماموٚستایەك كە باسی ئیسلام دەكات بە سەیر و سەمەرە دێتە بەرچاوی هەندیٚ خەڵك پێیوایە كە دینێكی نوێی هێناوە چونكە حەقیقەتی دینەكە باس دەكات ئاوا لەوێش دەڵێن: ﴿فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ﴾ ٩- الملك، لەوكاتەدا لە مەیدانی مەحشەر كاتێك لەبەر دەرگای دوٚزەخ راوەستاون دەڵێن: ئێمە گوتمان ئێوە راست ناكەن ئەی پێغەمبەران و شوێنكەوتەی پێغەمبەران، ئەوەی كە ئێوە دەیلێن خوا ئەوەی نەگوتووە!، جا لەوكاتەدا پەشیمان دەبنەوە و دەڵێن: ﴿وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ ١٠- الملك، ئەگەر گوێڕایەڵییمان بكردایە لە دنیا، ئەگەر عەقڵمان هەبوایە و تێگەیشتبایین ئەوا لە برادەرانی ئەو روٚژە رەشە نەدەبوین!، ﴿فَاعْتَرَفُوا بِذَنبِهِمْ فَسُحْقًا لأَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ ١١- الملك، لەوكاتەدا ئیعتیراف بە گوناهی خوٚیان دەكەن!.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: کە دەبردرێنە دەرگای دۆزەخ ئا لەوێ تەماشا ئەکەن پردی (الصِّرَاط) دانراوە!، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: پردی (الصِّرَاط) لە نێوان ئەملا و ئەولای دۆزەخ دادەنرێ، کە لە فەرموودەیەکدا هاتووە دەفەرموێ[١٣٩]: لە شمشێر تیژترە و لە موو باریکترە بۆ ئەو کەسانەی کە تاوانبار و ستەمکار و کافر و مونافیقن!!!، خوای گەورە ئەو کەسانە رزگاردەکات لەسەر پشتی پردی (الصِّرَاط) کە مسوڵمانی راستەقینە بوون و شوێن دینەکەی خوا کەوتوون و تەنها بۆ ئەو ژیاون کە بۆیان دەبێتە پرد و مەیدانێك و بەرین دەبێ، بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: ئەو پردە رادەخرێ لەسەر دۆزەخ، وە من و ئوممەتی من یەکەم کەسانێکین کە بەوێدا دەپەڕینەوە..، وە دەبێ هەموو کەس بچێتە سوێ جەهەننەم و چاوی پێی بکەوێ و بەسەریدا بڕوات، وەك خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا﴾ ٧١- مریم، واتە: هیچ کەسێ نییە لە ئینسانەکان هەر دەبێ بچنە سوێ جەهەننەم، عبدالله ی کوڕی رەواحە ئەو کاتەی کە کرا بە قیادەی جەیش پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ناردی بۆ یەکێك لە غەزایەکان وەختێك کە وەرێ دەکەوت لەگەڵ لەشکری مسوڵمانان گریا، صەحابیەکان لێیان پرسی: ئەی عبدالله بۆ دەگری، ئەوە لە ترسانە؟، فەرمووی: وەڵاهی بۆ ئەوە نییە لە ترسی شەڕ یان مردن بێ بگریم.. بەڵکو ئەو ئایەتەم وەبیرهاتەوە کە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ

---

[١٣٩] ((... قال فينطوي عليهم ويرمي بهم في غمرات ولجهنم جسر أدق من الشعر واحد من السيف عليه كلاليب وحسك ياخذون من شاء الله والناس عليه كالطرف وكالبرق وكالريح وكأجاويد الخيل والركاب والملائكة يقولون رب سلم رب سلم فناج مسلم ومخدوش مسلم ومكور في النار على وجهه))، مسند إمام أحمد، جزء ٦، صفحة ١١٠، رقم الحديث ٢٤٨٣٧

حَتْمًا مّقْضِيًّا﴾ ٧١- مريم، هيچ كەسێك نييه له نێوه هـەر دەبـێ بەسـەر ئـەو شوێنەدا بڕوات و ببينێ، بڕيارێكی حەتمييه لەلای خوا!، جـا خـوا بمانپـارێزێ لەوكاتەدا كه بەسەر پردی (الصِّرَاط)دا تێدەپـەڕين، يـاڕەببی خوايـه ڕزگارمـان بكەی و لاقمان چاك بچەقێنی، خوايه ڕزگارمان بكەی و نەكەوينەخوار لەسـەر ئەو پردە، پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) ئەفـەرموێ: لەوكاتـەدا مەلائيكەتـەكان هەموويان ڕاوەستاون و دوعـا دەكـەن، پێغەمبـەران هـەموويان دوعـا دەكـەن دەفەرموون: (اللَّهُمَّ سَلِّم سَلِّم) خوايه سەلامەتيان بكـەی.. خوايـە سـەلامەتيان بكـەی ئـەو كەسـانەی كـه موسـڵمانن و بەسـەريدا ئەپەڕنـەوە!، وە هـەموو مەلائيكەتەكانيش دەپاڕێنەوە، ئينجا پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) ئەفـەرموێ: هەر يەكەی بەجۆرێك بەسەريدا ئەپەڕێتەوە، هی وا هەيه وەكـو بروسـك (بَـرق) بەسەريدا ئەپەڕێتەوە ئەوەندە خێرايه لەبەر ئيخلاصی بۆ خوا، لەبەر چـاكەكانی و بەندايەتييه ڕاستەقينەكەی بۆ خوا، هی وا هەيه وەكو ئەسپ سـوارێك، هـی وا هەيه وەكو بە پيادە ڕۆيشتنێكی ئازا كه بەڕێگادا دەڕوا... هتد، وردە وردە بەو شێوەيه بەسەريدا دەپەڕنەوە!.

بەڵێ خۆشەويستەكانم، دوای ئەوەی ئەو كەسـەی كـە دەكەوێتـە خـوارەوە دەكەوێتە ناو دۆزەخ ئەوانەی كه مـسوڵمانی ڕاسـتەقينەن ئـاوا ڕاسـت دەڕۆن و هەر يەكێك بەشێوە خێراييەك دەپەڕێتەوە، بەڵام ئەوانەی كه گوناهبارن جارجار شەپۆلی ئاگر دەڕوات و لێيان دەدات بەڵام دەگەڕێتەوە و شەپۆلی ئـاگر خۆيـان لێنادات، هەر بۆيه لەوێش دەترسێن و بـەملا و ئـەولا دەكـەوێت و دەكەوێتـە خوارەوە و هەڵدەستێتەوە و ئاوا بە جۆرە عەزابێك وردە وردە هەتا خوای گەورە ڕەحم بە ئەوانە دەكات كه گوناهبارن، وە ئەوانەی كه خێرەكانيـان زۆرتـرە لـە گوناهەكانيان... بەو شێوەيه دەپەڕنەوە، وە ئەوانەی كه لە خـواترس (مُتَّقِـي)ن ڕزگاريان دەبێ وە ئەوانەی كه كافر و ستەمكارن لەوێدا دەمێننەوە و دەكەونـە